زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ
ژمارە ( ١٢ )

# گەشتنامە

## گەریدە بەرنامەی نییە، هەر مل دەنێت!؟

ئەحمەد کوڕە جووتیار

٢٠١٢

## پێڕستی بەشی یەکەم

**تێبینی:**

١. گەشتێکی ناوچەی هەڵەبجەم لە گۆڤاری ژمارە ٢٨ ی سۆشیالیستدا بڵاوکردەوە، نەمویست ئەو گەشتە تێکەڵ بەم کتێبە بکەم.

٢. ئەم گەشتە لە رۆژانی پشوو و مۆڵەتەکاندا ئەنجامدراوە.

٣. ئەوانەی کە کەڵکم لێ وەرگرتون هەریەك لە بابەتەکانی گەشتەکەدا دیاری کراون.

**گەشتنامەی کوڕە جووتیار**

**ناوبراو نووسەرو شاعیرو فۆلکلۆریست، لەدایك بووی ساڵی ١٩٤٢ لە گوندی بێستان سوور، خوێندنی هەتا پەیمانگای هەرەوەزییە کشوکاڵیەکان تەواو کردووە، هەروەها پێشمەرگایەتیشی کردووە بۆتە خاوەنی ماڵ و منداڵ و لەکۆتایشدا توشیاری کۆمەڵێك نەخۆشی و نابینایی هاتووە، بەڵام ئەوە دەستی لە نوسینەکانی پێ هەڵنەگرتووە و زیاتر لەسەری بەردەوام بووە، فەرمانبەری بەڕێوەبەرایەتی کشتووکاڵ بووەو بەهۆی باری کوردایەتی یەوە وەك گواستنەوە (نقل) دوورخراوەتەوە بۆ خوارووی عیراق دوای گەڕانەوەی بە لێبوردنی گشتی هەتا سەردەمی ڕاگوێزان کە هەربەهۆی باری کوردایەتییەوە بوە بەزۆرەملێ ساڵی فەرمانبەرێتی بۆ کراوە بە (١٥) ساڵ و خانەنشینکراوە بە مووچەیەکی ئێجگار کەم، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی ژێواری کاری کشتووکاڵی و تەنانەت دوکانداریشی کردووە.**

**پێناسەی گەشت:**

**گەڕانە بەدوای ون بوویەکدا، (جوگرافیا، میژوو، کەلتور).**

## پێشەکی نووسەر

وەك دەردەکەوێت، لە پشکنین ولێکۆلینەوەکان و گەڕان بەدوای ئاسەوار و کەلەپوری باو باپیرانماندا، لە گۆڕستان وقەلاو گردو هەرشوێنێك، کە جێی گومان بێت کۆنینەیان تیایە وەك (پەیکەر - شوێنەواری دەزگاو خانوبەرەو کۆشك، پەرستگا، دراو، کارە گلکارەکان. ... هتد) کە سیمای شارستانی باپیرانمانن و ئاوێنەی ڕووی گەشی مێژوو و فەرهەنگ وکەلتوری نەتەوایەتیمانن، بێگومان ئەو کارانە کاری هەرسەدەم و قۆناغێکی مێژوویی بن،. .هونەری بن یان هەر ڕوونکردنەوەیەکی تری مێژووی، زادەی بیروهزری کۆمەڵگەی کوردەواریمانن.

کەچی سەیر لەوەدایە، هەر بە دۆزینەوەی یەکێك لەو شتانە، لەبەر ئەوەی تەنها. مۆرێك یان نیشانکردێکی سەردەمی دەوڵتێك، یان پاشایەکی لەسەر بێت، ئیتر بێ سێ و دوو دەدرێتە پاڵ ئەوان بێ ئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە کە کاری کوردەواری سەردەمی ئەو پاشاو دەوڵەتەیە و هیچیتر، چونکە ئەوان وەك داگیرکار بەزۆر دەستیان گرتووە بەسەر هەبوو و نەبوی گەلەکەماندا و هەرچی ڕەوتی شارستانی و پێشکەوتنە زەوتیان کردووە بەلای خۆیاندا و مۆرکی خۆیان خستووە تەسەر.

بەوکارە ویستویانە ڕەسەنایەتی دیرۆکی وڵات و نەتەوەکەمان بسڕنەوە و بیانشێوێنن دواتر بیکەنە موڵکی خۆیان بۆ دەوڵەمەندکردنی مێژووەکەیان.

لێرەدا و بۆ سەلماندنی دەستبەسەراگرتنەکانی ڕابردوو نموونە لەسەر ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەهێنینەوە، کە چۆن شارستانییەتمان کەوتوەتەژێر کاریگەری داگیرکاران و بە شارستانییەتی خۆیانی دادەنێن!! ئەوەتا ئێران دەڵێت کلتوری ناوچەی ڕۆژئاوای دەوڵەتی (ئێران زەمین) لە تورکیاش دەڵێن فەرهەنگی ناوچەی باشوری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی تورکیا، تەنانەت دەشڵێن فەرهەنگی (تورکە چیا نشینەکان).

لە سوریا و عیراق و ئەو شوێنانەی کە کوردیان تیایە هەمان بۆچوونیان هەیە، ڕێگەش نادەن دراوێکی خەرجی بودجەیەکی خۆمان هەبێت و (دراو) یان (سکە) ڕەواجدارەکەی ئەوانیش نەبێت، ئێمە ناژین، بەو شێوازە و دەستپێداگرتنە هەموو شت موڵك و مێژووی ئەوانە.

ئەمە ڕۆژگاری ئێستا کەواتە، ڕابردووش – سەخت و چەواشەتر بووە. نموونەیەکی تر، هەر سەردەمێك ئازادی هەبووە چ کۆن و چ ئێستا، موڵکایەتی شارستانییەتیش گەڕاوەتەوە بۆ خۆمان.

ئەوەتا لە باشوری کوردستان ئازادییەك هەیە و توانیومانە مێژوو ئیرادەی خۆمان پیادە بکەین، ئەگەرچی داگیرکاران و زۆرداران هەردەم ویستویانە لەباری بەرن. کەواتە ڕاستە بڵێین کەلتورمان لە ژێر زەبری کاریگەری دوژمناندا بووە، زادەی هزری ڕەسەنی خۆمان بووە و ئەوان مۆرکی خۆیان خستووەتەسەر بە گوێرەی بارودۆخ و قۆناغ، بۆیە لە خاکی خۆماندا هەرچیمان دیتەوە لە بیانییەوە دوورە هی هەر سەردەمێك بێت – پێناسەی کەسیی وڵات و نەتەوەکەمانە و دەبێ چاك بیناسین و لە دەستی دزێو و ئاودیوکردنیشی بپارێزین.

***

## ڕێبوار

ئەحمەد کوڕە جوتیار

ڕێبوارێکم ماندونەناس تا دوندی کـــــــێو ناوەســــــــتمەوە
ئەڕۆم هەتا پەرچەمی هەور نەئاڵێنم بە دەستمەوە ناوەستمەوە

بە شـــــەو و ڕۆژ هـــەر ملدەنێم بەســـەر گاشە و بەستەڵکدا
هەتـــــا کۆچی کـــــاروانەکان نەدۆزمەوە ناوەســـــتمەوە

ئەڕۆم هەتـــــــا تروســــــــکەی ئەستێرە کۆچەرەکـــــان
لە تـــــــاریکی شەوەزەنگدا نەکەمە وانــــــەی بەرخۆدان

ئەڕۆم هەتـــــــا چەخمــــــــاخەی تۆڵەی نوێ نەبیستم بنـرکێنێ
هەتا کەزێی شەفەق نەبینم تارمایی چیای وڵات و نەتەوەکەم داگیرسێنێ

بەبـێ وچان ئەڕۆم ئـــــەڕۆم لەگەڵ ڕەوتـــی کاروانی شەو
هەر مل ئەنێم ئـــــەڕۆم ئەڕۆم لەگەڵ بەســـتەی گۆرانی شەو

هەتـــــا پرچی گزنگی شـەو نەکەمە ســـــەر ناوەستمەوە
هەتا ســــــروودی سنگی خۆر لەبــــــەرنەکەم ناوەستمەوە

*** 

**گوندی بێستان سوور لە نێوان دیرۆك و شارستانیدا**

**سەرەتا کورتەباسێکی مێژوویی و جوگرافی ئاسەواری ئەم گوندە وەك پێشەکییەك.**

**لە رووی جوگرافییەوە**

**لە دیرۆکدا ڕوبەری ئەم گوندە لە گردی گۆمە ڕەشەوە دەستی پێکردووە، کە گردێکی ئاسەواری کۆنە کە پێدەچێت بنەماکەی لە گۆتی و لۆلۆیی یەکانەوە دەست پێبکات، لەبەری ڕۆژهەلاتی ئەم گوندەوە سەرچاوەی گۆمە ڕەش هەڵدەقولێت کە لە دواوە باس کراوە، ئەم گۆمە یەکێکە لەو ئاوانەی کە لە پێکهاتەیەکی کانزایی دەچێت چونکە ڕووەکی گوش کە ڕووەکێکە توێکڵەکەی بۆ ڕستن و چنین بەکەڵکە و دارکەکەشی دوای لێکردنەوەی توێکڵەکەی کە سپی و تەبەدۆریە لە باتی بەکارهێنانی نەوت بۆ ئاگرکردنەوە زۆر بەکەڵکە، تۆوەکەشی لەلایەك بۆ برێشکە لەباتی چەرەسات و لە لایەکیش بۆ دەرهێنانی ڕۆن زۆر بەکەڵکە، جا ئەگەر ئەم ڕووەکە بخرێتە ئاوی گۆمە ڕەشەوە بۆ ماوەیەك زیاد لە (٢٥ڕۆژ) ڕووەکەکە نە بەلَخ هەڵدەهێنێ و نە ڕەش دەبێتەوە، وە بە ئاسانی لەپاش ئەو ماوەیەی کە لە ئاوەکە دەر هێنرا بەرگەکەی لێدەبێتەوە کە بۆ ڕستن و چنین بە کەڵکە.**

**لە باکوری گردەکەشەوە گۆڕستانێکی کۆنینە بە تەنیشتی گۆڕستانە تازەکەی ئێستاوە کەناسراوە بە گۆڕستانی دارە ڕەش**

مێژووه کەی دەگەڕێتوه بۆ سەردەمی دەست پێکی بێستان سوور لە زۆر کۆندا.

ئیتر ئەگەر بەرەو ڕۆژهەڵاتی گوندی گۆمەڕەش بڕۆین بەرەو ئاوێك کە ناسراوه بە حەوزی (سەیده) لەوێشەوه بەرەو (گەرمکی قاسم) و لە دامێنی گردی سەراکۆن کە لە دواوه باسمان کردووه، لەوێشەوه بەرەو گۆمی بێستان سوور هەتا گردی کاژاو، لەگردی کاژاو بەرەو ڕۆژئاوابگەڕێینەوه تا دەگەینە ئەو شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن بەربەستی پشتی ئاوەڕۆکەی بێستان سووری گەوره کەلە بەر بەستەکەدا شوێنەواری خانووبەره دەر کەوت، لەوێشەوه هەر بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆین تا دەگەینە ئەو شوێنەی کە ناسراوه بە دۆڵەکە کە دەکەوێتە پشتی گوندی ناوبراوەوه، لەوێشەوه هەر بەرەو ڕۆژئاوا بەوشوێنەدا کە پێی دەڵێن کلکەو یاڵەکە بڕۆین تادەگەینە گردی گۆمەڕەش، ئائەم نێوانە کەوەك هێڵێك ئیشارەتمان پێی داوه و هەردوو گوندی بێستتان سووری ئێستاو گردی سەرا کۆن دەکەونە ناوی.

لەم نەخشەیەدا لەدیرۆکدا هەمووی گوندێك بووه کەبە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوه هەر قۆناغەی شارستانیەت و ناوی تایبەتی خۆی هەبووه وەك لە دواوه باسکراوه.

ئەم گوندە وەك بەدەماودەم باس دەکرێت هەتا هەنوکە نۆجار کاولکاری و ئاوەدانی بەخۆیەوه بینیوه، ئەتوانین دەست نیشانی ئەوەش بکەین کە (سەردەمی گۆتییەکان بەدەستی نارامسین، سەردەمی ئاشوریەکان، سەردەمی داگیرکاری عەرەب/ئیسلام،

سەردەمی ئەسکەندەر، سەردەمی تەیموری لەنگ، سەردەمی عوسمانیەکان، جارێك بەسووتان، دووجاریش لەسەردەمی ڕژێمی بەعسی دا بەچۆڵ کردن وکاول کردن).

بۆ هەندێك لە سەردەمەکانیش ئاسەوار دەردەکەوێت زیاتر وەك سەردەمی ئەسکەندەر کە گردێك هەیە لەم گوندەدا بەناوی گردی کچان کەسەر لەشکری ئەو هێزەی ئەسکەندەر کەئێرەی داگیر کردووە لەسەر ئەو گردە خانووی بۆ کچێکی هندی کە بە غەنیمەت هێناویەتی درووستی کردووە ئەو گردە بەو سۆرخەوە ناونراوە گردی کچان، کچەکە شەو لەناوێك دووپشك پێوەیداوەو مردووە و پیاوەکەشی لە داخاندا خۆی کشتووە، کە گۆڕستانێکی کۆنینە بە تەنیشت گۆڕستانە تازەکەوە هەبوو کە بە گۆڕستانی بەرامبەرەکە ناسراوە ئاسەواری گۆڕی ئەو دوانە کە بەدەماودەم دەگێڕنەوە پێوەی دیارە، کێلەکانی لەبالأی پیاوێك بەرزترە کە بە کێلەقوچەکان دەناسرا.

هەرچەندە وەك سەرچاوەیەکی ڕوون شتێکمان لەبەردەستدا نیە بۆ مێژووی ئەم گوندە، بەلأم ئاسەوارەکان و کەرەسەی سەرجەم ئاسەوارەکان وەك خشت و شتی تر هەموویان کۆنی ئەم گوندە دەگێڕنەوە ...

ئەم گوندە لە سەردەمی نوێدا دووجار بووەتە مەڵبەندی هەلأیسانی بزوتنەوەیەکی کوردایەتی، یەکەمیان لە سەردەمی شیخی نەمردا لەدیوەخانی (فەقێ علی) ڕیشسپی ئاوایدا بیرۆکەی بزوتنەوەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانی خواروو بەسەر کردایەتی مەلیك مەحمود، هەموو سەرۆك عەشیرەت و ڕیشسپی

یەکانی دەورو بەر لەوێ کۆبونەتەوە و ڕاوێژی بزوتنەوەکە کراوە، کە لەدواوەش کەمێك باسمان لێوەکردووە.

دووهەمیشیان سەرەتای هەڵایسانی شۆڕشی ئەیلول هەموو ریشسپی و سەرۆك عەشیرەتەکانی دەوروبەر لەگەڵ حاجی ابراهیمی چەرمەگادا لەماڵی عومەری فەقێ علی لەم گوندەدا بیرۆکەی بزرتنەوەکە ڕاوێژی لێوەکرا ...

بە پێویستمانزانی باسی ئەوە بکەین کە توویەکی کۆنەساڵ زۆر زۆر گەورە کەلەدواوە باسمان لێوەکردووە لەگەڵ تووەکەی بەردەم ماڵی عومەری فەقێ عەلی، تووە گەورەکە ناسراوە بە بەتووی مزگەوتەکە. ئەم تووە زەبەلاحە بەشی هەرەخوارووی بەردار بوو، سەرجەم بەشەکانی تری زربوون بۆیە لە دووبەینی دەستپێکی پەلەگەورەکانەوە بەشوێنێکی شێوە دۆڵی قەدی دارەکەوە دۆشاوێك دەهاتە خوارەوە و ڕێچکەی دەبەست، بۆئەم مەبەستە جارێك لە کاروانچیەکی هەورامیم پرسی کەناوی لالۆ حەمە کەریم بوو، هۆی پەیدا بوونی ئەم دۆشاوە لەم دارەدا چی یە و بۆچی باشە ؟ لەوەڵامدا ووتی: ئەوە هۆکاری بەهێزی دارەکەو بژوێنی شوێنی دارەکەیەو دارەکەیش زرە لەجێی ئەوەی بەر بگرێ دەیکاتە دۆشاو، ئەو دۆشاوە ئەگەر چاك بکرێت بۆ خۆشکردنی هیزە و ئەو شتانە بۆ دان ئێشەش بە کەڵکە.

گۆڕستانی کۆنینەی بەرامبەرەکە و گۆڕستانی کۆنینەی تەنیشتی (ڕۆژهەڵاتی دارەڕەش) و گۆڕستان و مەزاری باشوری دارەڕەش و ڕۆژئاوای گردی گۆمەڕەش و گۆڕستانی کۆنینەی

بەرامبەر ئاشی خەرگە ڕەش و گۆڕستانی کۆنینەی گۆڕی گەوری و کێلە سپی باشوری ڕۆژهەڵاتی گوندی بێستان سوور و گۆڕستانی کۆنینەی تاڵە عارەبان گۆڕستانی کۆنینەی دارەکە لەسەر جادەی گشتی کیلۆ مەترونیوی باکوری بێستان سوور لەپردی چەناخچیان دوو کیلۆ مەتری ڕۆژهەڵاتی بێستان سوور گۆڕستانی هەرە کۆنینەی یاسین تەپە، ئەمانە هەموو بەڵگەی هەموو قۆناغەکانی مێژوون لە گۆتی یە کانەوە بگرە تا ئەسکەندەرو عەرەب و دواتر بۆ کۆنی قۆناغەکانی ئەم گوندە، واتە گوندی بێستان سوور، هەڵبەت لەڕووی ئاسەوارەکانیشەوە لەدواوە باسمان کردووە، هەرچی لەڕووی ئاین و ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی ئەم گوندە لە ئاستی زانست دا لە دواوە باسمان کردووە وەك مزگەوت و مەلا و حوجرە وتەفسیر و دراسات، ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە حەزرەتی مەولانا خالید کەخۆی شارەزووری بووە و سەروبەندی لەگەڵ مزگەوت و دراساتی ئەم گوندەدا هەبووە چونکە خۆی لە هۆزی عێل بەگی جاف بووە و لەگەڵ ڕیش سپی گوندەکەدا (حاجی ئەمین) تێکەڵاوی زۆریان هەبووە، حەزرەتی (نالی) یش (خدری شارەزووری) کەلە عێلْ بەگی جاف بووە خزمایەتی نزیکی لەگەڵ ڕیش سپی ناوبراوی ئەم گوندەدا هەبووە و نالی خۆی لە گوندی گردی خاك و خۆڵ کەدەکەوێتە سەرڕۆخی تانجەرۆ لەنزیك پردی تانجەرۆ. هەرچی مەلا محەمەدی برای نالی بووە و مەلای مزگەوتی گەورەی حاجی ئەمینی بێستان سوور بووە کە مدەڕیس و موفەسیرێکی بەتوانابووە و ئێستا گۆڕەکەشی لەنزیك کۆی گۆڕەکانی عێلْ بەگیەکانە لە گۆڕستانی دارەڕەش.

ئەم گوندە لەرووی پەیدا بوونی قوتابخانەی فەرمی یەوە دوای ئەوەی کە هەر لە دێرزەمانەوە حوجرەی هەموو قۆناغەکانی فەقێیانی تیابووە، ئەوەتا لەساڵی (١٩٥٣، ١٩٥٤) یشدا قوتابخانەی کوڕانی سەرەتایی کراوەتەوەو منداڵانی گوندەکانی دوروبەر دەستیان بەخوێندن کردووە، وە قوتابخانەی کچانیش لەساڵی خوێندنی ( ١٩٥٦,١٩٥٧) کراوەتەوە، کەدەتوانریٚ بووتریٚ جگە لە قەزا و ناحیەکان یەکەم گوند بووە کە قوتابخانەی کچانی تیا کراوەتەوە، لەدواوە باسی ئەم قوتابخانەو حوجرانەمان کردووە، ئەوەی شایەنی باسە بەندە نووسەری ئەم چەند دێرە وەك قوتابییەکی پێشکەوتووی زیرەك بەبەڵگەوە لەکاتی دواکەوتنی مامۆستای کچەکاندا بەتایبەتی ڕۆژانی شەممە بۆ دواکەوتنی وانەیەك یا دوو وانە بەندە ئەو بۆشاییەم پڕکردۆتەوە بۆ ووتنەوەی وانە بە پەیڕەو کردنی تەواوی مەنهەج و گویٚ ڕایەڵی قوتابیە کچەکانەوە، هەروەها دەرسم بە کچ و کوڕەکانی ڕیش سپی ئاوایی یەکەمان مام عومەری فەقیٚ عەلی ووتوەتەوە لەڕۆژانی هەینی وپشودا بەداوای مام عومەر لە دایکم و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان، منیش بەو کارە هەڵساوم و بەتواناوە بەبیٚ بەرامبەر بەبەڵگەوە، ئەمانە جێی شانازی منن کەدەوری مامۆستایم بینیوە.

ئەوەمان لەیاد نەچێت کە هەر لە ڕووی کۆنی ئەم گوندەوە باسمان کردووە گۆڕستانی گۆنینە و مەزاری وەیس لە نیو کیلۆمەتری باشوری بێستان سووردا لە ناوباخان لەسەر جۆگەی ئاشی کاك أحمد لە بەرامبەر ئاشی خەزگەڕەش هەڵکەوتووە کە

ئەمیش کۆنی ئەم گوندە دەگێڕێتەوە بۆ هاتنی سەردەمی عەرەب – ئیسلام و پێشتریش.

هەردەم ئەم گوندە لە مێژوودا لە پێنجسەد ماڵ و چەند هەزار کەسێك کەمتر نەبووە، هەروەها لە سەردەمەکانی نوێشدا هەردەم لە سەدوبیست هەتا سەد و پەنجا ماڵ و دانیشتوانی لە پێجسەد تا حەوتسەد کەس کەمتر نەبووە، وا لەخوارەوە بە کورتەباسێك ئەم گوندە دەخەینەبەر دیدی خوێنەران و نامەخانەی کوردی.



**وێنەی مەزاری وەیس**

**گوندی بێستان سوور چۆن جارێکی تر دامەزرایەوە**

وەك لە بابەتەکەدا وتومانە ئەم گوندە بۆ چەندینجار بەدرێژایی مێژوو هەر لەسەردەمی کۆنەوە هەتا سەردەمی ئەم نوسینە چەندین جارو بەچەندین هۆوە بەر کاولکاری کەوتووە، پێش ئەم ئاوەدان کردنەوەی کە ئێستا باسی لێوە دەکەین کەلە سەردەمی ئیسلامدا گوندەکە لەناوچووە، ئیتر هەروا بەخاپوری ماوەتەوە هەتا سەردەمی ڕێکەوتننامەی زەهاو لە پێنج سەدەکانی ڕابردوودا لەنێوان فارسە سەفەویەکان و تورکە عوسمانیەکاندا ڕێکەوتن لەسەر دابەشکردنی کوردستان بەدوو پارچەوە کە هەریەك پارچەیەکیان برد.

هەڵبەت کوردەواری بەزۆری لەو سەردەمەدا بە جافایەتی و گەرمیان و کوێستانەوە خەریك بوون، بەڵام ئەو ڕێکەوتنە بووە هۆی ڕاگرتنی ئەو کۆچبارە، بۆیە هەر لە وەچەکانی بنەچەڕابردووەکانی ئەم گوندە بەسەرۆکایەتی (حاجی أمین کریم) ڕیش سپی هۆزی عێڵ بەگی جاف، ئیتر وازیان لە جافداری هێنا بەو هۆیانەی سەرەوە جارێکی تر گوندی بێستان سووریان ئاوەدان کردەوە.

ئەگەرچی ئاوەدان کردنەوەکە لەلایەن هەندێ هۆزی جافەوە بوو، بەڵام بەسەر پەرشتی و ڕیش سپێتی حاجی أمین لەژێر چاودێری عێڵ بەگی جافدا نیشتەجێ بوون و گوند ئاوەدان کرایەوە، بەژن و ژنخوازی و تەبایی هۆزەکان لەو سەردەمەوە هەتا هەنوکە لەم گوندەدا دەژین لەژێر چاودێری ڕیش سپێتی بنەماڵەی (حاجی ئەمین) دا، ئەگەرچی هۆزەکان جیاوازیشیان هەبووبێ، بەڵام هەر وەك عێل

بـەگی جـاف گوزەراندویانـە. سـەرەتا ئـەم گونـدە لـە دۆڵـی قزڵـەردا ئاوەدان کراوەتەوە کە دەکاتـە بێستان سووری کۆن بۆیـە بـە بێستان سـووری کـۆن نـاودەبرێ ئیـتر دەگوێزنـەوە شـوێنی بێـستان سـووری گەورەی ئیستا. بەش بـەحاڵی بنەماڵـەی خـۆم، ئەحمـەد کوڕە جوتیـار نووسەری ئەم چەند دێرە لەم گوندەدا لەگەڵ ئەو بنەماڵەیـەدا هـاتوون کە بنەماڵەیەکن لە هۆزەکانی عێلی جاف.

هـــەر وەك نمونـــە لـــە ســـەردەمی (ڕەیـــف، ڕەیـــف) کـــە واتـــە (سـەفەربەرلك) کـە تورکـە عوسمانیـەکان لـەژێرناوی جـەنگی جیهانـی یەکەم دا هەرچی لاوی کورد هەیە ئەنفالیان کردووە، بەڵام کـەروویان کردۆتە ئەم ناوچەیەی عێل بـەگی جاف (حـاجی أمین) هەرچـی لاوان هەیە چەکداری کردووە و هانی داون بۆ بەرگری خۆبەدەستەوە نـەدان بەجەندرمەکانی تورك، حاجی امین سەرپەرشتی ئـەو ڕاپەڕینـەی داوە بەدەسـت یـەکێك لـە لاوەکانـەوە کـەناوی (حەمـە) بـووە و ئازاوچـالاك بووە، بەندە لـە بنەماڵـەی ئـەو لاوەیـە، ڕۆژی بەرگریەکـە بـەفرێکی زۆر بـاریوە کـە ئەمبەروبـەری یـاڵ و نیمچەچیاکانی بێـستان سـووریان لـە دوژمـن گرتـووە ڕچـەیان لەبەفرەکـە شـکاندوە و سـەنگەریان گرتـووە، لەکاتی ڕاوەدونانی دوژمندا ئەوکەسـەی کـە پاشتر بووەتـە بـاوکی مـن بەناوی (حەسەن) کە خزمی حەمەی ناوبراو بووە مێرد منداڵ بوە پێی لەبەفرەکـە هەڵخلیـسکاوە و لولـەی تفەنگەکـەی لـە قـوڕو بەفرەکـە چـەقیوە، نـەیزانیوە لولەکـەی گـیراوە کەتەقـەی پێکـردووە لولـەی تفەنگەکەی تەقیوە، ئیتر هـەتا دەسـتی گەیـشتوە بـە گروپەکـەی خـۆی قاچی بریندار بووە و هەتا مردنیش پێوەی دیار بووە.

دوای سەرکەوتنیان حاجی امین بەهۆی دەست و تفەنگ و توانای حەمەوە کەلە سەرەوە ناومان هێناوە کەئەو کاتە پێدەچێ بەدەمانچەو هەندێ سیلاح ووترابێ (وەروەر) جابۆیە حاجی امین نازناوی حەمە دەکاتە (حەمە وەروەر) و ڕێزلێنانی پێدەدات، کە هەتا هەنوکەش بنەماڵەکەمان بەو نازناوە ناودەبرێت[1]، ئیتر ئەم گوندە دەبێتە گوندێکی ئاوەدانی خاوەن بەروبومی کشتوکاڵی، دێمەکارو ئاژەڵداری زۆربەرفراوان هەروەها ئاژەڵداری لەژێر چاودێری بنەماڵەی حاجی ئەمیندا وەك یەك هۆز خەڵکی ئەم گوندە پێکەوە دەژین.

ئەگەرچی ئەم گوندە دەکەوێتە (٢٠کم) ی ڕۆژهەلاتی سلێمانیەوە بەسەر ناوچەی خەراجیان و عەربەتدا دەڕۆیت تا دەگەیتە بێستان سوور، بەلام هەرلە دروست بوونی سلێمانیەوە هەتا ئێستا وەك گەڕەکێکی سلێمانی وابووە بەهۆی بەروبومە زۆرەکەیەوە چونکە سەرمایەدارو بازرگانەکشتوکاڵی و ئاژەڵییەکانی سلێمانی هەردەم وەك ئەڵقەیەکی پێگەیاندن لەم گوندەدا بنەو شێوە نوسینگەو تەنانەت ماڵیشیان هەریەك لە کەشی خۆیدا لێرەدا هەبووەو لەگەڵ خەڵکی ئێرەدا لەگوندو شار سەرو ماڵی بوون. وەك نمونە:.

١. ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشایی ساحێبقڕان لێرە خانوو و ماڵی هەبووە و بیر و باخ و زەوی هەبووە کە شوێنەواری ئەو شوێنانە هەتا پەنجا کانیش هەرمابوون و خانووەکەی لەسەرەتادا قوتابخانەی گوندەکەبووە لەکڕین و فرۆشتنی بەروبومی گوندەکەدا و پارەی پێش وەختی داوە بە جوتیارەکان کە بووەتە هۆی تێکەلاوییەك.

٢. بەکری حاجی فتاح کەئەو بنەماڵەیە مەخزەنی توتنیان لە گومرکە سوتاوەمەی بەر خانەقادا هەبووە هەردەم لەکاتی توتندا شێوە نوسینگەی لێرەدا هەبووە و پارەی پێشوەختی داوە بەجوتیارەکان و بووەتە هۆی تێکەڵاوی گوندو شار.

٣. بنەماڵەی حاجی صاڵحی ڕیش، عەلوەچی لە کاتی ووشکەداندا لەماڵی حاجی ئەحمەدی محە براگەورەی حەمەی محە بنەی هەبووە و ووشکەدانی ئێرەی کڕیوەتەوە کە ئەمیش تێکەڵاوییەکی ترە.

٤. بنەماڵەی حسینی حاجی وەلی، کە هەردەم لە ماڵی کوێخا عومەری فەقێ علی لە وەختی مەرەزەدا بنەی هەبووە و تێکەڵاوی گەرم بووە[٢].

٥. بنەماڵەی حاجی مەلا علی ناسراو بە مەلا علی مایاوای لەکاتی بەروبومی لۆکەدا هەردەم شێوە نوسینگەیان هەبووە و پارەی پێش وەختی داوە بە کشتیارەکانی لۆکە ئەمیش تێکەڵاوی یەکی نزیکی گوندو شاری پێك هێناوە و مەخزەنەکەی لە خانەکەی بەر خانەقادا هەبووە.

٦. شێخ محمدی بەرزنجی صابونکەرانی ناسراو بە کاکەی تەتە بەهۆی ئاشەکانی (خەرقە ڕەش) بەرزنجی و کاك ئەحمەدی شێخەوە

هەردەم بنەی هەبووە لە ماڵی قادری حەمەی عارف کە وەکیلی بووە لەم گوندەدا، ئەویش بوەتە هۆی تێکەلاَوییەك لە شارو گوند.

هەڵبەت وەستا (حەمە چەپە) ی ئاسنگەری کاروباری کشتیاری سەروبەندی زۆری لەگەڵ خەڵکی ئەم گوندەدا هەبووە، هەروەها خاڵە عەبدە خاوەنی گەراجی عەبدەو لۆریەکانی بەهۆی گواستنەوەی بەروبومە زۆر و زەوەندەکانی خەڵکی ئەم گوندەوە ئەویش هەمیشە سەروبەندو ئاشنایی و سەرو ماڵی بوە لەگەڵ خەڵکی دا.

* * *

# بەستی دووەم

# عەشرەتی بێستان سوور

## گوندی بێستان سوور لە ئاستی مێژوو و جوگرافیادا

أ. پێناسە: (بێستان سوور)، کوێیە و چییە؟

ئەم (گوندە) (دێ) (ئاوایی) یە: لە قولایی مێژووەوە گوندێکی ئاوەدان و ئابوری و (ستراتیجی) سیاسی و سەربازی ناوچەی شارەزوور بووە، هەتا ئێستاش، وەك لەسەرەوە باسمان کردووە بەگوێرەی قۆناغەکان، لە هەر قۆناغێکی مێژووییدا ناوێکی تایبەتی هەبووە. وەك:

١. شار گشتی: کە ئەمە بەناوی ناوچەی تانجەرۆ و یاسین تەپەوە بووە.

٢. ساسموا: کە ئەمەش بە سۆرخی ناوی سەردەمێکی شارەزوورەوە بووە لە ناوچەی یاسین تەپەدا.

٣. شوتیرا: ئەمەش بەناوی نشێویەکانی ناوچەی شارەزوورەوە بووە وەك ناوچەی یاسین تەپە و سەراکۆنەوەبووە.

٤. سوراکۆ: ئەمەش ناوی سەردەمێکی سەراکۆنەوە بووە.

٥. گوڵی سورخ: بەناوی جوانی و پیت و بەرەکەت و باخ و بۆلاخەوە بووە.

٦. بێستان سوور: هەر لەسەر گوڵی سورخەوە وەرگیراوە و هەمان مانای هەیە لە (هور)(نور)(خۆر) خواوەندی ڕۆژ و نور و ڕوناکی یەوە هاتووە کە گەوەترین خواوەندی پەرستیاری ناوچەکانی شارەزوور بووە لە کۆندا. .. بەمانای شارستانیەت و گەورەیی و ئاوەدانی و ملك داری و فرمانداری هەرێمیش هاتووە.

ئەم گوندە دەکەوێتە ناوەڕاستی شارەزوورەوە لەسەر باری درێژی وە لە ڕووی ئیداریشەوە سەربەناوچەی (تانجەرۆ)[٣] یە و

سەربە قەزای مەرکەزی شاری سلێمانییە، لە ڕووی شوێن و جێگا و موقعی جوگرافیشەوە کەوتۆتە چەقی[٤] ناوەڕاستی چوارڕێیانەی شاروشارۆکەو دەڤەرەکانی دەوروبەری و بۆتە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و کشتوکاڵی شارۆچکەکان و گوندەکانی دەوروبەر، بەم پێ یە ئەم گوندە هەرلەکۆنەوە شوێنی دیار بووە لە شارستانێتی ناوچەی شارەزووردا.

ب. بێستان سوور: لە ڕووی تۆبۆگرافییەوە

سنوری ئەم ئاوایی یە لە باکورەوە زنجیرە نیمچە چیاکانی (خراپە) و (چەناخچیان) ە و جادە[5] گشتی یەکەی (سلێمانی. هەڵەبجەی شەهید) ە لەباشوورەوە (نیمچە زێی تانجەرۆ) و گوندی (خاك وخۆڵ و نیسکەجۆ) یە، لەڕۆژهەڵاتەوە سنوری ئاوای (زێریجۆ) و زەویەکانی تەپە(عارەوان) ە کەسەربە گوندی (کانی پانکە و زێڕین جۆ)یە دیارە ئەم ناوە (عارەوان) لە (تاڵەوان)ەوە هاتووە، چونکە ئەو دەشتە جۆرە بنە بنچکێکی تیایە تاڵە، بار تیرەی جافەکان زۆرجار لەو دەشتەدا هەڵیانداوە کەلە (عور)ەوە خێڵ، هاتووە...

لە ڕۆژئاواشەوە بەشێکی ناوچەی (عەربەت)[6]ەو بەشێکی دەشتی شێخ لالەیە و سنوری زەویەکانی گوندی (باریکە) یە هەرهەمان دەشتەو (جادەی گشتی عەربەت. دەربەندیخان) ە، لە ڕۆژئاواوە. .. ئەم گوندە کەوتۆتە سەر پانتایەك، کەبەشی خواروی زۆر نشێویە، نیوەی ڕاستی زەویی وزاری گوندەکە زەوی بەراوە، بۆ ئاودێری پشت بە چەم و جۆگاکان دەبەستێ کەلەدواوە باسیان

دەکەین، هەرچی نیوەکەی تریش هەیە لە زەوی و زاری ئەم گوندە، کەوتونەتە بەشی باکوری گوندەکەوە دێمە و بۆ ئاودێری پشت بە باران دەبەستێ، کەلەدواوە باسیان دەکەین. .. زەویە بەراوەکان نزیکەی (٢١٥٠) دەبن، کەنزیکەی (٧٥٠دۆنم) زەوی تایبەتە[٧]... نزیکەی (١٤٠٠دۆنم) پەیوەستی فەرمانگە کشتوکاڵیەکانە[٨]..

زەوییە دێمەکارەکانیش نزیکەی(٢٥٠٠) دۆنم دەبن، نزیکەی ( ١٠٥٠) دۆنم پەیوەستە و نزیکەی (١٣٠٠) دۆنمیش زەوی تایبەتە. .. هەمووی بە دێم و بەراو و ملك و پەیوەستەوە نزیکەی (٤٥٠٠) دۆنم دەبێ جگە لە زەوی چەم و گرد و بەردەڵان ئەوانەش بونەتە لەوەڕگا، لە دواڕۆژدا دەگونجێ ببنە پرۆژەی ئاوەدانی و ئابووری. .ئاو و هەوای ئەم گوندە تێکڕا بە مام ناوەندی دەژمێرێ، چونکە لە زستاندا زۆرساردنی یەو لە هاوینیشدا زۆرگەرم نی یە پایز و بەهاریش زۆرخۆشەو بۆتە نیمچە هاوینەهەوارێك لەناوچەکەدا. .

ڕشەبا و بای شەماڵ و کەمێك وەشتەبا و زۆر کەمیش پێچەبا دەیگرێتەوە.. بارانی زۆرلێ دەبارێ و بەفری زۆرکەمە، چلەی زستان کەمێك زیاد لە سنوری سارده و چلەی هاوینیش گەرمە.

جۆگا و کانیاو و ئاوەکانی بە زستان گەرم و بە هاوین ساردن. لە بەشی باکوری ڕۆژئاواوە زنجیرە گردۆلکەیەکی سروشتی هەیە کە لەسەرجادە گشتی یەکەی (عەربەت. سیدصادق) ەوە دەست پێدەکات و بەرەو ناوەڕاستی هەردوو گوندی بێستان سوور شۆڕدەبێتەوە، لەسەر گردی سەراکۆنی شوێنەواری (ئەکەدی) لە ناوەڕاستی دێکەدا کۆتایی پێدێ ئەم زنجیرە گردە نزیکەی بە (٢٠٠م.٦٠٠پێ) بەرزە و

(٥كم) درێـژ و بـه كلكـەی عەربـەت - بیـستان سـوور ناسـراوه دوای باسی دەكەین لە ڕووی شوێنەوارەوە... لە ڕووی ڕێگاوبانیشەوە، ئەم گونـده بـه ڕێگـای خـۆڵ و قیرتاوبەسـتراوه بـه گونـد و شارۆچكەكانی دەوروبـەری یـەوە بۆتـە هۆكـارێكی سـتراتیجی و ئـابوری بـاش لـە ناوچـەكەدا (دوای باسـیان دەكـەین)، پـرۆژەی ئـاوی خواردنـەوەی شارۆچـكەكانی دەوروبـەر لـەم گونـدەوە سەرچـاوەدەگرن، ئەمـەی سەرەوە باری جوگرافی ئەم گونده بوون.

ج . لە ڕووی مێژوی و كەلەپورییەوە (باری مێژوویی)

لـە بـاری مێـژووی گشتی كوردسـتان و شـارەزوور لـە پێناسـەی گوندەكەشـدا تاڕادەیـەك باسـی بـاری مێـژوویی (بیـستان سـوور) مـان كردووه بە گوێرەی قۆناغ و سەردەمەكانی شارستانیەتی شارەزوور و یاسین تەپەدا، ڕۆڵی سیاسی و ئیداری لە شارەزووردا، هەرلە قولایـی مێـژووەوە هـەتا ئێـستا یـان زیـاتر بڵێـین هـەتا دەوروبـەری كۆتایـی سەدەی (١٧) كەبوو بەم بێستان سوورەی ئێستا كەلەسەرەوە باسمان لێوەكردووە، ئەوەی دەمانەوێ لێرەدا لـە ڕوی مێژوویی و كەلەپوریـی یـەوە بیلێـین ئەوەیـە ئـەم گونـدەی ئێـستا چـۆن دروسـت بـووە؟، ئـەو كەلـەپور و ئاسـەوار و شـوێنەوارانه كوامانـەن لـەم گونـدەدا؟، لـە خوارەوە لێی دەدوێین :

١. بێستان سوور چۆن دروست بوو؟!

وەك وتمان لەدوای ڕێكەوتننامە شومەكەی زەهاوی ســـــاڵی (١٦٣٩) ز لە نێوان ئێران و توركیادا، ئیتر جاف هەندێكی نیشتەجێ بوو، لەنزیكەی (٣٦٠) ساڵ لەمەوبەر بوو. .. سەرەتا بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەسەر گردی (قەڵای كچ) كەناسراوە ئێستا بە (گردی گۆمە ڕەش) لەبەشی ڕۆژئاوای گوندی بێستان سووری ئێستاوە ئاوایيەك دامەزراوە، كە هۆزی (عێل بەگی جاف) ڕیش سپییان (قەرە وەیس كوڕی وەیسی مستەفای عێل بەگی جاف) نیشتەجێ بوون، چەند ماڵێك لە عەشیرەتەكەیی و سێ كوڕی بەناوەكانی (حسێن، شاوەیس، قارەمان) گوندی خاك و خۆڵ ئاوەدان ئەكەنەوە كە بە چەند كیلۆمەترێك دەكەوێتە ڕۆژئاوای گردی (قەڵای كچ) لە نزیك پردی قەرەگۆل بە (١٥٠م)، كەبە بەخێوكردنی ئاژەڵ و كشتوكاڵەوە سەرقاڵ دەبن، بەڵام بەهۆی باج و سەرانەی (توركە عوسمانلی یەكانەوە) كۆمەڵێك لە كوڕ و براو عەشیرەتەكەی ڕەودەكەن بۆ ناوچەكانی (قەرەداغ، گەرمیان، دۆڵی جافایەتی) وە چەند كوڕێكی قەرەوەیس[٩] دوای لەگەڵ چەند ماڵێكی عەشیرەتەكەی درێژە بە ژیان دەدەن.

هەتا نزیكەی دەوروبەری (٣٥٠) ساڵێك لەمەوبەر (حاجی امین قەرەوەیس) ڕیشسپی هۆزی (ئێلْ بەگی جاف)، لە بنەماڵەی ناوبراو بووە، گوندی (بێستان سووری كۆن) بنیاد دەنێ لە ڕۆژهەڵاتی گردی گۆمەڕەش، ئەمە لەسەردەمی پەیدابوونی هەڵەبجەدا لەسەرەتای سەدەی (١٧) دابووە، وە مزگەوتێكی گەورە دروست دەكات بەناوی مزگەوتی (حاجی ئەمین) ئەم پیاوە حەجی بە (٧) ساڵ كردووە

(قورئانێکی) هێناوەتەوە بە خەتی ئاڵتون نووسراوەتەوە هەتا ئێستا ماوە، وە مەلای مزگەوتەکەی (مەلا محمدی ئەحمەدی شاوەیسی قەرەوەیس) برای (حەزرەتی نالی) بووە کە مودەڕیس و موفەسیرێکی بەتوانابووە خاوەنی حوجرە و فەقێ بووە، ئێستا گۆڕەکەی لە نزیك کۆی گۆڕەکانی (ئێل بەگییەکانە) لە گۆڕستانی دارەڕەش.

**دروستبوونی گوندی (بێستان سووری گەورە)**

دوای وەفاتی (حاجی ئەمین کریم)، (فقێ علی قاسم کریم) برازای هەڵئەبژێرن بەڕیش سپیی گوند و هۆزەکە.

پاش ئەوەی کەسەیردەکات ئاوی گوندی بێستان سووری کۆن [(١٠)] ناسازە و ئەو ماسی و بۆقەی کە تێدا دەژی کوێرن بۆیە (بێستان سووری گەورە) ئاوەدان دەکاتەوە، لە سەدەی (١٨) ز واتە لە هەشت سەدەکانەوە (بیستان سوور دەبێتە دوو بێستان سوور) مزگەوتێك بەناوی مزگەوتی حاجی ئەمین لە بێستان سووری گەورەش دەکاتەوە پاشان وەستای ئێرانی دێنێت و باڵخانەیەکی دووقات بە درێژایی (١٠٠م) دروست دەکات، کە قاتی خوارەوەی تایبەت بووە بە میوان و دەست و پێوەندەکانی وە قاتی سەرەوەی بۆ خێزانەکانی (خاتوون، پەری خان، مەنیج، پیرۆز) کە (دایکە خاتون) خاوەن دەسەڵات و قسە بووە زۆر سیفەتی پیاوانە و جوامێری تێدا بووە و لە کاتی غیابی (فقێ علی)دا خاوەن دەسەڵات و فرمان بووە ئیش و کارەکانی گوند و عەشیرەتی ڕاپەڕاندووە.

ئاسـەواری باڵەخانەکـە تـا ئـەم دوایـەش کـە نیـشانەیەك بـوو بـۆ دەسەڵات و هونـەری ئەندازیاری ئـەوکات و سـەردەمە، هـەر مـابوو. لـە قاتی خوارەوە کە تایبەت بووە بە میوان و پێش وازی لە چەند بەشێك پێك هاتبوو:

- دیوەخان: شوێنی پێشوازی و کۆبونەوەی پیاوماقوڵان بووە.
- پێشوازی: شوێنی دەست و پێوەندەکان بووە بۆ پێشوازی.
- وەجاخ: شوێنی چالێنان و سەماوەر و قاوە برژاندن بووە.
- مەخزەن: شوێنی هەڵگرتنی دانەوێڵە و خۆراك.
- ژوری ئیـسراحەت و نوسـتن و حـەرەس و دەسـت و پێوەندەکانی دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی باڵەخانەکەوە.
- تەویلـە: دەکەوێتـە بەشـی بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی باڵەخانەکـە و دور لە ژوورەکانی تر ئەمەش بـۆ جێگـەی وولاخـی سـواری واتـە (ئەسپ و ماین).
- هەروەها شوێنی تانجی ڕاویش جیابووە.

هـەموو خـزم و کـەس و عـشیرەتی خانویـان کـردووە تـەوە لەدەوری تـەبا و گیـانی برایـەتی هاوکاریـان هـەبووە نـاوی هەنـدێ لـەو بنەماڵانـەی کەلـەو سـەردەمە لـە بێـستان سـوور بـوون (بنەماڵـەی حمـە سعید ڕەمەزان، حمەی عارف، محمود قاسم، کەرەم وەیس، عبدالکریم سلیمان، محمد عبدالله، عبدالرحمان وەلی، فرج، حمەامین قالە عاسـێ، حمەخان، مام ڕەحمان، ڕەحە پیوە، قادر حمـە شـریف قیتـول، سـعید صالح قول قەوی، صاڵح مارف، خواکەرەمەشەل، ئـەمین شـریف، حمـە

سيد ئەولاّ، مەولو كريم، عبدالكريم حمه صالح، قاله پينەچى، كريم مۆته، حمەخان حسين، حاجى على، خەجێ زله، قادر زلێخا، محمود گولّ حمەشانه، عبدالرحمان گوێزدەم، مام يوسو بەلّجيقا، حسێن، مچه چەته، كريم دەروێش، ئەحمەدى فقێ صالح، مامەوەيس، كوێخا عارف گزير فقێ على، ڕۆستم كريم مايلى، بنەمالّەى وەروەر (بنەمالّەى نووسەرى ئەم كتێبه)،عەزەى خونچە،محه دونان.

دواى ئەو ژنه شەنگه ئازا و بە جەرگه كە وەك پياو خەنجەر ڕەزنەى فيشەك لە خۆى داوه ناسراو به (دايه خاتوون).

مزگەوت و بالّەخانه و خانوو دروست كراوه بۆ سالّەهاى سالّ لەگەلّ ئەو هۆزانەدا كەباسمان كردن نيشتەجێ بوون نووسەرى ئەم چەند دێره لەبنەمالّەى (وەروەر) ە كەباسيان لەدواوه دەكرێ، خەلّكى ئەم گونده بەئاژەلّدارى و كشتوكالّەوه خەريك بوون و (حاجى ئەمين) ڕيش سپى گوندەكه بووه و زۆر پياوێكى ئاينى و لەسەرخۆ و عادل و بەمشور و خاوەنى لاوديوەخان و ڕاوێژ بووه.

ئەم هۆزانەى كه باسمان كردن گەرچى جاروبار ساردى يەكى هۆزايەتى لە نێوانياندا ڕوويداوه بەلاّم لەهەموو خۆشى و ناخۆشيەكدا و هەمووكاتێك وەك يەك خێزان بۆ يەكتر بەپەرۆش بوون هەتا ئێستاش، ئەم گونده يەكەم گوندبووه لەسەردەمى نوێدا واته له سەدەى (١٧) بەدواوه خاوەنى مزگەوت و مەلا و فەقێ و فەتواو خوێندن بوو لە دواى شارى هەلّەبجه و خورمالّ.. (حاجى حمەمراد) تەمەن (١٣٥) ووتى يەكەم مختارى ئەم گونده (حمەخان) بووه لەبنەمالّەى وەروەر لەسەر فەرمانى حاجى ئەمين.

لاوی تـازە هەڵکـەوتوو (عمـری فقـێ علـی) بـووە بـە یەکێـك لەناودارانی هـەموو ناوچـەکەو بگـرە لەدەوروبەریـشدا، ئـەملاوە (کـچی حاجی قادری وەیسی) مارە کـردوە کەیـەکێك لـە بنەماڵـە ناودارەکانـی (هۆزی ڕۆغـزای) بـووە و نـاوی (فەیمـەی حـاجی قـادر) بـووە بەڕاسـتی کەبە دادە فەیم ناسرابوو هـەر خـۆی (دادە) وەك پیـاو مامەڵـەی دەکـرد لـەماڵ و دیوەخـان و ڕاوێـژدا، وەك کەسـایەتیەکی سـاکار و بەسـیت خـۆی نیـشان دەدا، ئیـتر ئـەم پیـاوە نـاودارە (عمـری فقـێ علـی) مختـار بووە هەتا پەنجاکانی ئەم سەدەیە و لەوەودوا فرمانی مختاری داوە بە براکەی کە ناوی (حاجی ئەحمەد) بووە ناسراو بە کوێخـا ئەحمـەد، لـە سـەرەتای شەسـتەکاندا کـۆچـی دوای کـردووە، فەیمـەخانیش ڕۆژی ڕاگوێزانەکـەی گونـدی بێـستان سـوور لەلایـەن ڕژێمـی بەعـسەوە لەهەشـتاکانی ئـەم سـەدەیەدا لەگـەڵ ڕوخـانی خانووەکـانی تـەکێ و دیوەخانـە تایبـەتی یەکەیـدا یەکسەر سوێندی خـوارد کـە ئـەو گونـدە بـەجێ نـەهێڵێ مەگـەر بـە مـردن، دارێـك کەبـە پێوەمـابوو لـە حەوشـە ڕوخاوەکەدا دەچێتە ژێردارەکـەو دوای نوێـژی نیـوەڕۆ سـەر دەنێتـەوە بەسەر خشتێکی خانووە ڕوخاوەکەدا ئیتر پێی زانرا گیـانی بـە گونـدە وێرانەکـەی سـپاردبوو سـوێندەکەی بـەجێ هێنـاو لـە گـۆڕسـتانی دارەڕەشی باوباپیرانی دوابارەگای گرت و ڕاگوێزنەبوو.

ئـەم گونـدەی بێستان سوور وەك باسمـان کـرد دوای دامەزرانـی هەتا هەشتاکان ڕاگوێزان وەك خۆی مایەوە، لە ڕاگوێزانیشدا کە کاول کـرا دوای ڕاپـەڕین زۆر بـەخێرایی ئـاوەدان کرایـەوە، لـە ڕاگوێـزدا دوا مـاڵ کەهـەر خـۆی گـرت بـۆ چـەند مانگێـك و چـەند ژورێکـی بـە پێـوە

مابوو هەتا دوبارە شۆفڵ تەختی کرد ماڵی (محمد حسن) برای نووسەری ئەم چەند دێرە بوو وە بەبەڵگەشەوە لەگەڵ ماڵی حمەی اورەحمان، یەکەم ماڵیش کە گوندەکەی ئاوەدان کردەوە پێش چەند مانگێك لە پێش خەڵکی دا هەرهەمان ماڵ بوو هەم بەبەڵگەوە چەند مانگێك دوای ڕاپەڕین و ئەم کەسە لە بنەماڵەی (وەروەر) ە، ئێستاش ئەم گوندە یەکێکە لە گوندە خنجیلانەوناودار و زەوی و زاری بەپیت و ئاژەڵدار و شارستانیەتی خۆی هەیە لە ناوچەکەدا[11].

٢. کەلەپور و شوێنەوار و ئاسەوارەکانی بێستان سوور

أ. گردی یاسین تەپە: ئەم گردە یەکێکە لە پانترین و بەرزترین و گەورەترین و کۆنترین گرد و ئاسەوارەکانی ناوچەی شارەزوور، لەسەر شێوازێکی لاکێشەیی بەرزوپان داڕێژراوە ڕوبەری سەر گردەکە (٨دۆنم) پانە و بە لاکێشەیی کەبەرزییەکەی نزیکەی (٢٥م) درێژییەکەی (٢٠٠م) پانی یەکەی (١٠٠م) ڕووبەری سەرەوەشی نزیکەی (٨دۆنم) دەبێ.. لای باشوری گردەکەوە بەئاوی زێی تانجەرۆ دەورەدراوە، سێ لاکەی تری بەبەربەندێك[12] لە ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، باکوری گردەکەوە دەورەدراون، کەئەم بەربەندە کاتی خۆی ئاوی لە چەمە ڕەشەوە بۆ هەڵگیراوە پڕکراوە لە ئاو بۆ کاتی تەنگانە و هێرشی دوژمن، ئاسەواری جۆگەی ئاوەکە، کەبۆی بڕاوە لە چەمە ڕەشەوە لەناوەڕاستی چەمەکەدا ئێستاش ماوە کەبە ماددەیەکی وەك قسڵ وایە دروستکراوە دیارە ئەو بەربەندەی سەرەوە وەك پردی هاتوچۆبووە لەمەرکەزی (یاسین تەپەوە) بۆ گرد و خاڵەکانی و

گونـدەکانی بەشـی بـاکور. .. ئاسـەواری ڕێگاکـەش هەرلەمەرکـەزی قەلاّی یاسین تەپـەوە کـە کەوتۆتـە بەشـی بـاکوری سـەربانی گردەکەوە دیـارە تـا بەربەسـت و پردەکـە و لەوێـشەوە بـۆ گـردی سـەرا کـۆن، گۆڕستانە کۆنینەکەش کەهی سەردەمی مەرکەزی قەلاّ و نیشتەجێ پاشا نشینەکەیە لە باکوری بەربەندی یاسین تەپەوەیە. .. ئەم گردە وەك لەسـەرەوە باسمـان کـرد، مەرکـەزی نیـشتەجێی پاشـا نـشینی هـەموو قۆناغـەکانی شـارەزوور بـووە لـە مێـژوودا جگەلـە سـەردەمی پەیدابوونی ناوی شارەزوور لە(هاشمار) نیشتەجێی پاشا نشین بووە لای هەڵەبجـەدا وەك لەسـەرەوە باسمـان کـردووە، ئـەم گـردی یاسـین تەپەیـە چـەند خـاڵێکی سـەربازی هـەبووە بـۆ پاراسـتنی لـە هێرشـی دوژمـن لـە هەرچـوارلای گردەکـەوە بـەدوری یـەکی مامناوەنـدی وەك: لەباشـورەوە گـردی (مـالوان) لـە باشـوری ڕۆژهەلاّتـەوە گـردی (مـارف) لەڕۆژهەلاّتـەوە گـردی (مـوان\کـانی پانکـە)، لـەباکورەوە گردەکانـی (کـاژاو، بێـستان سـوور، سـەراکۆن) لـە گونـدی بێـستان سووردان لـە ڕۆژهـەلاّت و بـاکور و باشـوری ڕۆژهەلاّتـەوە گردەکـانی (دسـکەرە، خـاکوخۆڵ، عەربـەت)، سـەراکۆن مەرکـەزی ئییـداری و سـەربازی ناوچەکەبووە لە گوندی (سوراکۆ)[١٣].

گردی گۆمـەڕەش کـە بەبەربەنـدێکی گـەورە دەورە دراوە و ئـاوی لەسەرچاوەی گونـدی بێستان سوورەوە بۆ ڕاکێشراوە هـەم بـۆ کاتـی تەنگانـە بەربەنـدی دەوری گردەکـەی پـێ پڕکـراوە، هـەم بـۆ ئـاودێری دەشـــتەکانی دارەڕەش، بەربەنـــدی سەرچـــاوەی بێـــستان ســـوور کەبەهەمان ماددە قسڵیەکەی بەربەندی چەمەڕەشـە و لـەگۆمی بـەردەم

ئاواییەکەوە ڕاکێشراوە کە ئەو شوێنە[١٤] بە (سەترەکە) ناسراوە، دوای ئەوەی لە دەوری گردەکە هەڵکەنراوە و زۆرقوڵکراوە ئاوێکی لێپەیدابووە لە زووەوە بە گۆمەڕەش ناسراوە و تا ئێستاش ئاوەکە ماوە، بەڵام گۆمەکە پڕبووەتەوە کە کاتی خۆی زۆرقوڵ و تەنورەیی[١٥] بووە ئاسەوارەکانی ماوە، گۆڕستانی کۆنینەو نوێی ئەو گردە و گوندەکانی کەبە گۆڕستانی دارەڕەش ناسراوە هەتا ئێستاش شوێنەواری ماوە و بووە بە گۆڕستانی نوێی گوندەکانی دوروبەر.

دیارە گردی گۆمەڕەش وابەربەند و پارێزگای هەبووە جێگای ئیداری و خاڵی پشکنین و گومرك بووە بۆ ناوچەکە، گردی گۆڕی (گەوری) یش کەگردێکی بچوکە خاڵێکی پشکنین بووە و گۆڕستانەکەی لە دەشتی خۆیەتی و زۆرکۆنە و دیارە لەماوەی شەوێکدا کاول کراوە و ئەو پەیکەرە ئێسکانەی کەبەدەم جوت کێلانەوە دەردەکەون لە گۆڕی بەکۆمەڵ دەچێ کەهەر لەوێدا دوای شەڕوپێکدادان بوون بەژێر خانوو و گردەکەوە و بەگۆڕی گەوری ناسراوە[١٦] بەڵام من بۆ گۆڕی گەورەکان دەچم، چونکە ووشەی گاور لەدوای مەسیح و ئیسلامەوە پەیدا بووە، دەشبێ گۆڕی سەردەمی شەڕەکانی ئەسکەندەریش بێت لە شارەزووردا.

شوێنەواری (سێ ئاشە) کەکۆمەڵێك ئاشی ئاو بوون لەسەر ڕۆخی چەمەگەورە (چەمەڕەش) لەنێوانی گوندی بیستان سوور و یاسین تەپەدا، کەبەهەمان قسڵی بەربەندەکانی تر کەناومان بردوون دروست کراون، دیارە ئەمانە ئاشی ئەو سەردەمەی ئەو فەرمانڕەوایانەبوون.

گۆڕستانی سەراکۆن کە بە(بەرامبەرەکە) ناسراوە، گۆڕستانێکی زۆر کۆنە کە باسمانکرد. هەتا ئەم دواییانەش کێلی زۆر و بەردی چەند مەتری تێدا بەدی دەکرا کە ئاسەواری کۆنیان پێوەبەدی دەکرا، بەداخەوە کاولکاری و ڕاگوێزان ئاسەواری ئەم گۆڕستانەی نەهێشت و سەر گۆڕستانەکە بوو بە ماڵ و ساحە و هتد... بەلأم شوێنەواری گۆڕستانەکە هەر ماوە و بەشی باشوری گۆڕستانە کۆنەکە بووەتە گۆڕستانێکی نوێ کە ئێستا مەزاری خاتوو فاتمە و شێخ مستەفای تیایە. ئاسەواری (دوودۆڵە) کە ئەم دۆڵە دۆڵێکی کۆڵەکەییە نزیکەی ٢,٥ تا ٣ کیلۆمەر دەبێت و لەناو گوندی بێستانسوورەوە دەست پێدەکات هەتا بەشی باکوری گوندەکە بۆ زەویەکانی کە هی بنەماڵەی کەرەم وەسییەکانە و ئێستا بەدەشتی تەیارەخانەکە ناسراوە. لەوێدا بەم شێوەیە(دوودۆڵە) و کۆڵەکەییە و دوو لقی لەبەشی سەرەوەدا هەیە بەسراون بە لقێکی درێژەوە کە شۆڕبۆتەوە بۆ ناو گوندەکە کە ئێستا بەربەندێکی بۆکراوە بە پشتی گوندەکەدا بۆ بەرگری لافاو لە پرۆژەی ئاوی خواردنەوەکە کە باسمان کرد، بەرەو گردی کاژاو. دەڵێن کاتی خۆی سەرچاوەی بێستانسور لەم دوو دۆڵەدا بووە. بومەلەرزە بەناوبانگەکەی ساڵی (٢٢٦)ی زاینی کە لە ناوچەی شاربازێڕ و پێنجوێنی داوە، هێڵێکی ئەو بومەلەرزەش بەهەورەگرمەیەکەوە بەرناوچەی شارەزور کەوتووە و لە گوندی بێستانسوری ئەو سەردەمەی داوە و ئاوی سەرچاوەکە لە دوودۆڵەوە هێڵی خۆی گۆڕیوە بۆ ئەم سەرچاوەی ئێستا و ئاسەواریش دیارە، هەتا دەوروبەری ئەم سەردەمەی پێشوش دوودۆڵە ئاو و قەڕەم و

ژاژی هەر ماوە و ڕاوە ماسی تێداکراوە و خەڵکی پیر و ئەو سەردەمە دەیانوت لە دوودۆڵەدا ڕاوەماسیمان کردووە و قامیشمان بۆ توتن بڕیوە لەوانە (حاجی حمەئەمینی قالە عاسیٚ، تەمەن ١٣٥) کە لە حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا کۆچی دوایی کرد، هەروەها (مام رحمان) تەمەن(١٢٥)ساڵ و (حاجی حمە موراد) تەمەن (١٣٥)ساڵ هەر ئەمەیان دەوت، دیارە بومەلەرزەکە گەر لە پلەی ڕەختەردا شارباژێڕی گرتووە بەقورسی بووەتە هۆی ڕەوی دانیشتوانی شارەزوور. بۆیە ئەو سەردەمە شارەزوور ئەوەندە قەڵەباڵغ بووە کە شارەزوور بە کویستار واتە شاخ نشینەکان ناوبراوە، واتە خەڵکی شارباژێر کە ڕەویان کردووە بۆ شارەزوور وە هەر لە هەڵەبجەوە بۆ خورماڵی ئەو سەردەمە و بە خەتی سەیدصادقدا بۆ سەراوی سوبحان ئاغا خانوو ئەوەندە چڕبووە دەڵێن گوێرەکە بەسەربانداا ڕای کردووە لەوسەر بۆ ئەمسەر، جا ئەو بومەلەرزەیە بەهەورەگرمەیەکی گەورەوە بەسەر بێستانسور کەوتووە گەرچی بومەلەرزەکە هێزی ڕەختەری کەم بووە بەلاٌم هەورە گرمەکە زۆر بەتەوژم بووە توانیویەتی هێڵی ڕێڕەوی سەرچاوەکە بگۆڕیٚ بۆ ئەو جێگایەی ئێستای.

لە ناوچەی بێستان سوریشدا لە دەشتەکانی تەیارەخانە و دەشتی زریسکەکە لەبەرەو ڕێگای چاڵەپان دەڕوات بەناویدا، بەردی (گۆئاسن) کە جۆرە بەردێکە ٤/١کیلۆ، ٢/١کیلۆی (قورس و ئاسنین)ە مەیلە و قاوەییەکی ڕەش و باوە کە دەڵێن ئاسنی خۆی لە قۆناغەکانی مێژوودا بومەلەرزە و نیمچە گڕکانێك(بورکان) لە (یاڵی مامە رحمان) لە شوێنێك بەقەڵبەزەکان ناسراوە، بە دەماودەم دەڵێن لەوێوە وەك

نیمچه بورکانەکه سەریهەڵداوە و ئەو پارچە بەردانە کە بە گۆئاسن ناسراون پزیسکەکەی ئاگرینی ئەو بورکانەن. (یالْ) واتە لوتەی نیمچە چیا، لوتکەیەك لە ڕیزەگردۆڵکەکانی کلکەی عەربەت/ بێستانسور هەیە ئەو لوتکەیە نزیکەی ٢ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەلأتی ئاواییەکەوەیە، ڕێگەیەك لە گوندەکەوە ڕەت دەبێت و بە بناری لوتکەکەدا دەڕوات بۆ سەر زەویە دیمەکارەکانی شێخ لاڵە و بۆ شارۆچکەی عەربەت کە لە کۆندا ئەو ڕێگەیە، ڕێگەی هاتوچۆی گوندەکانی بێستانسور و دەوروبەری بووە بۆ عەربەت و هەروەها کشتیارەکانی دەشتی زەویەکانی شێخ لاڵەش لەو ڕێگەیەوە هاتوچۆیان کردووە، جا لە ڕۆژهەلأتی لوتکەکەوە دۆڵێك هەیە لە پارچە زەوییەکی کشتوکاڵی چاك و فراوان ئەو زەویە لەدێر زەمانەوە بەدەست بنەماڵەی (مام رحمان)ەوە بووە. بۆیە زەویەکە و گردەکە و قەڵبەزەکانی کە گوایە شوێنی بورکانن هەمووی بەناوی (مام رحمان) ەوە ناسراوە، مام رحمان پیاوێکی بچکۆلانەی وچاخ کوێری بەتەمەن بوو، زۆر قسەخۆش بوو، کشتیارێکی زۆر چاك بوو، گەلێك دەنگوباسی کۆنی ئەو دەوروبەرەی دەزانی چ خۆی بینی بووی و چ لە باوباپیرانیەوە بیستبووی، بەلأم بەداخەوە کەمێك ڕادەی زانستی لاواز بوو بۆیە بەسەرپێیی باسەکانی دەزانی، گەرچی هەندێ شتی دەربارەی بوونی دارستان لەو یالأنەی خەرابە و کلکەی چەناخچیان و عەربەت و دەربارەی دوودۆڵە و ئاوی دوودۆڵە و بێستانسور و گۆئاسنەکان و تیرەکانی ئەو ناوچە و ئەم شتانەی بەسەرپێیی و کتوپڕ دەزانی.

٣. هەر لە کەلەپور و ئاسەواردا: گەلێ ئاسەواری تر کە تەمەنیان نوێیە لە بێستانسوردا هەن وەك: بیرەکانی ئاغا، کە ئەمانە ڕیزە بیرێك بوون لە باکوری گوندەکەوە کە کاتی خۆی عبدالرحمان ئاغای ساحب قران هەڵیکەندوون. کارێز ئاوی بۆ ئەو زەویانە لێدەرهێناوە کە دەکەونە بەردەمی کارێزەکان و بەزەوی ڕێگەی دارەکە ناودەبرێت، مزگەوتی گەورەی بێستانسور کە بە مزگەوتە کۆنەکە ناسراوە و شوێنەواری ماوە، مزگەوتێکی دووقات بووە کە لەزستاندا لەناو دیوارەکەدا بۆشایی هەبووە و تینی گەرمی تەنورە ئاگرێك بەستراوە بە بۆشاییەکانەوە کە ئاگردراوە ژوورەکان گەرم بوون. ئەم مزگەوتە لە هەیوانێك و ژوورێکی گەورەی جومعە و جەماعەت و جێگای مردوو شۆرین و حوجرەی فەقێ و ژوور و ماڵی مەلا و هەورەبان پێکهاتووە، لەم مزگەوتەدا مودەریس و خەتیب و فتوازان و هتدی تیابووە. جا گەر مەلایەکی زانابووبێ یان هەندێ جار زیاد لە مەلایەك هەیئەتی تایبەتی هەبووە بۆ ڕاوێژ و مشاوەرە، ئەم مزگەوتە حاجی ئەمین دروستی کردووە و مەلا و حوجرە و فەقێش بەشی زۆر لەسەر حاجی ئەمین بووە و خەڵکی گوندەکەش هاوکارییان کردووە. مەلا بەناوبانگەکانی ئەمانە بوون: مەلا محمدی قەرەوەیسی برای حەزرەتی نالی ،(مەلا کاکە حەمە) دەڵێن سکەی لێداوە، (مەلا عبدالرحمان. بێ لوت) تۆزێ منگ بووە بە بێ لوت ناسراوە و زۆر زانا بووە، (مەلا شێخ تۆفیق بەرزنجی) کە زۆر زیرەك بووە.

مەلایەکی تری سنەیی کە مدەریسێکی زۆر بەتوانا بووە بەداخەوە ناوی نازانین. (مەلا عبداللەی هەجیج) کە فتواوێژ و

مدریسێکی زۆر بەتوانا بووە. (مەلا شێخ عوسمانی دۆڵپەموو)، (شێخ حسین شێخ رەحیم) کە زاهیدێکی گەورەی دینی بووە، (مەلا قادری سۆفی) زانا و مدەریس... هتد، ئەمانە لە مەلا کۆنەکانن کە ناویانمان بیستووە و هەندێکیشمان بینیوە.. هەر لە ڕووی ئاسەوارەوەئاشی کاك ئەحمەدی شێخ ئاشی(خەرقەڕەش. خەرگەڕەش) ئاشی باوەحاجی کە دەڵێن خاوەندداربووە(واتە خێوی تیابووە و لە بێ وەختدا کەس بەتەنیا نەیتوانیوە بەوێدا بڕوات)، (مامە ئەحەی ئاشەوان) کە بە ئەحەشەل ناسرابوو دەیوت من خێوەکەم دیوە سەرەتا لە شێوەی بزندا و دوایی بووە بە مرۆڤ و داوای خۆراکی کردووە و مسوڵمان بووە و بێ زیان بووە. بەڵام ئەگەر کەسێك بەکاری خراپە لەوناوەدا بجولاّیەتەوە ئەوا زیانی پێدەگەیاند، دیارە ئەمە ئەفسانەیە و لەوانەیە ئەوە بۆ ئەوە دروستکرابێت کە کەس نەتوانێت دزی و شت لەو ناوەدا بکات یان هەر کارێکی خراپ بەڵام مامە ئەحە زۆر بە ڕاستگۆیانە دەیگێڕایەوە، مامە ئەحە پیاوێکی شەل بووە وە دەرویشێکی مسوڵمان بوو وجاخی کوێر بوو لە بنەچەدا هەورامی بوو بەڵام لە باوباپیرەوە هاتونەتە ئەو گوندە و بەئاشەوانیەوە خەریك بووە، زۆر قسەخۆش بوو هەمیشە پێدەکەنی ... منداڵی زۆر خۆشدەویست .. خێرۆمەنیش بوو بەسەر موچەی خرەئاشەکەیەوە. گردەپیاوێکی بەتەمەن بوو لە نزیکی ٨٥ساڵ زیاددەبوو.. ئاسەواری ئاشی کوێخا عومەر کە بە (ئاشی خەندەك) ناوەبرا هی بنەماڵەی عمری فەقێ عەلی بوو. لەڕووی بەڵگەنامەی بوونی مزگەوت و مدرەسەی دینی و تەکێ و خانەقاوە هەروەها مەلای بەرز و مدرس و

موفتی و شێخی زاهید و موریدەوە گوندی بێستانسور لە دێر زەمانەوە خاوەنی ئەو شتانەی سەرەوە بووە و مێژوویەکی قوڵ و بەرچاوی لەڕووی ئاینی و ڕۆشنبیریەوە هەبووە بۆ بەڵگەی ڕاستی ئەو مەبەستەی لە دەسنوسێکدا کە بەچەند دێڕێکی زانایەك و چامەیەکی شیعری شاعیرێکی دەیان ساڵ لەمەوبەر لە بنەماڵەی شێخی نێرگزەجاڕ لە لای (مامۆستا شێخ حسین شێخ عوسمان) نێرگزەجاڕی دەستمکەوت ئەو ڕاستیانە دەسەلمێنن ئەمەش هۆنراوە و نوسراوەکەیە. لە کەشکۆڵەکەدا بەم شێوە هاتووە:



**دیمەنێك لە گوندی بێستانسور**

(مەلا ئەحمەد بۆ مەلاّ محمد ئەمینی نوسیوە)

**هاتگە بێسانسوور.. هاتگە بێسانسوور**

**مامۆستا! شێخن هاتــگە بـــێسانسوور**

**هەرچی مشایخ هاتگە ئەم نـــــــــاوە**

**وەك هیچ کام نیە ئێجگـــــــــار تەواوە**

**فرە حەز ئەکەم تۆیش دڵـــــــت نەرم وێ**

**موخلیس بوی و ئامشۆت گــــــــەرم وێ**

**ئەر قولاو بدەن لە کــــــــــاسەی چاوم**

**شێخ وەها نەوێ موخلــیسی نـــــــاوم**

**لە ڕۆم تا عەجەم لە خـــوار تـــاوەژوور**

**هەرگیز شێخی وا نەهاتــگە شـــارەزوور**

**خەڵقە ئەیوت ئەحمەد زۆر دڵــــی ڕەقە**

**بێ تۆبە ئەمرێ جێگــــــەی دۆزەقــــە**

**بنازم بە صنع پادشای غـــــــــەفوور**

**تەواو ڕووی دنیا پڕبووگە لە نـــــــوور**

مەلا محمدی ناوجافیش بەم چامە درێژە وەڵامی مەلا ئەحمەد ناو ئەداتەوە کە من لێرەدا تەنها گوڵبژێرێکی دەخەمە پێشچاو:

وەك شابازنەویٚ .. وەك شـابازنەویٚ
مەلا! مشایخ وەك شـــــــــابازنەویٚ
لە پێنج تەریقەت خۆشەویســـت نەویٚ
پەسەندی مەعقول کل مجلیس نەویٚ
حاکمی دنیاش تـــــــــا تەواو نەویٚ
روتبەی حـــوکمەتی بــــــۆ ڕێناکەویٚ
ئەوســـــا لایقە بێینە ســـــــەرتەخت
وەلیٚ کــەس نایکا وەحاکمی وەخت

لە کەلەپورەکاندا باسی گۆمەڕەش و قەبرسانەکانمان کردووە لەسەرەوە.. ئاسەوارێکی تر کە ئەویش گەرمکی قاسم بووە و ئەفسانەی خاوەندار بووە هەروەك ئاشی باوەحاجی ئەم شتە ئەفسانە و خورافیانەش بەشێکن لە کەلەپوری بێستانسور بۆیە ناچارین باسیان بکەین ئیتر ڕاستی و ناڕاستیان تا چی ئاستێك بێت: (دارەکەی قادری حەمەشەریف) یەکێك لە شوێنەوارە ناسراوەکانی ئەم گوندەبوو، کە داربەڕوویەکی ئێجگار سەروکەشك جوان بوو بەپیرۆز ناسرابوو لە بناری چیاکەی چەناخچیان و نزیك گۆڕستانێکی کۆنینەبوو، تەمەنی زۆر کۆن بوو بەدەماودەم دەیانوت ئەو دارە هەر هەبووە، ئەو دارە کەوتبووە نزیك پارچە زەویەکەوە کە بەدەست (قادری حەمەشەریف)ناویٚکەوە بووە لە بنەماڵەکانی بێستانسوور و

لـه هـۆزی ئـاڵی بـەگی. ئـا لێـرەدا ئـەوەمان لـەبیربێت ئـەو ئاسـەوار و کەلەپور و شـوێنەوارانەی کـە باسمـان کـردوون بـەو ناوانـەی ئێستاوە ناومـان بـردوون بـە مـروری زەمـان بـەگوێرەی شـوێنهەڵکەوتنیان و خاوەنـداریان ئـەو ناوانـەیان وەرگرتـووە.. خـۆ بـاس تووەکـەی عارفـە گزیر ناکرێت ئەم تووە کۆنە لە (١٥٠)ساڵ تێپەڕیوە قەدەکەی (٤مەتر) ئەستورە و بۆجاری چوارەم لە بوونیدا سەدان پەلی بۆ کۆڵەکە و نیرگە ودارەدا و سوتان لێکراوەتەوە... ئەم تووە دەڵێن پیاوێکی سمێڵ قیت و قسەخۆش و قسەزان نێژاویـەتی کاتێك کـە خـۆی مێردمناڵێك بووە ئـەو پیـاوە (١١٠)سـاڵ تەمـەنی گوزەرانـدووە و هـەردەم ڕاوێـژکاری گوندەکە بووە، وەك وتمان لیژنـەی پیاوماقوڵی ڕاوێـژکار گوندەکـەیان بـەڕێوەبردووە لـەکاتی خۆیـدا جـا ئـەو پیـاوەش واتـە (مـام عـارف)ە یەکێك لە هەرە ڕاوێژکارە گرنگەکانی بووە و بە عارفە گزیـر ناسـراوە. ئێستاش وەچـەی مـاوە و لـە بنـاری هـەورامانن.. (کـانی خـەرقـەڕەش) ئەویش سەرچاوەیەکی ڕوون و شیرین بەزستان زۆر گـەرم و بەهاویـن زۆر سـاردە و بـە پـیرۆز ناسـراوە مێـژووی زۆر کۆنـە و دەتوانرێـت بوترێـت خەلیفـەی هاتۆتەسـەری، هـەرکاتێك باران زۆر نەبارییایـە ئـەوا شتێك یان کەسێکی پیرۆز دەخرایە ئەو کانیەوە نوێژە بەبارانێ دەکرا و نـزا و نیـاز دەکـرا و خێـر سـەردەبڕا و ئیـتر بـاران بـاریوە، شـێخی خەرقەڕەش کە زاهیدێکی بەناوبانگ بووە هـەر کاتێك لـە بێستانـسور بووبێت لەسەر ئەو کانیە نوێـژی کـردووە و وتویـەتی ئـاوی ئـەم کانیـە بۆ چارەسەری نەخۆشی بەتایبەتی مناڵ زۆر چاکە، هـەردەم ئـەو ئـاوە بە پیرۆز زانراوە.

(مەزاری وەیس) ئەویش شوێنەوارێکی کۆنە کە گوایە وەیس بەڕێبواری کە بۆ بەغدا چووە بۆ زیارەی عبدالقادر گەیلانی لەوێدا حەواوەتەوە لەباخ و باخات و ئاوێکی ڕوون و سارد و جوان ئەو ئاوە دوای ئاشی کاك ئەحمەدی شێخی گێڕاوە، جا وەیس سەرگە و گردۆڵکە و سەحەنی بۆ نوێژ و حەوانەوە داناوە لە سەفەرەکەیدا گۆڕستانێکی زۆر کۆنی بچوکی لێیە ئیتر خەڵکی وتویانە مادەم ئەو گۆڕستانەی هەڵبژاردووە دەبێت زۆر گۆڕستانێکی پیرۆز بێت، لەوکاتەوە مەزارە و خەڵکی چوارشەممان و هەینی چوونەتەسەری بۆ نیاز و سەیران و نزا و نوێژە بەبارانێشی لەسەر کراوە... ڕاستی وردە شوێنەوار و ئاسەوار لەم گوندەدا زۆرە و بوونەتە نیشانکرد بۆ جێگەکان و هتد... بۆ نمونە (کێلەسپی) بەردێکی گەورەی سپی باو بوو کەوتۆتە سەر ڕێگای بێستانسوور چەناخچیان بەو ناوەوە ناسراوە و ئەو زەویانەی ئەو ناوەش بەزەویەکانی کێلەسپی ناسراون، ئەمانەی سەرەوە لە بواری کەلەپور و مێژوو و شوێنەوار و ئاسەواردا لاپەڕەیەکی گەشی ئەم گوندە بوون.

د. باری کۆمەڵایەتی و نەریت و کەسایەتی(بێستان سوور)

١. خەڵکی ئەم گوندە لەسەرەتای دامەزراندنیەوە هەتا ئێستاش هەموو لە بنەماڵە کوردەوارییە جافیەکانی هۆزی (ئاڵی بەگی، بێستانسوری) کە هەموو ئەمانە لە بنەماڵە ڕەسەنەکانی باووباپیرانی خەڵکی شارەزووری مێژووین، داب و نەریتی کوردەواری لە ناوچەی شارەزوور پەیڕەو دەکەن، وەك ئاین مسوڵمان مەزهەبن پەیڕەوی

تەریقـەتی دەروێـشگەری (قـادری)دەکـەن، گفتوگـۆ و جـل و بـەرگ و دابونـەریتی خـەڵکی شـارەزوور پـەیڕەو دەکـرێ (٩٩٪)ی خـەڵکی ئـەم گونــدە بــە کــشتوکاڵ و ئاژەڵدارییــەوە خــەریکن و نزیکــەی (١٪)ی بەکاری فەرمانبـەری و دوکانـداری و ئاڵوویڵـەوە خـەریکن(١) (جێگـای نیشتەجێیان خانوبەرەی دەستوری دێهاتی شارەزوورییە و شێوازی کارکردن بەتاك و کۆمەڵە و لە خۆشی و ناخۆشیدا هەردەم هاوکاری یەکدەکەن گەورە و بچوك بەتەنگ یەکەوە دێن لە خۆشی و ناخۆشیدا گەرچی ساردییەکیش هەبووبێت لەنێوان دوو کەس یان دوو بنەماڵە و هۆزدا بەڵام کاتەکانی خۆشی و ناخۆشیدا ئەو ساردیی وەلانراوە و بەسەروماڵ هاوکاری یەکیان کردووە، لە ئاواییدا دەستەی پیاوماقوڵ و دەمــسپی و مامۆســتای ئــایینی و ڕاوێــژکار بــووە و بــۆ ســوڵح و هەڵــسوڕانی کاروبــار و پرســدا بەقــسەیان کــراوە(ڕیــش ســپی یــان دەمسپی ئاوایی) فرمانی بەجێی دابێ بەقسەیان کردووە و جێبەجێ کـراوە، هـەرگیز ئـەم گونـدە بـێ دەمـسپی و بەرپرسـیارنەبووە بـەڵام لەسـەر شێوەی عەشایەری و دەمسپێتی نـەك ئاغـایی، خـەڵکی گونـد لەگەڵ بەرپرس و دەمسپییەکەیان لە کاروباری گوندەکانی دەوروبـەردا لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشدارییان کردووە (ماڵـەوا) ی گاوانەکان بۆ کۆکردنەوەی نان کردویانە. (راتبەی فەقێ) فەقێکان نـان و چێشتیان کۆکردووەتـــەوە، کاسەدراوســـێ، شـــەومیوانی یـــەکتر، کۆمەکـــی ساوەرکوتان، گڵەبان و هتـد.. هـەروەها شـایی، شـین، سـوڵح هاوکـاری جــەژن و داب و نــەریت و کارەســات هەرچــۆن بۆخۆیــان بەتەنگــەوە هاتوون.

**٢. کەسایەتیە ناودارەکانی ئەم گوندە(پیاوان)**

**حاجی ئەمین:** ئەم پیاوە کەسێکی ناسراو و ناودار و ئاینپەروەر و نیشتمانپەروەر بووە، پیاوێکی چوارشانەی گەنم ڕەنگ بووە، ڕیشی هەبووە کەواو سەڵتەی لەبەرکردووە، خاوەنی لاودیوەخان و بەخشندە بووە، دەسەڵاتیشی هەبووە لەناو گەورەپیاوانی ناوچەکەدا و هەردەم لە ڕاوێژ و سوڵح و داخوازیدا خاوەنی قسەی ڕەواجدار بووە و بەقسەی کراوە ئەو پیاوە دامەزرێنەری گوندی بێستانسوور بووە و زۆر ئەمین و لەسەرخۆ بووە، گەرچی لەسەرەتاوە کێشەی هۆزایەتی پەیدابووە بەڵام بەحیکمەتی ئەو پیاوە لەوەدوا خەڵکی وەك یەك مستیلە وابوون لە پەنجەیەکدا، هەمیشە عەبای شاڵی سورمەی بەشانەوە بووە و گۆچانێکی پێ بووە و سوارچاکێکی ناودار و تفەنگ چییەکی چاکیش بووە، کاتێك کە عوسمانیەکان خەڵکیان ڕەشبگیر کردووە ئەو توانیویەتی لە ڕێگای بەرتیل و تەنانەت شەڕیشەوە زۆر کەس ڕزگار بکات، نامەشی ناردووە بۆ ئەستەمبوڵ، کە لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا خەڵکێکی گەورەی دەستڕۆیشتوو دۆست و ناسیاوی بووە و لەڕێگای نامە و ناسیاویەکەیەوە زۆر کەسی ڕزگارکردووە، مزگەوتی گەورەی بەناوبانگ کە باسمان کردووە ئەو دروستی کردووە و هەمیشە مەلای چاك و خزمەتگوزاری باشی تیابووە و پڕبووە لە فەقێ لە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی ئاینی، و هاوکاریش (٧٥٪)ەی خۆی بووە، ئەو پیاوە نەخوێندەوار بووە بەڵام زۆر زانا بووە.

(فقیٚ علی قاسم کریم): کەڵەپیاوێکی ناوداری گوند و ناوچەکە بووە سوور و چاوشین و بەهەیبەت بووە، چوارژنی بووە(دایە خاتون، پەری خان، مەنیج، پیرۆز) سەرەتا لە مزگەوتی حاجی ئەمینی مامی هەر لە بێستانسوور دەچێتە بەرخوێندن و پاشان بەهۆی پەیوەندی و تێکەڵییان لەگەڵ کاکە ئەحمەدی شێخ دەیبەنە سلێمانی لە مزگەوتی گەورە(مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ) خوێندنی فەقێیی تەواو دەکات بەهاوپۆلی(شێخ محمود حفید) هەر بەهۆی ئەم پەیوەندییەوە دەبنەدۆست و خۆشەویستی یەك لەگەڵ شێخ محمود حفید زۆر پەیوەندییان پتەو دەبێت پاشان دەگەڕێتەوە بێستانسوور و پاش وەفاتی حاجی ئەمینی مامی کاروباری گوند و عەشیرەت دەگرێتەئەستۆ و دەسەڵاتەکانی فراوان دەکات بەسەر ناوچەکەدا و گیانی پتەوی هاوکاری نێوان گوندەکان بەهێز دەکات و ڕۆڵێکی گرنگی دەبێت لەخزمەت و نانداني خەڵك و یارمەتی خەڵکی فەقیر و هەژاران و بێ دەرەتان. ئیشوکارە خێرخوازییەکانی شاهیدی ئەو کاتەن، بۆنمونە: ئێستا گۆڕستانێك هەیە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای بێستانسووری گەورە کە دەکاتە بەردەم باڵەخانەکەی (فەقیٚ علی) هیچ کەسێك لەو گۆڕانە ناسراو نین یان خەڵکی ناوچەکە نین، حاجی حمەئەمین قالە عاسیٚ لە تەمەنی(١٢٠)ساڵیدا ئەیگێڕایەوە ئەو خەڵکە لە سنورەکانەوە و لە ئێرانەوە ڕوویانکردۆتە بێستانسوور. (فقیٚ علی قاسم) هەمو ڕۆژیٚ چەند مەنجەڵێکی گەورەی پڕ لە خواردنی بۆ تێرکردنی ئەو لێقەوماوانە هەر بۆیە هەر بۆیە بەو هیلاکی و برسێتیە کە چەندین ڕۆژ هیچیان نەخواردبوو ڕیخۆڵەیان

وشك بووه وه كاتێك كه تێریان ئهخوارد ههر لهویٚ گیانیان ئهسپارد و ئێمــهش خــهڵكی گوندهكــه فریــای ئــهوه نهدهكــهوتین بیبــهین بــۆ گۆڕستانی دارهڕهش ههر لهبهردهم باڵهخانهكه بهخاكمان دهسپاردن.
وه فقیٚ علـی قـسهڕهوا و دهستڕشـتوو بـوو لـه كـاتی عـسمانیهكاندا كاتێك ڕشبگیری كورد دهكرا و عسمانیهكان دهیانبردن بۆ سهربازی كه بـه(ریفـی ریفـی) ناسـراوبوو لهناوچـهی دهسـهڵاتی (فقـیٚ علـی)دا ئـهو ڕهشبگیریه نهكراوه بـهڵكو بـهپاره دهفعـی كـردووه كاتێـك (١٧) پیـاوی نـاوداری ناوچـهكه بـهر ڕیفـی ریفـی دهكـهون (فقـیٚ علـی) لهدهسـتی سـوپای عـسمانی وهریاندهگرێتـهوه بهرامبـهر چـهند كیـسه لیرهیـهك، ههروهها (فقیٚ علی قاسم) ڕۆڵێكی گرنگـی هـهبووه لـه نزیككردنـهوهی سهرۆك عهشیرهتهكان و شێخ محمودی حفید زۆر جار پێكی گهیاندون و كێشهكانی چارهسهر كردوون و شێخ محمود زۆری خۆشویستووه و قـسهی نهشـكاندووه، هـهروهها (فقـیٚ علـی)بهخـشندهبووه كاتێـك (حاجی قادری وهیس) بۆ لهوهڕخۆری دێته سنوری فقیٚ علـی ئهویـش پێشوازی لێدهكات وه حاجی قادر كچێكی خۆی پێشكهش به كوڕی (فقیٚ علی) دهكات ئهویش پارچهیهك زهوی هدیه دهكات كه لهكۆتایـی ساڵی پهنجاكانـدا گونـدێكی لهسـهر بنیـات دهنێـن، بـهناوی ئـهو گـرده ئاساریهی كه لێوهی نزیكه (گردی كاژاو). وه فقیٚ علی قاسم خاوهنـی (٢٣٥٠)دۆنم زهوی موڵكــه ئێــستا بهدهســت وهرهســـهكانیهوهیه وه خاوهنی چوار ئاشـی ئـاو بووه، موڵـك و ههوارگـه و ڕهز و بـاخ و ئـاوی هـهبووه لـه پوشـێن بـۆ هاوینـان ژن و منداڵـهكانی دهنـارده ئـهویٚ لهبـهر مێـشووله و هـوڕهی شـارهزوور، بـهڵام لـهم دواییانـه عمـری فقـیٚ علـی

وەقفی مزگەوتی پوشێنی کردوه.

حمە سعید ڕەمەزان: پیاوێکی ڕەشتاڵەی ئازای بزێو بووە ڕوولەخوا و ئەهلی مزگەوت بووە هەمیشە حەزی بە بەخێوکردنی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ کردووە و تەبایی و یەکڕیزی گوندەکەی پاراستووە، ڕیش سپی و جێگای ڕاوێژبووە، هەندێ جار لەگەڵ بنەماڵەکەی بەدوای لەوەڕدا گەڕاوە و جافایەتی کردووە، لە بنەماڵەدا دەگەڕێتەوە سەر قەرەوەیس.

ئەوڕەحمانی برای ئەلی: پیاوێکی بالاّبەرز بووە، پرچ و ڕیشدار بووە و کەواو سەڵتەی لەبەرکردووە، ڕاوێژی شەرت وبڕی بەدەست ئەو بووە لە ئاواییدا، واتە بۆ گرتنی شوان و گاوان و ڕەنجبەر و... پیاوێکی مسوڵمان و لەخواترس بووە.



کەرەم وەیس: پیاوێکی ڕەقەکاری مامناوەندی گەنم ڕەنگ بووە نەخوێندەوار بووە.

عمر فقێ علی قاسم کریم: پیاوێکی بالاّ بەرز و سور و سپی جوان بووە، زۆر لەسەرخۆ و نیشتمان پەروەر و ئاین پەروەر بووە، زمانی عرەبی دەزانی لەدوای وەفاتی باوکی (فقێ علی) دەست

نیشان کرا وەك ڕیش سپی هۆزەکەی خوێندەوار بووە و سێ ژنی هێناوە زۆر سادە و لەسەرخۆ بووە، حەزی بە تەبایی و یەکڕیزی خەڵك دەکرد لەگەڵ منداڵاندا منداڵ بوو لەگەڵ گەورە گەورە بوو سەردانی ئەو منداڵانەی دەکرد کە تەواو بێکەس بوون بەتایبەتی لە جەژناندا، لاو دیوەخانی پڕبوو لە خەڵك هەرگیز نەیدەهێشت مزگەوت کەموکوڕی تێکەوێ چ لەڕوی خزمەت و چ لەڕوی فقێ و چ لەڕوی مەلا و خوێندن و جومعە و جەماعەتەوە، نوێژکەر و داوێن پاك بوو لە چلەی هاویندا بەڕۆژوو بوو هەمیشە چاوی لەبێ باوکان و بێ کەسان بوو خزمەت و هاوکاری دەکردن، پەیوەندی کۆمەڵایەتی فراوانی هەبوو پیاوێکی قسە خۆش و لەسەرخۆو نەرم و نیان بوو لەڕاوێژدا ئاین پەروەربوو زۆربەی کات شەڕواڵ و مرادخانی لەبەرئەکرد بەپێچەوانەی دەم سپی یەکانی ترەوە مشکی ئەڵوەنی و فەقیانەی دەبەست سەردەرچووبوو لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی میری هەتا لەبەغدادیش، کە شۆڕش بەرپابوو یەکەم کۆبونەوەی گەورە پیاوانی عشایر و خەڵکی تر لەدیوەخانی ئەودا کرا یەك لەشکر دابەزی بوو توانی بەمیواندارێکی بەڕێی بکات، وە بڕیاری شۆڕش لەوێ درا، بەڵام (کوێخا عمر) شۆڕەسوارێکی کوردایەتی و نەتەوایەتی بوو،چونکە زوو لاوانی گوندو ناوچەکەی ڕێکخست وچەکی کۆکردەوە خۆی بووبەڕابەرسیاسی لەسەرەتای شۆڕشدا و سەنگەری لەپێشەوە لە دەربەندی پشتی دەربەندیخان گرت، دەتوانرێ بوترێت خەڵکانی تر واتە دەم سپی یەکانی تر پشتیان بەردا، بەڵام وازی لە شۆڕش نەهێناو دوای شکانی هێزەکە لەگەڵ چەند هاوەڵێکی دا

بنکەی (وێڵەکەیان) دامەزراند، بەردەوام بوو لە شۆڕش هەتا توشی نەخۆشی بوو بەسەردا کۆچی دوایی کرد، لەبیرمە خۆم گوێم لێ بوو ئەیفەرموو ئەم شۆڕشە ئەگەر توشی دوبەرەکی نەیەت ئەوا ئەمجارە کورد شتێك بە شتێك دەکات، بەڵام دوای کۆچی دوایی ئەو خەوە ترسناکەکەی هاتەدی شۆڕش توشی دوبەرەکی بوو، بەخۆمی ووت بەپێکەنینەوە فەرموی ئەگەر چویتە (بەغداد) بۆ خوێندن و پرسیان کورد چی هونەرێکی هەیە؟ بڵێ لەژێر بەردی ڕەق نان دەردێنێت، گەر ووتیان مانای چی یە؟ بڵێ هونەری ئاش دروست کردن هونەرێکی دێرینی کوردە کەلەم دوایانە گەلان لەڕێی ئامێری نوێیەوە بۆ هاڕین پەیان پێ بردووە، بەهەرحاڵ پیاویکی مەزن و لەسەرخۆو خۆڕاگر بوو.... پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ (ملیك) و پاشان (عبدالکریم قاسسم) هەبوو وە لەگەڵ تیرەکانی ناوچەکە تەبابوو وەچەندین سوڵح و کێشەی چارەسەر کردووە بۆیەکەم جار کە (توتن و پەموو) لە شارەزوور کرا لەسەردەستی ئەم چەندین ماڵی کۆیی هێنا لەگەڵ (ئیبراهیم ئەحمەد و عمر دەبابە) دۆستایەتی نزیکیان هەبوو، ماڵەکان لە بێستان سوور دەستیان کرد بە چاندنی توتن و لۆکە.



**کوێخا عومەر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لە بنکەی وێلەکە**

بچوك(بێستان سووری کۆن) لە ساڵی (١٩٥١) بەرەوژور وە لە زەوی خۆیدا جێگای خانوی داپێیان نیشتەجێ بوون.

هەر کێشەیەك دەستی تەماعکار ڕوبکاتە ناوچەکەی و بێستان سوور ئەم پارێزگاری لێکردووە بۆیە کۆمەڵێك تەماعکار چاو دەبڕنە بێستان سوور کێشەو نیزاع دروست دەبێت (کوێخا عمر) ڕێگە نادات دەست درێژی بکەنە سەر بێستان سوور پاشان (یاسا) تەداخول دەکات(حاکم) ی سلێمانی دێت لەگەڵ ئیدارەی ناوچەکە، چلەی هاوین دەبێت دەچنە سەرزەویەکەی هەردولا (کوێخا عومەر) بەڕۆژو دەبێت مشکیەکەی تەڕدەکات دەیدا بەسەریدا، (حاکم) ڕوئەکاتە جەماعەتی تەماعکار پێیان ئەڵێ بەڵگەتان چییە؟.. ئەم زەوییە هی

ئێوەیە، ئەوانیش کەسێکیان بە پارە هێناوە کە سوێند بخوات ئەم زەوییە هی ئەوان بووە، ئەویش ڕووئەکاتە حاکم دەڵێ: جەنابی حاکم سوێند بێ بە قورئان ئەم خاکە لە ژێر پێمدایە خاکی بەرزنجەیە تەسەڕوفی ئەوانە، کوێخا عومەر ئەڵێ: جەنابی حاکم با پێڵاوەکانی داکەنێ، کاتێك پێڵاوەکانی دائەکەنێ خۆڵی بەرزنجەی کردۆتە ناو پێڵاوەکانی سوێندی لەسەر خواردووە، حاکم هاوار ئەکات ئیمان ڕۆ، زەویەکەش ناو دەنێ (ئیمان ڕۆ) هەتا ئێستاش هەر ئیمان ڕۆیە. ئاغاواتەکانی ئەو سەردەمە نەیانئەهێشت قوتابخانە بچێتە گوندەکانیان، بەڵام ئەم ئاغا نەبوو دەمسپیی عەشیرەت بوو، خۆی یەخەی میری ئەگرت هەتا قوتابخانەی هێنایە گوندەکەوە سالی (١٩٥٣. ١٩٥٤) قوتابخانەی کوڕانی کردەوە وە لە سالی (١٩٥٦. ١٩٥٧) قوتابخانەی کچانی کردەوە لە بێستان سوور وە خانوویەکی خۆی بۆ دابین کرد، کچەکانی خۆی نایەبەر خوێندن تا خەڵکی گوندەکە کچەکانیان بنێرن، وە خاوەنی سێ ئاشی ئاو بووە لەو سەردەمە ئیشوکاری خەڵکی ناوچەی شارەزوور و قەرەداغ و شارباژێڕی بەڕێکردووە، وە سێ ژنی هێناوە (فهیمە، خجێ شێخ بووە، بەهیە).

ئەبوبەکر عمر فقێ علی قاسم: سالی (١٩٤٩) لە گوندی بێستان سوور لە دایك بووە، خوێندنی ناوەندی تەواو کردووە، دوای وەفاتی باوکی (کوێخا عومەر) لەبەر لێهاتووی و زیرەکی هەڵبژێرا بە ڕیشسپی گوند و عەشیرەتی (عێڵ بەگی جاف) کەسایەتییەکی هەڵکەوت و نیشتمانپەروەر بوو، هەمیشە ماڵەکەی لە خزمەتی

شۆڕش و هەژاران و لێقەوماوان بوو، زۆر بە حیلم و لەسەرخۆ و زۆر لێزان بوو، بە سەلیقە بوو هەمیشە کارەکانی بە مشاوەرە لەگەڵ ڕیش سپیان جیٚ بەجیٚ دەکرد، وە زمانی (عەرەبی و فارسی بەباشی دەزانی)، وە تێگەیشتن و خوێندنەوە و قسەکردنی بە زمانی ئینگلیزی باش بوو، وە زۆر شارەزا بوو لە مێژوو، زانستی پاراسایکۆلۆژی، پزیشکی روەکی، العیلم الروحانی، شوێنەوار ناسی، جوگرافیا، وە چەند کتێبی دەست نووسی هەیە تا ئێستا چاپ نەکراوە لەوانە (قسەی خۆش، شعر، وە لە شەستەکان تا دووهەزار و سێ). پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو هەمیشە خەمی (وولات و نەتەوەکەی) لە کۆڵ بوو کاتێك ڕژێم نزیکەی (٧٠) ماڵی لە خانەقین ڕاگوێزایە دەشتی باریکە - عەربەت کە هیچ پێویستیەکی سەرەتایی ژیانی بۆ دابین نە کردبوون، (ئەبوبەکر) هەستی نەتەوایەتی وایلێکرد، فەرمووی ئەگەر ژیانم دانابێ نایەڵم لەژێر کەپر و خێمە بن لەو دەشتەدا، هێنانیە بێستان سوور لەناو خۆیاندا جێگەی کردنەوە، لە موددەی ئەو ساڵانەی کە ڕژێمی بەعس دەستی کرد بە ڕاگواستنی گوند و شارۆچکەکانی سنوری کوردستان، ( ابوبکر) جێگەی (٥٠٠) ماڵی شلێر، پێنجوێن، هەڵەبجە، تەپە ڕەش و گردەنازێی کردەوە، زەوی دانیٚ کەسابەتی تیا بکەن وە شوێنە (سەخەریەکانی) بە خۆڕایی داپێیان بەردی بینایان لێدەردەهێنا و دەیان فرۆشت، وە یەکێك بوو لەو کەسایەتیانەی ناو جاف و سنورەکە کە سەری بۆ جاش دانەنەواند، تەنەزولی بۆ نەکردن، مەوقیفی خۆی پاراست، وە زۆر هاوکاری هەژاران و لێقەوماوانی ئەکرد، وە لە گرانیە شومەگەی

(سـالأنی نـەوەدەکان) کـە بەسـەر گەلەکەمانـدا هـات هەڵوێـستی خێرخـوازی و لـەخۆ بوردویـی و جوامێـری هـەبوو، ئەیفـەرموو ئەمـە ڕۆژێکـی ڕەشـە بەسـەر گەلەکەمانـدا هـاتووە ئـازا ئـەو کەسـەیە کـە یارمـەتی هـەژارێك بـدا، ئەمـە تـاقی کردنـەوەی (خودایـە) بـە بـراو کوڕەکانی ئەفەرموو هەتا ئەتوانن یارمەتی فەقیر و هەژار بدەن ساڵانە چەند فەردە گەنمی هەبوو جگە لە هەندێ پێویستیاتی لێ هەڵئەگرت پاشان دابەشی ئەکرد بەسەر خەڵکی هـەژار و کـەم دەرامەتدا،هەروەها کارەبای هێنایە گوندەکە، وە زۆر هاوکاری بواری خوێندنی ئەکرد، تا سێی ناوەندی لەگوندی بێستان سوور کردەوە وە بینای خوێندنی لەسـەر حـسابی خـۆی تـەعمیر کـرد، وە هـەوڵی کردنـەوەی قوتابخانەیەکی نوێی دا و (١٠٠٠٠م) زەوی خۆی دابین کرد بۆ ئەو خوێندنگە نوێ یە، وەپاش خۆی خوێندنگەی (١٨) پۆلی نوێ لەسەر زەویەکـە کرایـەوە، وە پـاش تـەواوبوونی وەزارەتـی پـەروەردە وەك ڕێزێك بۆ هـەوڵ و تێکۆشـانی بـۆ پێش کـەوتنی بـواری خوێنـدن لـە ناوچـەکە، خوێندنگـە (١٨) پۆلیەکـەی ناونـا بـەناوی (ئامادەیـی ابوبکری کوێخا عمر) جگە لـە بـواری خوێنـدن هاوکاری و یارمەتـی مزگەوتی زۆر ئەکرد، وە زۆر دەوری هەبوو لە چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان لە ناوچەی گەرمیان و شارەزوور و پێنجوێن، وە لـە سـاڵی (١٩٩٦) لـە لایـەن ڕیـش سـپی و پیاومـاقوڵانی هـەموو بنەماڵـەکانی (عێڵ بـەگی جـاف) هەڵبژێررایـەوە بـە سـەرۆکی گـشتی عەشـیرەتی عێـڵ بـەگی جـاف، پیـاوێکی خـەمخۆر و لـە خۆبـرد و نیشتمان پـەروەر بـوو، بەداخـەوە لـە (٩/٢/٢٠٠٨) لـە تەمـەنی (٥٨)

ساڵی وەفاتی کرد، وە پاش خۆی لە لایەن ڕیش سپی عەشیرەتی عێڵ بەگی جاف (اسکندر ابوبکر عمر) یان هەڵبژارد وەك ڕیش سپی عەشیرەت.

### بەهاری ئەم ساڵ

**ابوبکر عمر فقێ علی**

بەهاری ئەم ساڵ نیوەی زستانە
عالەم گیرۆدەی تەرزە و بارانە
زەوی شەقدارە و زەردەی لافاوەن
گولاڵە سووران لە ژێر قوڕاوەن
بە پەردەی قوڕاو گشت داپۆشراوەن
وا هاوار ئەکا ئەو پەردە لاوەن
سەوزەی دەغڵ و دان گشتی کەوتوەن
سەوزەکەی بەختمیش تێکەڵاوبوەن
ئابەو زستانەی پڕ بارانی پار
تا بن چەقیوە جەستەکەی زامار
دەرچونی نیە ئالەو قوڕاوە
تا هاوین نەیە هێزی نەماوە
شیفاکەی زستان بە دەستی یارەن
ئەگەر مەیلی بێ زستان بەهارەن



لێرەدا وەك هەموو شاعیرانی تر بەهار بە نیسبەت شاعیرەوە واتە گەشانەوە و پێشکەوتن و جێگیر بوونی دەسەلاَت و پێشکەوتنی وولاَت، بەهاری ئەم ساڵ مەبەست کاریگەری توانەوەی شۆڕشی ساڵی (١٩٧٤) و داپۆشینی خەم و خەفەت و بێئومێدی بەسەر کوردانی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر هەبوونی تەرزە و بارانی بە دەستێکی سەرەتایەکی ناخۆشی بیردەکات ئەو خوێنە گەش و پاکەی شەهیدی ڕێگای ڕزگاری کوردستان کە ڕژاوەتە سەر خاکی کوردستان، بەلاَم ئێستا شتی پیس بەسەریدا دەڕوات و لەژێر زەحمەتی پۆستاڵی ڕژێمی دوژمن بە گەلی کوردمانە، بەلاَم لە هەمان کاتدا مژدەی سەدایەك، دەنگێك وە بانگەوازێك دەدات بە خەڵکی، سەدای بانگەواز بۆ لادانی پەردە لەسەر زۆرداری و دەڵێت هەموومان یەك چارەنوسین بۆ مردن و ژیان پێکەوەبوون لە هەمان کاتدا ئومێد بەخشە بە هاتنی زلهێزێك کە هێزی لەسەروی هێزی ئەم زۆردارەوە بێت، ئەویش هاتنی هاوینە بەرانبەری ئەو زستانە و بەهەمان شێوە دەڵێت ئەو زلهێزەی کە یارمەتی دەری ئێمەیە دەتوانی زستانی زۆرداری بڕەوێنێتەوە، هەر ئەویش ئەتوانێت زستانمان بۆ بکاتە بەهار. ...

سەیرکە چی سەیرکە سەیری پێشکەوتنەکەت
سەیری جگەر بڕاوی دڵی پڕ خوێنینەکەت
سەیری ئەژنۆی شکاو و لاشە نەخۆشینەکەت
سەیری بەلاَی لابەلای سەر خاکە زێڕینەکەت

**ســــــــــەیری لاشەیەکی ساغ ساغی پۆلاینەکەت**

**بە دەستی ڕەش ئەو لاشە کرا بە جێی شینەکەت**

**لاشەیەك بوو بە جێگای شین و زووخاو زەحمەت**

**هەر ئەو شـــین و زووخاوە ملت ئەباتە ژێری پەت**

**ڕێگای ڕاســــــتی گومکرا نادۆزرێتەوە زەحمەت**

**وەختێك ئـــــەدۆزرێتەوە ئیتر ئەخورێ لە مشقەت**

**چەند خۆشە ئەو دەورە وا هــەمووی پاڵ ئەداتەوە**

**لافاوی ڕاستی بەجـــاری ئەو حوکمە دەشواتەوە**

**دەس لەمـــــلان دەبێ تـــــــــــازە بانادا تەوە**

**چونکە دەوری بینیوە خــــــۆی فیکر دەکاتەوە**

**ئەو تــــەوق پۆلا زلەی وا لە ملی مـــــــن و تۆ**

**ئاگری ڕاســـــــــتی بەجارێ هەمووی ئەتاوێنێتۆ**

**ابوبكر عمر فقێ علی**

**لێرەدا شاعیر بە پێچەوانەی خـەڵکانی ڕوکەشـەوە واتـە ئەوانـەی تەنها ڕوکاری دەرەوەی شتەکان دەبینن، شاعیر گەشبین نیـە بەرامبـەر بە سیاسەتی ڕژێم بەرامبەر بە گەلی کورد بەو سیاسەتەی کە گورگ لـە پێستی مەڕدایە بانگەشەی پێشکەوتن و نەهێشتنی نەخوێنـدەواری و هەژاری دەکات، بـەڵام ناوەڕۆکەکـەی لـەناوبردن و قڕکردنـە ئەمـەش لـە پێنـاوی سـڕینەوەی کـورد زمـان دزینـی خـاك و وڵاتەکـەمان چـەند بـە پیت و بەرەکەتە و هەموو جۆرە سەرچاوەیەکی کانزایی و کشتوکاڵی**

یه ئەمە جگە لە پیت و بەرەکەتی خاکەکەی، لە هەمان کاتدا شاعیر زۆر گەشبینە بە داهاتووی وولاتەکەی بەوەی کەلافاوی ئەو زۆرداریە رادەماڵێت و گەلی کوردمان دەبێتە خاوەنی وولاتی خۆی.

حەمە وەروەر: ئەم پیاوە زۆر ئازا و چاو نەترس و چاپوك بووە، خاوەنی دەست و تفەنگی خۆی بووە، کە زوڵم و زۆری تورکەکان گەیشتۆتە ئەوەی تالان و برۆ و رەشبگیر و سەرانە، ئەم لاوە بەجەرگە لەگەڵ لاوان و هۆزی گوندەکەدا بەسەرپەرشتی پەلاماری جەندرمەیان داوە و برایەکیشی بەناوی (حسن وەروەر) برینـدار بووە، کوشتار و زیانی چاکیان لە جەندرمەکان داوە و بـبڕای بـبڕ، نـەك لـە هـۆز و گوندەکە بەڵکو دەوروبەریش لەو رەفتارە نالەبارانەی تورك رزگاری بووە و بەوە نازناوی (وەروەر)[١٧] کە ئەوکاتە بە دەمانچەش ووتراوە وەروەر، نازانم عربی یان تورکی یە، تا ئیستاش بنەماڵەی ئەو پیاوە بەو ناوەوە ناسراون، ئەو پیاوە هەردەم خۆشەویستی ریش سپی و پیاوماقوڵان بووە، چوارشانەیەکی کورتە بالای گەنم رنگ بووە.

قالەی زڵێخا:. ناسراو بە (کوتەك سور) ئەم پیاوە پیاوێکی زۆر چاو نەترس بووە، سڵی لە دێو نەکردووە کەمێك خوێندەوار بووە لە هۆزی حمە سعیدی رەمەزان بووە، لە بنەچەدا باو باپیری لە چوارتاق تا عەربەت دانیشتون، چوارشانەیەکی سورکار بووە، رانك و چۆغە و مشکی ئەڵوەن و فەقیانەی کەتانی بەستوە و پۆشیوە، تفەنگچی چاك بووە، یەك لە پیاوانی راوێـژکاری گوندەکە بووە، ئەرکی سەرشانی پەروەردە و (تەمێ و تەزکی یە) ی ئافرەتان بووە چی لەکاتی هەڵسان و دانیشتن و چون بۆ شین و شایی و کاروئیش و ناو ران و ئاو هێنان

و میوانداری و هەندێ مەسەلەی شوکردن و هتد...، ئەو پیاوە هەرلە ئافرەتانی دەم سپیی ئاوایی یەوە بگرە هەتا دوامالّی توانیویەتی دەسەلاّتی خۆی بۆ پەروەردە و هەلّسوکەوتی چاکەی ئافرەت بەرکەمالّ بێ، بۆیە بە کوتەك سور ناسراوە، چونکە کوتەکێکی پێبوە هەمیشە گرتویەتیە خەنە و لە داری بلاّلوك بووە، ژنانی بەو کوتەکە ترساندووە ئەگەر لامجومی بکەن، هیچ ئافرەتێك نە لە قسەی دەرچووە نە توانیویەتی لامجومی بکات، بۆ نمونە دەلّێن جارێك ئافرەتێکی بنەمالّەی دەم سپی یەکان کونەیەك ئاو بە کۆلّیەوە بووە بنێشت لە دەمیدا بووە و کونە ئاوەکە کونێکی تێدا بووە، کە پێی دەلّێن پشك کە پشکی کونەکە بەربووە، ئاو بەلەشی ئافرەتەکەدا هاتۆتە خوار و جلەکانی نوساوە بە لەشی یەوە، بە شپرزەیی بێ ئەوە گوێ بداتە ئەوەی بگەڕێتەوە سەر ئاو و خۆی چاك کات کونەکەش چاك کات، هەر بەو حالّەوە دەدات بە بەردەمی خەلّکەکەدا کە لای مزگەوتەوە وەستاون و خەلّکی (لایە) بێگانەشیان تێدا دەبێ، قالەی زلّێخاش هەلّدەگرێتە کوتەکەکەی و کە ژن دەگاتە مالّ و کونە دادەنێ بێ پرس وڕا دەکەوێتە لێدانی، ژنە هەرچی هاوار دەکات کەس ناچێت بە دەنگی یەوە ڕیش سپی زیاتر پشت گیری قالە دەکەن، هەتا جارێکی تر ئافرەتێکی تر بزانێ چۆن هەلّدەسێ و دادەنیشێ. ..
دیارە لە لایەکەوە ئەمە زولّمە لە ئافرەت، بەلاّم لە چەند لایەکەوە پەروەردەشە، ئەمەش نمونەی برایی و تەبایی و بەرپرسی یەك لە ڕاوێژی ئەم گوندەدا. .

حاجی حەمە امین قالە عاسێ: ئەم پیاوە، پیاوێکی ئاینی و سورکارێکی چوارشانەی پڕ بوو، خاوەنی ڕیش و پرچ بوو، فیشەکی هەڵدەبەستەوە لەو باروتەی کە خۆی دروستی دەکرد، باروتەکە لە میزی ئاژەڵ کە دەبوو بە پرکە قارچك، ڕاوچی یەکی زۆر بەتوانا و دەست ڕاست بوو، جلی شەرواڵ و مرادخانی لەبەر دەکرد، زۆر قسە خۆش بوو لەگەڵ گەورە و بچوکدا ڕوو خۆش بوو، نەخوێندەوار بوو بەتوانا و خۆ ڕاگر بوو، کاری ئەم پیاوە هەڵسوڕانی کاروباری مزگەوت بوو، بۆ گرتنی مجەور هەتا دۆزینەوەی مەلا، دار هێنان بۆ مزگەوت و پاراستنی مزگەوت و هتد. .، کارە سەرەکیەکەشی ئەوەبوە کە مەسەلەی مردوو و تازێتی قەبر و قەبران، هەر خۆی قەبری هەڵدەکەند وە خۆی کفنی بۆ پیاوان دەکرد، هەندێ جار خۆشی دەستی بۆ کاروباری حەوت شەو حەوت ڕۆژ تازێتی و پرسە بەسەر و کاری میوان و نان و چاو ئاو هتد. .، ڕادەوەستا و سەرپەرشتی دەکرد، ئەوە کارەکانی ئەو بوو، کەس لە قسەی دەرنەدەچوو، ئەویش بەبێ بەرامبەر ئەو کارانەی ئەنجام دەدا، وە یەکێك بوو لە ڕاوێژکارانی گوندەکە.

شیخ حسین شیخ رحیم: ئەم زاتە هەر ئەوەندە نییە کە لێرەدا بەچەند دێڕێك باسی بکەین، بۆیە نەمانتوانی تەنها ئەمەندە نەبێ بڵێین یەکێك بووە لە عالم و کەسایەتییە ڕاوێژکار و پیرۆزەکانی ئەم گوندە، خەڵکی گوند (منداڵان) ی فێری خوێندەواری کردووە بەبێ بەرامبەر، بۆ درێژەی باسی مێژوویی ئەم کەسایەتییە مەزنە، سەیری گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ژ٤٠ - ل٢٠ بکەن (لە یادی ناو دارانەوە) لە نوسینی بەندە.

مەلا قادری سۆفی[١٨]: ئەم پیاوەش یەکێك لە زانا ناودارەکانی مێژووی ئەم گوندە و خاوەنی فتوا و مدرسی مزگەوتی حاجی ئەمین بووە، ئەگەر مردن رێگەمان لێنەگریێ و بەڵگەمان دەست کەویێ باسێکی تایبەتی ژیانی دەکەین، بەڵام لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێن کە ئەم پیاوە گەورە پیاو و زانایەکی ئەم گوندە بووە، لە هۆزی شوانکارە بووە، لە باوکەوە سەر بە (تەریقەتی نەقشبەندی) بووە. نووسەر بە رەچەڵەك دەگەڕێتەوە بۆ ئەم کەسایەتیە لە دایکەوە.

علی صالح: ئەم پیاوە لە باوکەوە مکایەلی بووە، لە دایکەوە کەماڵەیی بووە، پیاوێکی ڕەقەکاری سور و سپی بالاّ بەرز بووە، کەواو سەڵتەی لەبەر کردووە، دەم سپی گوندی بێستان سوری بچوك کەبە (بێستان سورە کۆن) یان ئەو دیو ناو دەبرا، ئەو پیاوەش یەکێك لە پیاو ماقوڵان و ڕاوێژکاران بووە.

### ئافرەتە ناودارەکان

دایە خاتوون: ئەم ژنە ئافرەتێکی ئەسمەری مامناوەندی بووە، قژ لول قسە خۆش و کردەوەی پیاوانە بووە، خاوەنی لاو دیوەخان بووە، ژنی فقیێ علی بووە، زۆرجار ئەو ژنە جلی پیاوانی لەبەر کردووە و لە دیوەخانی پیاواندا ڕاوێژی کردووە.

فەیمەی حاجی قادری وەیس: ئەم ژنە لە بنەماڵەی هۆزی ڕۆغزایی خێڵی حاجی قادر وەیسی پیاو ماقوڵی جاف بووە، ئافرەتێکی بالاّ بەرز و پرچ شۆڕ سور و سپی و زۆر خاکی وەك ژنە هەژارێك مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا کردووە، پیاوانە و ئاین پەروەر قسە

خۆش و لەفز شیرین خاوەنی لاو دیوەخان، ئەو ژنە خێزانی عمری فقێ علی بووە کە باسمان کردووە، وەك لەسەرەوە ووتومانە لە ڕاگوێزانەکەی بەعسدا بە مەرگێکی کتوپڕ کۆچی دوایی کرد، چونکە وتبوی ئەم خاکە بەجێ ناهێڵم، زۆر ئازا و کورد پەروەر بوو، لە پێناو تەبایی و یەکبوونی خەڵکی ئاوایدا هەمیشە دەهات بەسەر کوڕەکانیدا، چونکە دوای کۆچی دوایی کاك عمر ئەو ژنە جێگای گرتبۆوە، هەتا ابوبکری کوڕی دەستی داری گرت.

دایکە مریم: ئەم ژنە ئافرەتێکی زاهید و ئاینی و خوێندەوار بوو لە بنەماڵی شێخ کەریمی کەس نەزان بوو، ژنی شێخ حسین شێخ ڕەحیم بووە کە باسمان کردووە، ئەو ژنە قوتابخانەی ئاینی بۆ مندالانی گوندەکە کردبۆوە و بەخۆڕایی پێی دەخوێندن، هەمیشە بەڕۆژوو بوو، نوێژ و قورئان خوێندن و تەسبیحات لەسەر دەمی بوو، ناوی مریم کچی شێخ محمدی شێخ علی کەس نەزانی یە، لە ناو خەڵکیدا لەبەر پیرۆزی بە دایکە مریم ناو دەبرا لای گەورە و بچوك، بەش بە حاڵی خۆم بە منداڵی پێش چوونم بۆ قوتابخانە لە حوجرەی ئەو لەگەڵ خاتوو (حەبسەی کچی) دا خوێندومە، دوای کۆچی دوایی باوکە (شێخ حسین) ئەو ژنە دەستی گرت بەسەر حوجرەکەدا و نەیهێشتووە بفەوتێ و خوێندن تێیدا بکوژێتەوە هەتا (شێخ ڕەحیمی کوڕی) کە بە کاکە ڕەحیم ناسرابوو، دەستی داری گرتووە و کاروباری حوجرەی گرتۆتە دەست، ئێستا ئەو زاتە لە سیدصادقە و بە کاری ئاینی و مزگەوتەوە خەریکە... (دایکە مریم) کچێکی زۆر جوانی ئاینپەروەر و خوێندەواری هەبوە ناوی (خاتوو خەجێ) بووە

(خەجیجە حسین) ناسراو بە (خاتوو خەجێ) ئەو کچە دوایی دەبێتە خێزانی (عمری فقێ علی) و کچی مامە عمریش دەبێتە مارەبڕی (شێخ ڕەحیم) ی کوڕی دایکە مریم، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێکی چینایەتی ئەو ژن و ژنخوازیە هەڵدەوەشێتەوە.

ئامینە حسین: ناسراو بە (ئامەی وردە) یان (ئامەی فرج ئەسلان) ئەم ژنە ئافرەتێکی ئەسمەری توند و تۆڵ و پرچ شۆڕ بووە، لە بنەچەدا عەربەتی بووە، دوای ژن و ژنخوازی تێکەڵ بە بنەماڵەی (وەروەر) ی یەکان کەلەسەرەوە باسمان کردن بووە و ئافرەتێکی دەوڵەمەند و کشتوکاڵ دار و ئاژەڵدار و خاوەن ئەسپ، چەندین ماڵ بۆ کاری شوانی و ڕەنجبەری ئەوان لە ماڵیدا بووە و بەخێوی کردوون، خاوەنی لاو دیوەخان و نان بدە بووە، بەڕۆژ خەریکی ئاژەڵداری و بەروبومی ئاژەڵ بووە، بەشەو جلی پیاوانی لەبەر کردوە و تفەنگی هەڵگرتووە.

فاتمەی زلێخا: ناسراوە بە (نەنکە) ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی سپی کەلانەی ورد و بچکۆلانە بووە، پرچ شۆڕ و هەمیشە پاك و تەمیز، لە ساڵدا بەلای کەمەوە دە مانگ بەڕۆژوو بووە، نەخوێندەوار بووە، خوشکی قادری کوتەك سور بووە، کە لە سەرەوە باسمان کرد، لە بنەچەدا خەڵکی چوارتاق بووە و بە ژن و ژنخوازی کەوتۆتە ناو هۆزی حەمە سعیدی رمەزان، بەڕاستی زاهیدی ئەو ژنە گەیشتۆتە ئەوەی کە خەڵکی گەورە و بچوك شەرمیان لێ کردووە، منداڵیان بۆ پیرۆزی بردۆتەلا.

مەنیجەی محمد: ناسراو بە نەنکە مەجە، ئەم ژنە ڕەقەکارێکی بالاّ ناوەندی پرچ شۆڕ بووە، مەیلەو سور و سپی و دەنگ خۆش، بەسەر مردوودا بەیت و شانامەی ووتوە خەڵکی وسکوت بوون، تەون کارێکی بەناوبانگ بووە و حەکیمی میللی منداڵان بووە بۆ کۆکە و شکان و بڕین وئازاری سك و گەڵێ نەخۆشی و مامانی هەردوو گوندی بێستان سور بووە، لەبنەچەدا لە هۆزی شێخ سمایلی یەو خەڵکی گوندی هەنجیرەی شارەزوور بووە، لە ڕێگای ژن و ژنخوازی یەوە تێکەڵ بە بنەماڵەی حاجی ئەمین بووە و بۆتە خێزانی فقێ علی کە باسمان کردوە، ئافرەتێکی ئاین پەروەر بووە و مریدی شێخ حسین شێخ ڕەحیم بووە.

زلێخای محمد: ناسراو بە زخەی حمەی خالاّن، ئەم ئافرەتە کورتەبالاّیەکی پرچ شۆڕی ئەسمەر بووە، دەنگ گڕ و دەنگ خۆش بووە بۆ لاوانەوە، خێزانی یەکێك لە پیاوانی بنەماڵەی (وەروەر) یەکان بووە(ئەحمەد محمد) ناسراو بە (ئەحە وەروەر) برای حمە وەروەر کە باسمان کردووە، (مامی نووسەری ئەم چەند دێڕە)، ئەم ژنە هەمیشە لەبەر خۆش حاڵی لاوانی گوندەکە بە کوڕ و کچەوە پێخەسوی هەموو بوك گواستنەوەیەك ئەمە جگە لە مەراسیمی خەنە بەندان و سەرپەرشتی کردنی چێشتی شایی و جەژن، ئافرەتێکی زۆر ئاینی بووە.

خەجیجەی مارف: ناسراو بە خەجێی مارف خەمە،(دایکی بەندە، نووسەر) ئەم ئافرەتە ئافرەتێکی سپی باو بوو، بچکۆلانە و ئاینپەروەر و نیشتمانپەروەر و زانستپەروەریش بووە، چونکە هەر

ئەو بووە کە نەخوێندەوارێکی گوندنشین زۆر هەوڵی داوە منداڵەکانی بخوێنن و شۆڕشگێڕبن بەڵگەش هەیە ئەو ژنە ژنی یەکێك لە بنەماڵەکانی (وەروەر) ییەکان بووە، هەر بەسەرەتای گەنجی هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات ئیتر وەك پیاو دەست دەگرێ بەسەر ئیش و کاری ماڵ و پیاوانە دەست دەگرێ بەسەر منداڵەکانیدا هەتا دەستیان دار دەگرێ و دەیانخاتە بەر خوێندن و فێری بارودۆخی خەباتیان دەکات و ئەوە بەیادی منداڵەکانی دێنێتەوە کە باو و باپیرانیان چۆن بەرهەڵستی مشەخۆرەکانیان کردووە و نازناویان وەرگرتووە، زۆر لەخۆبوردوانە و فیداکارانە دان بەخۆدا دەگرێ بە هەموو کوێرەوەریەکی ژیان ڕازی دەبێ بۆ فیداکاری و پەروەردەی منداڵەکانی، وێڕای ئەوەی کە برایەکی بووە بەناوی (صالح مارف) ناسراو بە (حمە صالح لولی) کە یەکێك بووە لە خێر خوایانی دەوری خۆی و لە کاروباری جوت و عاسەلای کێڵاندا دەستی باش بووە لە ڕێك و پێك کردن و نەوازی عاسەلاندا، نیمچە خوێندەوار بووە و شانامە و هۆنراوەکانی ئەو سەردەمەی لەبەر بووە، جا نازانم خۆی شعری وتووە یان نا، بەڵام ناوناوی (لولی) بووە لە لۆلۆی شارەزوورەوە وەرگیراوە، بە کارەساتی یەکەم سەیارە کە لە سلێمانی بووە کۆچی دوایی کردووە، ئەو ژنە بەستەزمانە تاقە براکەشی بەلاوی دەمرێ و قەلەندەر دەمێنێ، لاوانەوەی شەوی گوێ ئاگردانی هۆکاری سەرەکی منداڵەکانین بۆ وێژە و ئەدەب، ئەو ژنە کچی مارف خەمە بووە، ئەو نازناوەی (خەمە) لەوەوە هاتووە کەلە گرانی گەورەدا ئەو پیاوە کشتوکاڵدار بووە هەتا دوا کیلۆ بەروبومی

کشتوکاڵی و هەتا دوا سەر ئاژەڵ لەگەڵ دەوروبەرە هەژارەکەیدا بەشی کردووە هەتا ژیان گۆڕاوە ئیتر خەڵکی ناویان ناوە مارفە خەمە، ئەم ڕاستیانەم لە پیرەکانی ئەو سەردەمەوە دەبیست لەوانە حاجی قادری باریکەی هەمووجارێك دەیووتەوە، خۆم ئاگام لێ بووە (مامە عمری فقێ علی) جەژن هاتووە بۆلای (خەجیجەی مارف خەمە) زۆر سوپاس گوزاری بۆ دەربڕیوە بۆ ئەو هەموو فیداکاری و خۆڕاگری یەو دەیووت خۆیشە خەجێ خۆ پیاو ناوێرێ بڵێ ئێوە پێویستان بەچی یە چونکە نەفست ڕێگەت نادات چاوت لەدەست کەسەوە بێ، بەلام من دەڵێم تۆ لە قەلەکان و ڕۆنە بەیسەکەت بەشی ئێمە بدە، بەلام بە پارەی نرخی لەخۆی گرانتر چونکە نەك منداڵەکان هێشتا هەتیوبن، ئەم قسانەی بە پێکەنین و بۆ دڵدانەوە دەکرد، ئەمانە بەڵگەی ئەو لەخۆبوردوی و بەکەرامەتی یەی ئەو ژنە بوون، ئەو ژنە دەستی حەکیمی میللی منداڵانیشی هەبووە و هەروەها بڕینی جلی منداڵان خۆم زۆرجارم ئەو کارانەی بەبێ بەرامبەر کردووەخوا شاهیدە، ئەگەر بڵێم ئەم ژنە دایکی نووسەری ئەم چەند دێڕەیە، دەترسم بڵێن بۆیە واباسی دەکات ،ئەگەر وا نەبوایە لەوانەبوو ٤– ٥ پەڕەشم لەسەر دەنوسی، چونکە من لە خۆڕاگری ئەو ژنە چاك دەزانم لەنزیکەوە، لەکۆتایدا کە کچێکی کۆرپەی بەردڵی هەتیوباری و هەتیودەمرێ، توشی نەخۆشی دڵ دەبێ و ساڵەهای ساڵ بەو نەخۆشییەوە پلیکایەوە هەتا شەوی (١٩٨٣/٣/٢٦) دا بە جەڵدەی دڵ کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی (٦٦) ساڵیدا، لە خەموو لەخۆبوردو نیشتمانپەروەر و زانست و کەلەپور و ئەدەب پەروەرێك کە ڕێنمایی بەش بە حاڵی خۆم

ئـەو كارانـە هـەمووی لـەو دەناسـم. هـەتا لەژیانـدا بـوو بـە ئاواتـی ئەنجامدانی فەریزەی حەجەوە بوو بەڵام لەبەر بارودۆخی ئابوری نـەیتوانی ئـەو ئاواتـە بێنێتـەدی لـە ژیانیـدا ، دوای کۆچـی دوایـی خـۆی بەنـدە ئەحمـەد کـوڕە جوتیـار لـەڕێگای وەکیلـەوە لەگـەڵ خۆمدا فەریزەی حەجم بۆ ئەنجامدا و ئاواتەکەیم هێنایە دی.



**وێنەی حاجی خدیجە مارف**

## هـ. باری ئابوری

گوندی بێستان سوور لە دێر زەمانەوە لـە بـارودۆخێکی ئـابوری پڕ بژێویدا ژیاوە بە هۆی ئەو:

١. زەوی و زارە دێمـەکار و بەراوانـەی لەسـەرەوە باسمـان کـرد، هـەموو ئـەو زەویانـە بـەراوەکان دادەچـێنرێ بـە: مـەرەزە، لۆکـە، گوڵـە بەڕۆژە، کونجی، تـوتن، پیـاز، تـرۆزی، مـاش، بامـێ، تەماتـە، کـەم کـەم شێلم، ئەمە جگە لە بـاخی دارستـان، کـە هـەمووی بـەروبومێکی باشـی هەیە و هەر خێزانەی بە کێڵانی زەوی یەوە چی هی عقد بێ یـان ملك خـەریکن و ژێـواری خۆیـان بەرهـەم دێنـن، زەوی یـە دێمـەکانیش بـە گەنم، جۆ، نۆك، ترۆزی، کاڵەك، کـەم کـەم شـتی تـریش وەك پەرشـت و کەتان و هتد..، دەچێنرێ و بژێوی ژیانی خێزان و ئاژەڵەکانیان دابین دەکات.

٢. ئاژەڵەیش: مەڕ، بزن، گا و مانگـا، بـەرزە وولاخ، ئەمانـە چ بـۆ کـارو بـاری خێـزان و ژێـواری ڕۆژانـەیان، چ بـۆ فرۆشـتنی بـەروبوم و خوری و کاوڕ و نۆبەن و هتد..، کە بەروبومێکی ئابوری باشە.

٣. کـار و پیـشە وەك هەنـدێك کـەس دوکانـدارە و فرۆشـیارە، هەنـدێك پیـشەوەری وەك چـنین و دوریـن و هەنـدێکیش فەرمانبـەری میرین کە ئەمانەش بژێوی ژیانیـان بەوانـە تـەواو دەکـەن وێـڕای کـاری کـشتوکاڵی و ئاژەڵـداریش، ئەمانـەش هـەمووی لـە بونـی ئـەو زەوی و سەرچاوانەوە، ئەو ڕێگاو بانەوە کە ئەم گوندە هەیەتی فەراهەم دێت.

**٤. زەوییە دێمەکان**

**١. زەوی شێخ لاڵە، پارچە زەوی یەکی بەرفراوانە و کەوتۆتە لاپاڵی بەری ڕۆژئاوای کلکەی (عربت - بێستان سوور) ئەم پارچە زەوی یە بە مڵکی بەشێکی هی شێخانە و بەشی بناریش هی بنەماڵەی فقێ علی یە.**

**٢. زەوی لاباریکە: ئەمیش پارچە زەوی یەکە کەوتۆتە نێوانی گوندی بێستان سووری بچوك و کلکەی سەراکۆن کە باسکراون و جادەی گشتی عربت/دەربەندیخان، ئەم پارچە زەوی یە بەشێکی هی شێخان و گوندی باریکەیە، بەشێکی هی بنەماڵەی فقێ علی یە و بەشێکیش پەیوەستە (عقد) بەدەست جووتیارانی هەردوو گوندی بێستان سوورەوە.**

**٣. دەشتی بێکەسە و دوو دۆڵەکە: ئەم زەوی یەش کەوتۆتە باکوری ئاوایی یەوە هەر لە گوندەکەوە دەست پێدەکات هەتا سەر جادە گشتی یەکەی (عەربەت / هەڵەبجە) یان (سلێمانی /هەڵەبجەی شەهید) دەکەوێتە بەری ڕۆژئاوای ڕێگای پیادەڕێی بێکەسە و ئەمبەر وبەری دوو دۆڵە و بناری ڕۆژهەلاتی کلکەی مامە ڕەحمان کە باسمان کردووە، ئەم زەوی یە پارچەیەکی لە پێبناری کلکەی عەربەت و لەسەر جادەی عەربەت هی بنەماڵەی حمە سعیدی ڕەمەزانە، پارچەیەکیش لەبەر جادە و چاخانەی بێکەسەوە کە بە دەشتی تەیارەخانەکە ناسراوە هی بنەماڵەی کەرەم وەیسی یەکانە و ئەوەدواشی هی بنەماڵەی فقێ علی یە.**

٤. هەمدیسان (دەشتی بێکەسە) کە بە (دەشتی خرابە، پشت ئاوایی، بیرەکانی ئاغا) ناودەبرێ و کەوتۆتە نێوان ڕێگای پیادەڕێی بێکەسە و پیادەڕێی دارەکە، کە ئەم دوو ڕێگایە بەرەو باکور هەردوکیان دەچنە سەرجادەی عەربەت /هەڵەبجە، ئەو زەوی یەش هەمووی پەیوەستە (عقد) بەدەست جووتیارەکانەوەیە.

٥. زەوی گێڵەرە(ئیمان ڕۆ) : ئەمەش پارچە زەوی یەکە کە بە گێڵەرە ناودەبرێت و کەوتۆتە نێوان ڕێگای دارەکە و چاڵەپان لە گوندەکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و باکوری ڕۆژهەڵات، ئەم زەوی یە هەمووی (مڵکی سرفە) زەوی تایبەت، پارچەیەکی هی بابە ڕەسوڵ سید ئەحمەدی بەرزنجی یە، پارچەیەکی هی کەرەم وەیسیەکانە و هەندێکی زۆر کەمی پەیوەستی جووتیارەکانە و ئەوەدواشی هی کاك ابوبکری کوێخا عمر و وەرەسەکانی بنەماڵەی حاجی ئەمینە.

٦. بناری چاڵەپان و دارەکە: ئەم بنارەش کەوتۆتە ناو دۆڵەکانی کلکەی چەناخچیان لە ڕۆژهەڵاتی گوندی بێستان سوورەوە، هەمووی هی وەرەسەکانی بنەماڵەی حاجی ئەمینە، ڕێگایەك لە گوندەکەوە دەردەچێ بەدۆڵی چاڵەپاندا بە نیمچە چیاکەدا هەڵدەسێ بەرەو بەرزنجە و مۆریاس دەڕوات کە ئەم کاروانە ڕێگەی میوەهات و دار و ئالوگۆڕ و باراش هاڕین و هتد...، کە بە ڕێگای چاڵەپان ناسراوە.

٧. زەوی یەکانی کێڵە سپی و زریسکە: ئەم زەویانە بەسێ گۆشەیی لەناو گوندەکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات هەتا دەگاتە کلکەی چەناخچیان و جادەی هەڵەبجە و پشتی جادەش واتە پێ بنار، ئەم

زەوی یــە کەوتۆتــە نێــوان ڕێگــای چــاڵەپان و جــادەی قیرتــاوی چەناخچیان کە ئەم دوو ڕێگایە لە گوندەکەوە دەردەچێ هەتا کلکەی چەناخــچیان، ئــەم زەوی یــە هــی بنەماڵــەی عمــری فقــێ علــی و وەرەسەکانیەتی.

٨. زەوی بەشێکی کێلە سپی و گۆڕی گەوری و پشتی کاژاو و ڕەقەی زێڕینجۆ:. کە ئەم زەوی یە لە بنەڕەتدا ڕەقەی زێڕینجۆیە و ئێستا بەشی وەرەسەکانی کاك عمری فقێ علی کەوتۆتە کێلە سپی و بەشی پەیوەستی جوتیاران کەوتۆتە پشتی جۆگەی کاژاو و گۆڕی گەوری و بەشی زۆریشی کە هی کوڕانی کوێخا عمرە و کەوتۆتە ڕەقەی زێڕینجۆ، لە باشوری ڕۆژهەلاتی گوندی بێستان سوورەوە و ڕۆژهەلاتی گوندی کاژاو و باکوری گوندەکە یان سنوری زەوی یەکانی زێڕینجۆ و ڕۆژئاوای گوندی کانی پانکە یان سنوری زەوی یەکانی گوندی تەپە عارەبانی کانی پانکە کە باسمان کردوە.

ب. زەوییە بەراوەکان

١. بەرجۆگەی کاژاو کە بە ئاوی جۆگەی کاژاو ئاودێری دەکرێ و لە گۆمی بێستان سوور سەرچاوە دەگرێ هەتا سنوری زەوی یە بەراوەکانی گوندی کاژاو کە هی بنەماڵەی حاجی قادری وەیسی یە، لەباشورەوە ئەم زەویانەی کاژاو لە ناو گوندی بێستان سورەوە دەست پێدەکات تا سنوری گوندی کاژاو لەناو سێ گۆشەیەکدا لە نێوانی جۆگەی کاژاو (جۆگەی ئیسلاح) دا هەمووی پەیوەستی جوتیارەکانە ئاوی گۆمەکە بەهۆی مەشروعی ئاو خواردنەوەوە کرا بە جۆگەی کۆنکرێتی و بایەخی کەم بوەتەوە.

٢. زەوی ئیسلاح: زێڕینجۆی جاران ئەم زەوی یە لە باشوری گوندی بێستان سوورەوە بەرەو باشور بۆ سەر سنوری زەوی یەکانی زێڕیجۆ دەڕوات بە ئاوی جۆگەی زێڕینجۆ ئیسلاح ئاو دەدرێت، هەمووی پەیوەستی جوتیارەکانە.

٣. بەرجۆگەی قازاو: ئەمەش لە باشورەوە لە چەمی ئاشەکانەوە دەست پێدەکات و بە ئاوی جۆگەی قازاو ئاو دەدرێ و هەتا دەگاتە سنوری زەوی یە بەراوەکانی زێڕینجۆ و قازاو، پەیوەستی جوتیارانی بێستان سورە و بەشی زۆری دارستانەکەی داری تەختە وەك بی و چنار.

٤. زەوی یاسین تەپە: ئەم زەوی یە بە ئاوی جۆگەی یاسین تەپە و قازاو ئاودێر دەکرێ و نیوەی پەیوەستە و نیوەشی هی بنەماڵەی ساحێب قڕانەکانە.

٥. بەرجۆگەی لەن: ئەم زەوی یە لەبەر ئاوی ئاشی مام عمری فقێ علی ئاودێر دەکرێ و زەوی یەکە هی بنەماڵەی ناوبراوە.

٦. بەرجۆگەی بێستان سوور: لە باشوری ئاواییەوە دەست پێدەکات، بە دوو جۆگە کە ناودەبرێت بە جۆگەی بێستان سور، یەکێکیان پارچە زەوی ناو ئاشان، کە بەشی زۆری دارستانە و هی بنەماڵەی مام عمری فقێ علی یە، جۆگەی تازەش پێنج پارچە زەوی (تەملیك) (پەیوەست بوون بە ملْك) ئاودێر دەکات کە هی جوتیاری گوندەکەن.

٧. شێخە لەڕە: ئەمەش پارچە زەوی یەکی (تەملیك) ە، بەئاوی گۆمی گەرمکی قاسم ئاودێردەکرێ و کاتی خۆی هی (حمە ئاغا

ناسراو به حمه کەچەڵ) بووە، بەڵام ئێستا هی بنەماڵەی ئەو ڕەحمانی ئەلی یە کە باسمان کردووە.

٨. بەرجۆگەی سەیدە: جۆگەو ئاو و پارچە زەوی یەکی بچوکی شێخانە.

٩. چـاڵگەی خـواروو: لـە باشـوری گونـدی بێـستان سـوری بـچوکەوەیە و بـەئاوی چـەمە بـچکۆلە ئـاودێر دەکـرێ و پەیوەسـتی جوتیارانی گوندی بێستان سوری بچوکە.

١٠. چاڵگەی سەروو:. هـەر لـە باشـوری گونـدی بێستان سوری بچوکەوەیە و لەسەرەوەی چاڵگەی خوارەوەیە بە ئاوی چەمە بچکۆلە ئـاودێر دەکـرێ و پەیوەسـتی جوتیـارانی گونـدی بێـستان سـوری بچوکە.

١١. خـاك وخـۆڵ: ئەمـەش پارچـە زەوی یـەکی بـەراوی فراوانـە دەکەوێتە باشوری بێستان سوری بچوکەوە، بە ئـاوی جۆگـەی خـاك و خۆڵ ئاودێر دەکرێ، لە بێستان سوری بچوکەوە تـا سنوری زەوی یـە پەیوەستەکانی خـاك و خـۆڵ و نیسکەجۆ هـەمووی لـە بەشـی باکوری زەوی یـەکانی خـاك و خۆڵـەوە پەیوەسـتی جوتیـارانی بێستان سوری گەورەیە و بوە بە تەملیك.

١٢. پوشـێن: لـە باشـوری ڕۆژئـاوای گونـدی بێـستان سـوری بـچوکەوە دەسـت پێـدەکات هـەتا دەگاتـە سـەر زێـی تانجـەرۆ و گـردی خـاك و خـۆڵ، ئـەم زەوی یـە فراوانـە و بـە ئـاوی جۆگـەی پوشـێن کەلـە گۆمــە ڕەشــەوە سەرچــاوە ئــەگرێ کــە باسمــان کــردووە، هــەمووی پەیوەستی جوتیارانی بێستان سوری بچوکە.

١٣. لـه بـەردەم گونـدی بێـستان سـوری بـچوکدا پارچـە زەوی یەکی بچوك هەیە کەبە زەوی حەوزی سەی کەریم ناو دەبرێ و ئێستا پەیوەستی بنەماڵەیەکە (خێزانێك) بە خێزانـی ئەحە هەتیو ناسـراون، چەمە گەورەکە لە بێستان سوری گـەورەوە سەرچاوە دەگرێ و چەمە بچکۆلەکە لە بێستان سوری بچوکەوە سەرچاوە دەگرێ، لـە شـوێنێك یەکدەگرن کە. دووگرانگی پێدەوترێ، ئیتر لەوێوە بە چەمە ڕەش نـاو دەبرێ هەتا لای یاسین تەپەوە دەڕژێتە تانجەرۆوە، کە باسمان کـردن، باسـی گۆمـە ڕەشیـشمان کـرد و ئێـستا باسـی کـانی و سەرچـاوەکان دەکەین.

أ. کانییەکان

١. گۆمەکـە: ئـەم گۆمـە بـە گۆمەکـەی بـەر ئـاوایی ناسـرابوو، گۆمێکـی هێلکـەیی کـە دەورەکـەی (١٥٠م) دەبـوو، قوڵـی چـەقی ناوەڕاسـتەکەی نزیکـەی یـەك مـەتر و نیـو دەبـوو، لـە ناوەڕاسـتەوە بەزۆری هەڵدەقوڵا و بەهار و پایزان لە تەنیشتەکانی یـەوە هەڵدەقوڵا، بە زستان گەرم بوو و هـەڵمی لێ هەڵدەستا و بە هـاوین ئەوەنـدە سـارد بوو کە مەشکە دۆیان دەخستە نـاوی ساردی دەکرد، گا گەلی ئاوایـی بە نیوەڕوانی هاوین لەسەر ئەو گۆمە مۆڵ دەدرا و قاز و مراوی لەوێدا کۆدەبونـەوە، بەسـۆرخی ئـەوەی کـە هەمیـشە دەغـڵ و دانـی تێـدا دەشۆرایەوە، لە ناوەڕاستەوە ڕووی باشوری ئاوەڕۆیەکی هەبوو کە بە ئاوەشـکێنەی زسـتان نـاو دەبـرا، کاتێـك زەراعـەت بـە ئـاو نـەدەما لـەو ئاوەشـکێنەوە ئـاوی گۆمەکـە بەردەدرایـەوە و ئـاوی جۆگـەی

زەراعەتەکان بەری دەگیرا، ئەم گۆمە ئاوی جۆگەی کاژاو و جۆگەی بێستان سوری لێوە هەڵدەگیرا کاتی زەرعی هاوین کاژاو بەرەو ڕۆژهەڵات و جۆگەی بێستان سوریش بەرەو باشور، باسی ئەم جۆگەیەمان کردووە.

٢. هەردوو کانی لۆکە: ئەم دوو کانی یە لە بەشی سەروی گۆمەکەوە هەڵدەقوڵان، زۆر ڕوون و جوان و سارد بوون، بە هاوین زیخ لە بنیادا دەدرەوشایەوە، بۆ ئاوی خواردن و شتن وساردکردن بەکار دەهاتن، ئاوەکەیان دەچووە سەر گۆمەکە، ئێستا گۆمەکە و هەردوو کانی لۆکە کوێر بونەتەوە لەناو بەربەندی پرۆژەی ئاو خواردنەوەکەدا وون بوون و ڕووکەشە جوانەکەیان و سروشتە ئاساییەکەیان نەما ، لە گۆمەکەوە بەسەر جۆگەی بێستان سوردا سەترەکە بوو، کە بەربەندێکی شوێنەواری مێژوویی بوو کە ئاوی لێوە ڕاکێشراوە بۆ بەربەندی چواردەوری گردی گۆمە ڕەش و ئاودێری زەوی یەکانی بەری دارە ڕەش و لەبن گردی سەراکۆنەوە بە خشتی سور و قسڵ دروست کرابوو، بەداخەوە ئاسەواری ئەو بەربەندەش پرۆژەی ئاوەکە وونی کرد، مەگەر بەم چەند دێڕە زیندوی کەینەوە.

٣. حەوزەکانی مزگەوت: کە سێ حەوز بوون بۆ دەست نوێژ و خۆشتن و ئاو خواردنەوە کەزۆر ڕوون و جوان و بەزستان گەرم و بە هاوین سارد، بەتایبەت حەوزی ئاو خواردنەوەکە ئەوەندە خنجیلانە و جوان بوو تا سەر بەردە سافەکانی دەوری و زیخە مرواری ئاساکەی بنی، ئاوی چاویان دەبرد و فێنکی خۆشی یەکەشی ماندوی دەڕەواندەوە و کارمەندانی کشتوکاڵی هاوینیان دەردەکرد، دانیشتنی

سەر تاشە بەردە ساف و جوانە پانەکانی دەوری حەوزی دەست نوێژ و بەردە نوێژەکان ئەوەندە فێنك بوون مانوی دەحەوانەوە، مخابن دروست کردنی مزگەوتە کۆنکرێتە تازەکە و پرۆژەی ئاوەکە هەمووی وون کردون.

٤. کانی باینجان: کە هی گەڕەکی ئاغا بوو، ئێستاش لەناو بەربەندی پرۆژەکەدا ئاسەواری ماوە.

٥. کانی (حەمەی مامە کریم): کە هی گەڕەکی کەرەم وەیس و گەڕەکی ڕۆژهەلاتی ڕێگەی چەقی ئاوایی بوو کە ڕێگەیەك بوو ئاوایی دەکرد بە دوو بەشەوە، بەشی ڕۆژهەلات و بەشی ڕۆژئاوا، ئەو کانی یە جگە لە گەڕەکی مالی ئاغا هەتا سەر ڕێگای ناو براو و ئاو هێنان و شیوکولی ژنان لەو کانی حمەی مام کریم دابووە، بە تەنیشتی یەوە کانی نەنکە فاتە کە باسمان کردووە هەبوو کە تایبەت بوو بە نوێژ و دەست نوێژو حەوانەوەی کاتی ڕۆژو.

٦. کانی گەورە: کە هی گەڕەکی بنەمالەی فقێ علی بووە و گەڕەکی بەڕی ڕۆژئاوا، کە بە گەڕەکی (دوودۆلە) ش ناو دەبرا، لەو کانی یەدا ئاوی خواردن و شتن، بە تەنیشت ئەمیشەوە کانی دایکە مریم هەبووە کە باسمان کردووە، ئەو کانی یە پەیوەست بووە بە نوێژ و دەست نوێژ و حەوانەوەی کاتی ڕۆژوەوانی دایکە مریم کەبە پیرۆز ناسراوە، واتە کانی نەنکە پیرۆز بووە، بەداخەوە بڕگەی (٥,٦) هەمووی بەربەندی پرۆژەکە وونی کردووە.

٧. کانی هەنجیر و گۆمی باوە حاجی: کە گۆمەکە سەردەمی ئاشەکە بۆ ئاشی کرەی چەلتوك و ساوەر بەکار هاتووە، کانی یەکەش

بۆ ڕۆژانی هەینی ژنان بەکار هاتووە، بەداخەوە پرۆژەکە ئەمانەشی تەخت کردووە، جگە لەوەی لە جێگەیان گۆمێك دروست کراوە لەلایەن کاك ابوبکر بۆ ئاودێری باخ و زەوی ناو ئاشان.

٨. کانی خەرقە ڕەش: کە لە پێشەوە باسمان کردووە.

٩. سەرچاوەی ئاوەکانی ئاشی خەرقە ڕەش و ئاشی کاك ئەحمەد کە ئاوەڕۆکەیان لە هەردوو (شەلال) یان ئاوەشکێنەری هەردوو ئاشمان براوە وە دەچوو بۆ جۆگەی قازاو و چەمە گەورە کەناومان بردوون، ئێستا ئەو ئاوانە لە بەربەندێکدا کۆکراونەتەوە لەبەردەمی ئاشەکاندا و لەوێوە ئاویان بۆ جۆگەکانی ناوبراو کە باسمان کردووە هەڵدەگیرێ.

١٠. گۆمە ڕەش و حەوزی سەی کەریم: لە بێستان سوری بچوك باس کراون، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئاوی ئەم دوو سەرچاوەیە بە چوار فەسڵە نەگۆڕن، واتە سارد و گەرم نابن مەگەر کەم، کەمێکیش لینج و ناسازترن و زیخەکانیان ڕەش دەبنەوە، سیفەتێکی کانزاییان تیایە ئەوەتا بۆئەوەی گوش شی بکەنەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە گۆمە ڕەشدا دایدەنێن، کە دەریان هێنا گوشەکە بە دوو تەکاندن لە دارەکە جیا دەبێتەوە، لە هەموو شارەزووردا ئەو ئاوە ئەو سیفەتەی هەیە، گوش ڕووەکێکە کە گوشی لێ پەیدا دەبێ بۆ چنین و دورینی زۆرشت بەکاری دەهێنن.

**ڕادەی خاوێنی لە ئاوەکانی بێستان سوردا**

**مندالبووم لە پۆلەکانی کۆتایی سەرەتاییدا شاندێکی لێکۆڵینەوە لە سەر ئاستی خاوێنی ئاوەکانی بێستانسور هات کە ڕادەی تەوژمی هەڵقوڵین و ڕێڕەو و ڕوونی و ساردی و گەرمی ئاوەکانیان گرت، وە نموونەشیان وەرگرت بۆ ئاستی پاکی و دروستی لەسەر ئاوەکان، کە بەم جۆرانەی خوارەوە مەزندە کرا:**

**١. کانییەکانی دراوی دێ لەگەڵ گۆمەکەدا کە پێشتر باسم کردووە، بە پلەی دوو لە هەموو ڕادەکانی سەرەوەدا هاتە دەستنیشان کردن.**

**٢. کانی خەرگە ڕەش و کانی قازاو لەڕووی جوانی و سارد و شیرینی و پاکییەوە بە پلەی یەك هاتن، کە ئەم کانیەشم پێشتر باس کردووە.**

**٣. سەرچاوەی جۆگەی ئاشی کاك ئەحمەد و دەستپێکی جۆگەکە بەنزیکەی نیو کیلۆمەتر هەتا دەگاتە مەزاری وەیس کەباسمان کردووە، ئەم جۆگەیە بە ژێر سێبەر و سەهەندی درەختە بالا بەرزەکاندا ڕەت دەبێت کە بە درێژایی ئەو نیو کیلۆمەترە هەتاوی بەرناکەوێت، قوڵی ئاوەکەش لێرەدا تا پشتی ئەژنۆ دەبێت، پانی یەکەشی نزیکەی(١٥)مەتر دەبێت، لە هاویندا ئەوەندە ساردە تا ئەو ماوەیە دەبڕێت لە سارديدا بێتاقەت دەبێت، لە زستانیشدا زۆر گەرم و خۆشە، لە تەختی بنی ئەم ئاوە ڕوون و جوانەدا سەوزەگیایەك کە لەکوزەڵە دەچێت ڕوواوە کە خۆراکێکی زۆر بە کەڵکە بۆ بەرزە وولاخ، ئەم روەکەش بە(دەلاو)ناو دەبرێت.ئەوەتا لە کوردەواریدا دەڵێن دەڵێ**

ی بەرزە وولاخی دەلاو خۆرە ئەوەندە مەستە.

دەلاوی ئێرە نە هیچ مێروویەکی پێوەیەو نە لینجیشە وەك دەلاوەی شوێنەکانی تر کە ئەوان لینج و مێروودان.لە نێو ئەم ئاوەدا توێکلی گوێچکە ماسی بەدی دەکرێت کە وەك بەرگی کیسەلێکی بچووك بە قەد هێلکە کۆترێك دەچێت، بەشی سەرەوەی بەرگە دوو پارچە بووەکە بۆر و کەمێك زبرە، هەرچی بەشی خوارەوەشی (ژێرسکی)سپی و سەدەفی یە لە ئاوەکەدا بریقە دەدات.

ئیتر نازانرێت ئەم گوێچکە ماسی یانە لە کوێوە دێن و لێرە بەرگەکە فڕێ دەدەن یان لە چ کەنارێکی ئەم ئاوەدا خۆدەشارنەوە، چونکە تا ئێستا زۆر بەدەگمەن بینراون یان هەر نەبینراون.

ئەم ئاوەش بە پلەی سێ هات، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کەلە دەسپێکی ئەم ئاوەوە جۆگەیەك دادەشکێ بەرەو کانی خەرگەڕەش و دەستپێکی چەمە گەورە، لەم جۆگەدا کە تەواو پێچەوانەی سەرچاوەکەیەتی بە زستان ساردە و بە هاوین گەرمە. کە لە تەك ڕێڕەوی کانی خەرگەڕەشدا تێکەڵ دەبێت لەو شوێنەی کە پێیدەڵێن بەردە بازەکان لە یەك سانتییمەتردا بەشی سانتیمەترەکە لە هاویندا ئەڵێی تەرزەیە و لە زستانیششدا ئەڵێی ئاوێکی نیوەکولاو کەچی بە پێچەوانەوە ئەو چۆگەیەی کە باسمان کرد دێتەسەری لە هاویندا ئەڵێی کولاوە لە زستاندا ئەڵێی تەرزەیە. ئالێرەدا (مرج البحرین یلتقیان) هذا ماء فرات و هذا ملح أجاج، کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

لەویش سەیرتر ئەم جۆگەیە کە لەو ئاوە جوانەی سەرەوەدا دەژی جۆرە بەردێك بەدی دەکرێت کە توێکڵ توێکڵە لە قەبارەی هەڵماتی شوشەوە بگرە هەتا هێلکەیەکی بچوك تیایاندایە کە توێکڵەکانی دەشکێنێ ناوەڕاستەکەی زیخێکی بچووکە، کەواتە ئەم ئاوە لێرەدا کلسییە (کانزایی) بەڵام بۆچی سەرچاوەکەی کە لە سەرەوە باسمان کردووە ئەو ئاوە جوانەیە کە تەنانەت دەڵاوەکەشی لینج نیە و بێ مێرووە وە گوێچکە ماسیشی تیادایە لەگەڵ ماسی جۆراو جۆر کە چی ئەم جۆگەیەی لێ ی دادەڕژێ ئاوا کانزایی یە ؟

لە دامێنێ جۆگەی ئاشی کاك ئەحمەدەوە کە لە دوای دوو کیلۆمەتر دەچێتە سەر دۆڵیانەی ئاشەکە لە بەری ڕۆژئاوایەوە شەلالێکی(تاڤگە)دەستکردی پێنج مەتری پاك و جوان هەروەك سەرچاوەکەی دادەڕژێ.کەچی لە ڕووی ڕۆژهەلاتیەوە ئاوێك دادەڕژێ بەرەو چەمەگەورە، ئەم ئاوەش هەروەك جۆگەکەی سەرەوە کە باسمان کرد بە زستان ساردە و بە هاوین گەرم و بەردەکلسیشی تیایە هەروەك ئەوەی سەرەوە، ئەگەر چی بەینیان دوو کیلۆمەترە، کەلە دەسپێکی جۆگەی ئاشەکەوە و لە دامێنی جۆگەکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دادەشکێن، پێدەچێ ئەو زەوی یەی ئەو نێوانە زەویەکی کانزایی یە.

٤. ئەو ئاوانەی تر کە لە دوای سەرچاوەکانی بیستانسورەوە دەردەچێت دوای کیلۆمەترێك هەموویان بە پلە چوار دێن کە ئەویش هۆکاری زەوی یەکانە کە پیایدا تێدەپەڕن.ئەم ئاوە بە پلە چوارە ئەم جۆرە گیاندارانەیان تیایە(ماسی، بۆق، قرژانگ، کیسەڵ، مارماسی، مار)لە چەمە گەورەوە و چەمە ڕەشیشدا سەگی ئاوی، زێروو،

مێـرووی تـری ئـاوی و چەشـنە مێروویـەکی هێلکەشـەیتانۆکەیەکی ڕەش بە قەوارەی نیسکێك قەراغەکەی لە گوێـزان تیـژترە کەلـە هەندێ لـە ئاوەکانـدا دەردەکـەون ئەگـەر بـە ڕێکـەوت بـە پـێ ی پـەتی یەکێـك قاچـی بەرکـەوێت ئەوەنـدەی بڵـێ ی یـەك و دوو خێـرا ئەگـەر بەنوکـە چەقۆکەیەك دەری نەهێنێ دەچێتە قوڵایی خوێن.).

ماسییەکانی ئێرە (ماسییە تانجەرۆیی، سوورە، خڕەڕەشە)کە ئەمانە خۆشترین و جوانترین ماسین، پانکە، مەشکەدەمە، کەئەمانە بە پلەی دوو دێن، لمە، خۆتە، بزە سمێڵە، ئەمانە بە پلـەی سێ یـان هـەر نەویـستراو دێـن. نقـەش جاروبـار بـەدی دەکرێـت.ئەمانـە بـە پێـی کەلتوری دەماودەمی ناوچەکەن).

لە دراوی گوندەکەدا لە نێوانی کانییەکاندا کە لە گەشتەکەماندا باسمان کردووە دورگەیەکی هێلکەیی ڕوبەر نزیکەی(٥٠٠)مەتر بەدی دەکرا کەلە بەهاراندا پڕ لە گوڵی وەنەوشە و بەیبون و گوڵەسێپەڕە و گوڵە زەردەی فیقەنەیی و گوڵە پونگەی مۆری بۆن خۆش و گوڵە سالم و هـی تـر لەگـەڵ دەنگـی باڵنـدە بـچکۆلە کـانی ناویـدا لـە بەهارانـدا دیمـەنێکی سـەفا بـەخش بـوو، ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ جۆگـەی بـەردە بازەکـان ئـاوە کلـسیەکەی کـە باسمـان کـردووە، لێرەشـدا دورگەیەکـی نزیکـەی حـەوت دۆنم ڕووبـەری سێگۆشـەیی کـە بەشـی سـەروی ئـاوە کلسی و جۆگەکەی سەرەوەیە کە باسمان کردووە، بەشی ڕۆژئاوای لە کەندەلانێکەوە دەستپێکی سەرچاوەی چەمە گەورەیە، ڕۆژهەلاتیشی جۆگەی قازاو و یاسین تەپەیە تا تێکەڵ دەبێت بە چەمە گەورە لەبەر ئاشی کاك ئەحمەد دا.

ئەم دوورگەیە شوێنێکی جوان و دڵ ئەفروز بوو، دڕووڵان بوو (واتــە بــە توتــڕك و زریــسك داپۆشــرا بــوو) بــەیناو بــەین لەنێــو دڕوولانەکەوە تەرزە مێو و تەرزی لاولاو سەریان دەرهێنابوو، نێوانی کۆڵانەکانی دڕوولانەکە بە سێپەڕە و فریز و گیا داپۆشرابوو کە لە وەرگایەکی باش بوو بۆ گوێرەکەکانی گوندەکە، لە هەمووی جوانتر ئەم دوورگەیە دوای ئەوەی کە لە بەهاردا بەم شێوە سروشتی یە دەڕازایەوە، سێ جۆر بولبول کە یەکێکیان لە قەوارەی پەڕەسێلکەدا مەیلەو شین باو بە جقەجق دەیان خوێند کە ناسراو بوو بە فیسقە، چەشنێکی تریان لە قەوارەی پاساریدا کە بۆرێکی مەیلەو سوور بوو کە بە دەنگێکی چپی چپی دەیانخوێند کەناسراو بوو بە چپی چپی و هێلکە سوورە، چونکە هێلکەی سوریان دەکرد.

جۆرێکــی تریــان لــە قــەوارەی بولبولێکــی خورمــاخۆردا بــوو سەرپشتی کەمێك سورباو ژێر سکی کەمێك سپی واش کە بە چەند جۆر دەنگ دەیان خوێند، ئەم سێ چەشنە بولبولە لە بەهاران لەو دڕوولانەدا هێلانەیان دەکرد، کە شوێنەکەیان تا ڕادەیەك لە دەستی زیانەوەرانەوە وەك منداڵ و دڕندە و مار و مێروو پارێزراو بوون.

بەیانیان زوو لەگەڵ سەحەردا دەیانکردە چریکە و ناڵە لەگەڵ کــزەی شــەماڵ و هــاژەی ئاوەکــان و کــسپەی درەختــەکان دەبوونــە مۆسیقایەکی سەفا بەخش، ئەوەمان لەبیر نەچێت کە چەشنی سێهەم ناسراو بوو بە بولبولی چەمی.

گێژاوەکە دەکەوێتە سەر چەمە گەورە لە پێچی زەوی لەندا کە باسمان کردووە، کونە چەقەڵ دەکەوێتە سەر جۆگەی قازاو لە سێ

کیلۆمەتری باکوری یاسین تەپە کە باسمان کردووە، ئەم دیمەنە جوانە دڵی سەیران کەرانی ڕادەکێشا، ئەوە ماوە بڵێین ئایا چ ئاڵ و گۆڕێك بۆ دادێ بەسەر ئەم سروشتەدا دێت.

تێبینی

١. لە شەستەکاندا لە ئەنجامی بومەلەرزە و هەورە تریشقەیەکی سەختدا لەناو کانییەکدا بەناوی (کانی باینجان) بۆ چەند ڕۆژێك چەوراو هەڵدەقوڵی بۆنی نەوتی لێدەهات.

٢. ئاژەڵ و باڵندەماڵییەکانی ئەم گوندە (مانگا، مەڕ، بزن، ئەسپ، ئێستر، گوێدرێژ، سەگ، پشیلە، کەروێشك) باڵندەکان (مریشك ، قەل، قاز، مراوی، کۆتر).

٣. ئاژەڵە کێویەکانی ئەم سنورە (گورگ، چەقەڵ، ڕێوی، بەراز ، پشیلەی کێوی، گۆڕهەڵکەنە، کەروێشکە کێوی، ژیشك، مار).

٤. باڵندە کێوییەکانی ئەم سنورە:

أ. کۆچەرەکان (چێرك، حاجی لەقلەق، کونەپەپوی شاخدار، ماسی گرەی بازو، پەڕەسێلکە، تەیرەن عەبابیلە، عاینە مەل، واق، پەپو سلێمانە، بەرگایلکە، بەوریلە، مرەڕەشە و مرە بۆرە، زیقاو، کەنەسمە، قاژو، کلك هەڵسەنگێنە، قەڕەمیلە، قەلەڕەشکە، هەڵۆکان، کوڕکوڕ، شوان هەڵخەڵەتێنە).

ب. باڵندە هەمیشەییەکان (چۆلەکە پاساری، ڕیشۆڵە، کۆتر، کوڵەفڕە، پۆڕ، جوڕەو زەردی وەلی، کلاوکوڕە، بلبلی چەمی، کوندەپەپوو، ماسی گرەی سەوز، بەت و شینە شاهۆ، شەلاقە و گا

مارۆ، قەلەباچکە، قژاکە، زیخ هەڵچنە، زڕەپۆڕ، مراوی ،قاز، وەردەك).

٥. درەخت و ڕووەکەکانی ئەم گوندە (بی، چنار، توو، مێو، توترك، هەنجیر، زریسك، خڕنوك، گوڵەباخ، تەڕکەولەبان کە بۆ چیخ و حەسیر بەکاردێت).

– ناوی ئەم باڵندە و گیانەوەرانە لە کەلتوری ئەم گوند و ناوچەیە هاتوون.

هاژەی شەتاوان باعەی ڕانە مەڕ
مۆسیقای عەشقە بۆ نەوای سەحەر
خۆی ڕاخستووە پەلکەی تەرزە مێو
ڕازیانەی تەڕی خرچەی تازە لێو
وەنەوشە و بەیبون شنەی بەهاران
لە دەوری کانی سایەی نساران
ورشەی ئاونگی خونچەی گوڵ بەدەم
سەیرکەن بلبل واهات بەرەو چەم
سەیر و سەفایە ئاواز و ڕەزمە
لە بن هەر دارێك سەیران و بەزمە

ج. ڕێگا و بانەکان

١. ڕێگای قیرتاوی تانجەرۆ /بێستان سور: لە ڕۆژئاوای بێستان سور لە جادەی گشتی عەربەت - دەربەندیخانەوە دەست پێدەکات بە نێوانی زەوی یە بەراوەکانی پوشێن و زەوی یە دێمەکانی لا باریکە / دارەڕەشدا تێپەڕ دەبێ هەتا ناو گوندەکە، لە نێوان گوندەکەشدا بە نێوانی زەوی یەکانی ڕەقەی زێڕینجۆ و دەشتی چاڵەپاندا تێپەڕ دەبێ هەتا دەگاتە کلکەی چەناخچیان، لە ڕۆژهەلاتەوە ئەم ڕێگەیە لە دێر زەمانەوە هەبووە، چەند ساڵێکە قیرتاو کراوە، هۆی گواستنەوەی هاتوچۆ و کاروان و بارکۆچ و بەروبوم و ویستی بازرگانی گوندەکە و دەوروبەر بووە، لە ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوای گوندەکە.

٢. ڕێگای دارە ڕەش: ئەو ڕێگەیە پیادە ڕێیە و لە ناو گوندەکەوە دەردەچێ بەرەو ڕۆژئاوا بە ناوەڕاستی زەوی یەکانی لاباریکە و دارەڕەشدا تێدەپەڕێ بۆ سەرجادەی گشتی عەربەت / دەربەندیخان، ئەم ڕێگەیە لە دێر زەمانەوە هۆی گواستنەوەی ویستەمەنی یەکان بوون بۆ ئاڵ و گۆڕ و پێویستی ژیان و هاتوچۆ و بارو بنەو هتد. ..

٣. ڕێگەی باریکە: لە دارەڕەشەوە لە ڕۆژئاوای گوندەکە بۆ ناو گوندی باریکە، زیاتر ئەم ڕێگەیە هی ئاودانی ئاژەڵەکانی گوندەکانی بەری ڕۆژئاوان لەسەر ئاوی گۆمە ڕەش.

٤. ڕێگەی عەربەت - بێستان سوری بچوک: کە ئەمەش لە بناری بەری ڕۆژئاوای کلکەی مامە ڕەحمان/عەربەتەوە ڕەتدەبێ بۆ شارۆچکەی عەربەت و ڕێگەی هاتوچۆ و ئاژەڵی لەوەڕان و کاروباری

پیادەڕێ بەرەو باکوری گوندەکە بۆ کێشەی کارگێڕی و کڕین و فرۆشتن و هاتوچۆ.

٥. ڕێگەی بێستان سوری بچوك /تەیارەخانەکە: ئەم ڕێگەیە لە گوندی بێستان سوری بچوکەوە دەردەچێ و بەسەر ملەی یالی مامەڕەحمان - سەراکۆندا سەردەکەوێ بەرەو باکور بەناو زەوی یەکانی دەشتی تەیارەخانەکەدا بەرەو بێکەسە دەڕوات، ئەمە پیادەڕێی هاتوچۆی شار بووە، هەر لەم ڕێگەیەوە لە بناری بەری ڕۆژهەلاتی (کلکەی عەربەت -مامە ڕەحمان) ەوە بەرەو باکور بە بناردا ڕێگەیەك بەناو زەوی یەکانی ڕۆژئاوای دوودۆڵەدا کە باسمان کردووە سەردەکەوێ هەتا دەگاتە جادەی عەربەت - هەڵەبجە.

٦. ڕێگەی بێکەسە: ئەم ڕێگەیە لە دێر زەمانەوە ڕێگەی هاتوچۆی خەڵکی گوندەکە بووە بۆ چونیان بۆ شاری سلێمانی، لە ناو گوندی بێستان سوری گەورەوە بەرەو باکور سەردەکەوێ بۆ سەر جادەی عەربەت /هەڵەبجە و سەر چاخانەی بێکەسە.

٧. ڕێگەی خرابە: کە پیادە ڕێیەکە لە بێستان سورەوە دەچێ بۆ گوندی خرابە، لە باکورەوە ئەم ڕێگەیە تەنها هی هاتوچۆی کشتیاران و هێنانی ئاژەڵی خرابە بۆ ئاودان لەسەرچاوەی بێستان سور، ئەو ڕێگەیە دەڕوات بە ناوەڕاستی زەوی یە پەیوەستەکانی (پشت ئاوایی /بێکەسە - دەشتی بیرەکانی ئاغا) دا.

٨. ڕێگەی دارەکە: ئەم ڕێگەیە لە دێر زەمانەوە لە گوندەکەوە بەرەو باکور بۆ سەر جادەی گشتی عەربەت /هەڵەبجە دەچێ وڕێگای هاتوچۆی چوون بۆ شارە، بە نێوان زەوی گێڵەرە و بیرەکاندا دەڕوات.

٩. ڕێگەی چاڵەپان: لە گوندەکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات بە ناوەڕاستی زەوی یەکانی گێڵەرە و زریسکەدا دەڕوات هەتا سەر جادەی گشتی عەربەت /هەڵەبجە و لەوێشەوە بە زەوی چاڵەپاندا بە چیای کلکەی چەناخچیاندا هەڵدەزنێ و بەرەو بەرزنجە و مۆریاس، ئەمە بۆ میوەهات و دار و باراش بووە لە دێر زەمانەوە.

١٠. ڕێگای گۆڕی گەوری: لە گوندەکەوە بەرەو باشور بە پشتی جۆگەی کاژاو بەری کێلەسپی دا بەرەو گوندەکانی کاژاو و زێڕینجۆ بۆسەر کێڵگەکانی ئەو ناوەش دەڕوات.

١١. بەرەو کێڵگەکانی ئیسلاح، یاسین تەپە خاك و خۆڵ هتد. .. ڕێگای هاتوچۆ بەرەو باشور بۆناو کێڵگە دارەکان و گوندەکانی باشور و یاسین تەپە.

## ئاژەڵداری

بێستان سور خاوەنی گەلەڕانە مەڕ و گا گەل و ڕەوە بەرزە وولاخ و پۆلە باڵندەی وەك قەل، قاز، مراوی، مریشك بووە هەتا ئێستاش، بەروبومێکی چاکی هەبووە و هەیە، لاپاڵ و چەمەکان بونەتە مایەی زیاد بوونی بەروبومی ئاژەڵ.

لەم گوندەدا لە دێرزەمانەوە ئاشی ئاو هەبووە کە لە هەر چوار لاوە باراشی بۆ هاتوە و بوەتە بەروبومی ئابوری باش.

کارو پیشەی تریش: وەك:

١. کڕین و فرۆشتن و دوکانداری.

٢. دەوار چنین. ٣. بەڕە. ٤. چیغ. ٥. حەسیر. ٦. کلاشی پەڕۆ یان

بەن کە بۆ درەوان بەکار هاتووە و بە کلاشی دۆمی ناسراوە، وەستای ئاش بۆ بەگەڕ خستنی ئاو و چاککردنی بەرداشەکان، دروست کردنی سەبەتە بۆ کاروباری میوەهات یا فڕێدانی پاشماوەی ئاژەڵ بەسەبەتەکە، چنین و ڕستن کە هەمووی ئابوری باشی فەراهەم هێناوە، ئەمانەی لەم بڕگەی ئابوریەدا باسمان کردن وەك زەوی و زار، ئاو و سەرچاوە و ڕێگاوبان و ئاش و پیشەکان و ئاژەڵداری، هەموویان جگە لەوەی کە ڕادەی بەرزی ئابوری ئەم گوندە ئەسەلمێنن جوانی سروشتیش بەرجەستە دەکەن کە بۆتە هۆی ئەوەی ئەم گوندە لەسەرەتای مێژووەوە هەتا ئێستا لە باری کۆمەلایەتی و ئابوری شارستانی یەتەوە گەشەدار و دیار بووە لە شارەزووردا.

ڕادەی هونەری و داب و نەریتی کۆمەلایەتی و شارستانی

هونەر: لەم گوندەدا هەرلە سەرەتای دامەزراندنییەوە و لە قولایی مێژووەوە هونەری میللی و کوردەواری باوێکی گرنگ بووە و گرنگی زۆری دراوەتێ، وەك: هەڵپەڕکێ، گۆرانی و هۆرە، شمشاڵ، پیشە دەستی یەکان و زۆرکاری هونەری یادی شانامە و هتد.

چەند کەسانێك بۆ ئەم مەبەستانە لەم گوندەدا هەڵکەوتون کە توانایەکی چاکیان لەو بوارانەدا هەبووە، بۆنمونە: (مجیدی سلێمان) یەکێك لە شمشاڵ ژەنە بە ناوبانگەکانی شارەزوور بووە کە توانیویەتی بۆماوەی چەند کاتژمێر بە جۆرەهای ئاواز لە ڕێگای (لولکەوە چ قامیش بوبێ یان ئاسن) توانیویەتی شمشاڵ بۆ هەڵپەڕکێ بژەنێ بە هەموو جۆرەکانی هەڵپەڕین، یان گۆرانی بێژی

وەك (ئەحمەدی قادر) ناسراو بە (ئەحە ڕەشی خونچە) کە لە بنەماڵەی مەلا قادری سۆفی بووە کە باسمان کردووە، توانیویەتی یەك شەو و ڕۆژ بە گۆرانی و دەنگە زوڵاڵەکەی هەڵپەڕکێ بگێڕێ، هەروەها (ئەحمەدی حمەی شا مراد) کە بە (ئەحە ڕەشی شا مراد) دواتریش بە حاجی خەلیفە ناسراوە، هەمان شێوەی ئەحە ڕەش یەکەم بووە، یان (محمودی حمەصالح) ناسراو بە خولەی حمەپاڵە، ئەم نازناوانە لە خۆشی دەنگ و ئاوازەکەی بووە، کە هەرگیز ماندو نەبووە و خەریکی ئاواز و گۆرانی دەستوری شارەزووری جۆراو جۆر بووە و هەمیشە قریوەی پێکەنین و گۆرانی تێکەڵ کردووە، ئەو نازناوەی وەرگرتووە، یان (کریم) ناسراو بە خەلیفە کریم و بەکریمی برای حمە صالح سورکەش بانگ دەکرا ئەمیش هەمان نزیکی دەکردەوە لە (محمود) و چەند شەو وڕۆژ شاییان دەگێڕا، (حسین ئەحمەد) ناسراو بە (ملا حسین) خاوەنی دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆش بوو کاتێك کە قورئانی دەخوێند وەك (عبدالباست) یان کە سۆزی دەروێشی دەکردخاوەنی دەنگێکی وابوو کە هەستی ڕادەکێشا، (ملا عبداللەی محمد) جگە لەوەی لە بانگ و سەڵادا، بەڕاستی خاوەنی دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆش و دڵگیر بوو، لێزانێکی زۆربەتواناش بوو لە دەف لێداندا و هەموو ئاوازێکی دەفی دەزانی لەکاتی زیکر و مەولود و هەر شتێکی تردا.

لە ئافرەتیشدا (مەنیجە مچە لەیلێ) خاوەنی یەك دەنگ و ئاواز و لاوانەوە بوو بەسەر کەسانی لاودا کە بمردایە سەدان بەیتی شین و شەپۆڕی دەوت و بەشی هەرەزۆری خۆی بە سەرپێی دەیوت وەك

دەڵێن مەلی بە ئاسمانەوە ڕادەگرت، لەبواری حەکیمی میللیشدا نەنکە مەجە کە باسمان کردووە لەسەروە باشترین مامان و حەکیمی منداڵان بوو، هەرچی خەڵکی ئەو دوو گوندە هەیە و دەکەونە سەرینی بونی ئەو ژنە، ئەو ناوکی بڕیون هەتا کۆچی دوایی کرد ڕوداووکارەساتێکی ناهەموار لە دەستی نەقەوماوە لەڕوی مامانی یەوە، حەکیمی میللی منداڵانیش بوو گەلێك نەخۆشی چاك کردۆتەوە ئەمە جگە لەوە کە سوننەتی منداڵانیشی دەکرد، چ کوڕ چ کچ بەتایبەت کچ، وێڕای ئەوەی کە تەون گێڕێکی بەتوانا بوو لە ماوەی چەند ڕۆژدا بەڕەیەکی مەترونیو بە سێ مەتری دروست دەکرد لە جۆرەهای ڕەنگ، ئەمە جگە لەوەی چ پیاوان چ ژنان ٧٥٪ خەڵکی لە سەرەتاوە هەتا شەستەکانی ئەم سەدەیەش، تەون گەڕی ، بڕین، دوورین، چنین، ڕستن، دروست کردنی (دەوار، ڕەشماڵ) دروست کردنی چیخ، دروست کردنی حەسیر، کلاشی خوری بۆ درەوان بەلام ئەم کارە کەم کەس دەیزانی، بۆ نمونە وەك(حمە فرج ڕەحمان، حمەصالح سورکە، سعیدی صالح، هتد) هەروەها دروست کردنی سەبەتە کە زۆرکەس دەیزانی، دروست کردنی خانوو، دارەڕا کردن بە شێوەی باش بۆ نمونە وەك(عبدالله محمد) ناسراو بە (مام عەودە) لە خانوو بەرەدا دەستی هەبووە، (محمود ئەحمەد) ناسراو بە (خولەی ئەحە وەروەر) کە لە دارە ڕادا زۆر شارەزا بووە، (محمد حسن) ناسراو بە (حەمەی مامە سەن) یان (حمەی حەسەن وەروەر) کە لە دروست کردنی خانوی نوێدا دەستی باشی هەبوو، (حمە امینی قالە عاسێ) (حاجی حمە ئەمین) لە چەخماخ سازی و فیشەك داگرتنەوە و باروت

دروست کردندا دەستی باڵای هەبووە، لە دروست کردن و تەرتیب کردنی عاسەڵانی جوت و کێڵگەدا (حمە صاڵحی مارف) ناسراو بە (حمە صاڵحی لولی) دەستی باڵای هەبووە، ئەمە جگە لە خوێندنەوەی شانامە و هۆنراوەکانی ئەو سەردەمە بە ئاوازەوە لەسەر دەستوری ئەو کاتە لەبەر وتویەتی کەڵەشاخ سازی لە بواری حەکیمی میللیدا و لەگەڵ خەساندن تایبەت بووبە (سعیدی صاڵح) ناسراو بە (سەعەی سالە قول قەوی) هەروەها (محمد صاڵح) ناسراو بە (حمەی مام صاڵح) بۆ کەڵ خەساندن و جێ پێ هڵگرتن، لە بواری هۆرەدا (محمد صاڵح) ناسراو بە (حمەی سالە قول قەوی، حمە ئاغا) کە خاوەنی دەنگ و ئاوازێکی زۆر دڵگیر بوو بۆ هۆرەی جاف، هەروەها لەو بوارەدا قالەی صاڵحی حمە سعید هۆرە زانێکی چاك بوو، خەڵکی ئاوایی ٤٠٪ لە بواری چیرۆکی گوێ ئاگردان، حیکایەت، مەتەڵدا زانا بوون، لە یاری هێلکە شکێنەدا کەس لە مام سمایلی نەبردۆتەوە کە ناسراوە بە سمە وورگە، هەڵبەت من نازناوەکانیان بۆ هەجوو ناڵێم بەڵکو بۆ ئەوە دەیانڵێم کە بەوە ناسراون و خۆشیان شانازیان بە نازناوەکانیانەوە کردووە، هەم بۆ زیندوو کردنەوەی کەلەپوری ئەم گوندە، من شتەکان وەك خۆیان باس دەکەم کە هەبوون. ..

لە ڕاوچیەتیدا حاجی حمەئەمینی قالە عاسێ، حمەی سعید ناسراو بە حمەبچکۆل چ ڕاوە باڵندە و چ ڕاوە ماسی، ڕاوی کەروێشك و ڕاوە تانجی (قادر محمد) ناسراو بە (قالەی حەمەی عارف).. لە ڕاوی تفەنگ چیەتی دا حمەئەمینی حمەسعیدی ڕەمەزان تاقانە تفەنگچی شارەزوور بووە.

لـه بـواری سوارچـاکی و چـالاکی و ئازایەتیـدا، حمـەی عـارف، خولـەی شـانە، (صـالح محمـد) ناسـراو بـە سـالەی خرامـان، علـی فـرج ئەرسەلان ناسراو بە عەلەسوری ئامە ووردە، لەبواری یاریزانی یـاری یە میلیەکاندا وەك داڵ داڵێن و سێ باز و چێوشەقێن و هتد، زۆرینەی خـەڵکی شـارەزاو زانـا بـوون بـەڵام هـەرە بەناوبانگـەکانی: زانـای ئـەم بوارە حمەی مام صالح، حمەی مارفی مچە لەیلێ، لەبواری قۆشمـەو خۆش گوزەرانیـدا لـە ئاهەنگـە شـەوانەکان و شـەوارەی منـداڵ بووندا، مــام سمایــل، کریمــی فــەقێ علــی، ئەحمــەدی قــادر (ئەحــە ڕەش) حمەصالح لول و کەسانی تر وەك شانۆنامەی میللی سەرپێیی دەوری شــانۆنامەیان بینیــوە بــۆ بەســەربردنی ئاهەنگــەکان و شــەوگار، بــۆ نمونـە: شـانۆی وەسـتا و مـەکۆ، کـە نـاتوانین ئـەم شـانۆگەریە لێـرەدا بنوسین، ڕاوە ژیژك و قەیتان و پشکۆ و هتد..، لەبواری قسەی قوت و قۆشمەیی و پینەچی یەتی دا، مامە قادر ناسـراو بـە (قالـە پینەچـی).. مامـە ڕەشـە ناسـراو بـە ڕەشـەی کوکـە، گـەلێ کـاری تـر هـەر لـە بـواری هونەریدا کە خەڵکی ئەم ئاواییە پەیڕەویان کردووە.

٢. داب و نەریتی کۆمەڵایەتی: لەم بوارەدا گەلێ کاری فۆلکلۆری و کەلــەپوری و داب و نــەریت هــەن کــە خــەڵکی ئــەم گونــدە لــە دێرزەمانەوە پەیڕەویان کردووە هەتا ئـەم دواییانـە هـەرمابوون لەسـەر شێوەیەکی کوردەواری ڕەسەن و بەپێز.. ئەو کارانەش وەك:



**یەمنی ئاشی خەرگە ڕەش بە ڕوخاوی**

**أ. ئـاش و ئـاش وەسـتاو ئاشـەوان، دیـارە ئاشـی ئـاو لەبـەردەم ئـاوێکی زۆردا کـە ئاوەکـە لـە بەرزیدایـە خانویـەك دروسـت کـراوە ئیـتر لەهـەرجۆرە ماددەیـەکی دروسـت کردنـی بـوێ زیـاتر لـە قسـڵ و جاڕو بووە هەرەکۆنەکان جاڕو بووە کە وەك لەسـەرەوە لـە باسـی بەربەنـدی یاسین تەپـە و سـی ئاشـە و بەربەنـدی سـەترەکەدا باسمـان کـردووە، بـەڵام ئەوانـەی دواتـر لـە قسڵ دروسـت کـراوە، ئـاش ئەگـەر ئاوەکـەی زۆربـێ دوو بەرداشـی بـۆ دادەنـرێ و گـەرنا یـەك بـەرداش، ئـاش سـێ ژوور یـان دوو ژوورە، تەویلـە بـۆ بـەرزە وولاخ و گـوێ درێـژ و هەرچـی بارەبەرەکانـە، ژووری هـاڕین، لـە تەنیـشتی ژووری هاڕینـەوە لەسـەر سەکۆیەك جێگایەك جیا کراوەتەوە بۆ حەوانـەوەی ئاشـەوان و بـاراش هاڕەکان، لێرەدا نامانـەوێ باسـی ئـاش بـە درێـژی بکـەین، بـەڵام شـتە**

گرنگـەکانی وەك کەلـەپور باسـی دەکـەین، یـەك لولـەی (بـۆری) لـە ئەسـتوری بەرمیلێکـدا بـە بـەرزایی سـەرەوەی ئاشـەکە بـۆ ژێـر بەرداشـەکان کـە ئـاوی جۆگەکـە بـەو لولـەدا بەتـەوژم تـەوەری ئـاش دەسوڕێنێتەوە بەرداش دەگەڕێ و باراش دەهاڕێ، بۆهەر بارێکی دە تەنەکـەیی سـێ کەپولـە(١٩) دەدرێ بـە خـاوەن ئـاش، ئـەو دەغڵـە کـە دەدرێ پێی دەڵێن مزە ئاش، باراش هاڕ بەشی ئاشەوان دەدات بە دیاری جا چ ئارد بێ یان دەغڵ بەو بەشە دەوترێ ئاردە بارە، جگە لەوە ئاشەوان لە (١١) کەپولە مزەی خاوەن ئاش کەپولەیەك لە کرێی کارەکـەی خـۆی دەبـات، دۆڵیانـەی ئـاش ئـەو شـوێنەیە کـە ئاوەکـە دەچێتە نـاو لولـەکان، لـە پشتی دۆڵیانـەوە شـەلالێك هەیـە کـە ئـاوە شکێنەی پێدەوترێ کەئاش باراشی تێدا نەما، ئاشەوان لەو شوێنەوە ئاوەکە بەردەداتـەوە و بە تـەوژم و کـەف بەسـەر و سپی و جوان لـەو بەرزاییەوە بەسەر ئەو باخ و بۆلاخەدا ئاو دەڕژێتە خوارەوە و دەیکاتە خوڕەو ناڵە هەردڵێ سەد دڵ حەیرانیەتی، ئیتر ئاشەوان دەکاتـە سـەر بەرزاییـەك و بـانگ دەکـات ئـاش بـەتاڵ واتـە ئاشـەکە چۆڵە، بـاراش هاڕەکـان بەپەلـە دەچـن و سـەرە دەگـرن، وولاخـەکان لـەبن دار سـەهەندەکاندا ئـالف دەدەن و خۆشـیان لەسـەر کـانی و ئاوەکـان دەحەوێنەوە و کولێرە ئاش دروست دەکرێ و دەبێتـە برا سـەیرانێك، کە جۆگەی ئاش پیس دەبێ ئاشـەوان بـە داسێکەوە پاکی دەکاتـەوە، بـەو کـارە دەوتـری ئاومـاڵ یـان جۆگـەماڵ، هـەر چـۆن جۆگـە کشتوکاڵییەکان کە پیس دەبن جۆگە ماڵ دەکرێن.

گەر ئاش لەکارکەوێت، ئاش وەستا بەردە ئاشەکان (بەرداش)

بــه چەکوشــی تایبــەت زبــر دەکاتــەوە دەوتــرێ (بــیران) تــەوەرە و ئامێرەکانی دەخاتەوە گەڕ.. ئاشەوان و ئاش وەستا بەناوبانگەکان ئەمانە بوون: حەسەن ئاغا کەپیاوێکی بالاًبەرزی ڕەقەکاری سورکار بووە دەستی گەلێ وەستایی تریشی هەبووە، وەك پێوەنی زنجیری بۆ بەرزە وولاًخ دروست کردووە وێرای ئاش و وەستایی، لالە ئەحمەد ناسراو بە (ئەحەشەل) و (مام فتاح) ناسراو بە فەتە کۆپان باشترین و دێرینترین و هەمیشەیی ترین ئاشەوان بوون.

ب. جەژنەکان

١. جەژنە ئاینیەکان وەك: جەژنی ڕەمەزان، جەژنی قوربان، جەژنی میعراج، جەژنی مەولود کەبە جەژنە مریشکە ناسراو بووە، لە جەژنی ڕەمەزاندا دوای مانگێك ڕۆژو و شەو نوێژ و تەراویح، شەوی جەژن بۆ مانگ گەڕاون و لێزانی چاك هەبووە کە مانگی دیوە، ئەگەر هەور بووبێ ئەوا لەشارستانەکان مشوری زانینی جەژنیان خواردووە کەسێك بە کۆلاًناندا گەڕاوە و بانگی کردووە بەیانی جەژنە و ئیتر سەلاً لە مزگەوت کراوە، بۆئەو مەبەستە دوکەس هەبوون بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی گوند، یەکەمیان مەلا عبداللە ی محمد کە باسمان کردووە، بەدەنگ و ئاوازەکەی بانگی خەڵکی دەکرد و دوایش سەلاًی دەکرد، وە دووەمیان مام سابیر کە ناسراو بوو بە (سابیری حەمەی ڕەحمان) چونکە حەمەی ڕەحمان ناوێك ئەو پیاوەی پێگەیاندووە، بە زاوا ڕێوی کچی خۆی داوەتێ و کردویەتی بە کوڕی خۆی، ئەو مام سابیرە زۆر قسە قوت و قسە خۆش و خێرۆمەند بووە.

ئەم ناوانەی خوارەوە ئەو لە سێ قۆناغی پێشتر و ناوەند و دواتر هەتا ڕاگوێزان ئەو کەسە دیاریانەن کە لە هەردوو گوندی بێستانسوردا ژیاون لەسەرەتای دەستپێکی دامەزراندنیەوە بۆ جارێکی تر:

حاجی ئەمین قەرەوەیس ڕیش سپی هۆز، قاسمی قەرەوەیس، حمەسەعید ڕەمەزان، کەرەمی کەرەم وەیس، سالەحی مستەفا، سورسوریەل / میرزا، مامە مەیکەچنگنی حەکیمی میللی، شێخ حسەینی شێخ ڕەحیم زاهید، حەمە وەروەر، فەقێ عەلی قاسم، کەریم فەقێ عەلی، محەمەد فەقێ عەلی، عەبدوڵای ئەحمەد فەقێ سالەح، بەکری حەمە سالەح، حەمەی ئەوڕەحمانی حەمە سالەح، کەریمە سور، فەتاح شانە، فەتاح عودە، کەریم دەروێش، قادر فارس، سەرحەد ئەوڕەحمان، کوێخا عارفی گزیر، مامە عەبدولڕەحمان پشدەری، ڕۆستەم کەریم مایلی، قایەری حەمەشەریف، حەمەی شامواد، سالەح حەمە سەعید، حەمەی فەقێ ئەحمەد، قادر ئەسعەد، عەزیز مەحموود سلێمان، مام یوسفی بەلجیقا، حەمە عەزیز ئەمین، عەبە بیشۆ، ئەوڕەحمان بەختیار بەگ، حسەین بەختیار بەگ، حەمە بەختیار بەگ، حەمە سالەح میر وەیس،قادری میر وەلی، عەلی فەرەج سلێمان، حەمە سالەح مارف لولی، لالە حەمە حەسەن، شێخ مارف شەل، حاجی عەلی، سەعید شامە، سەعەی باوکی حمە بچکۆل،ئەحمەدی کافەو سەعە مشکە، مەحموود گوڵ محەمەد، حەمەخانی حسەین، قادری زلێخا، ئەمین شەریف، کەریم ئەحمەد خاتوون، قالە پینەچی، حەمەسەعید ئەولا، شێخ محەمەد، حەمەئەمین قادر موراد خان، ئەوڕەحمان عەزیز، فەقێ سالەح، سالەح میر ئەحمەد، مستەفا عەزیز فارس، تاهیر عەزیز فارس، فەرەج ئەسلان، سابیر عەزیز فارس، حەمە تورکە، سەعدون عەربەتی، سالەح سۆڵەیی، مەلا کاکە حەمە، حەمەسەعید

حەمە ئەمین، رحیم عەبە، ئەحمەد وەروەر، حەسەن وەروەر، قادر ساڵەح، محێدینی نان، مامە وەیسە، ساڵەحی برای وەیسە، کەریم موتە، حەمەخان یەکەم موختار باپیری خولەی سەلە، محەمەدی فەقێ ئەحمەد، مەجید ساڵەح سلێمان، عەلی خڕە، غەریبە لاڵ، ئەوڕەحمان برای عەلی، مامە ڕەحمان پیوە، قادر عەربەتی، ئەوڕەحمان ئاغا، شێخ مستەفا بەرزنجی، سمایل ورگە، حەمە قلیان، خواکەرەمە شەل، حەمە ئەمین بەفراو، حەمە ساڵەح پاڵە، ساڵەح قول قەوی، وەسمان باوکی حەمە سەعید، ساڵەح سوڵەیی، مچە چەتە، قادر کوکە و ڕەشە دۆم، کەریم ئەمین، حەمەئەمین قادر شەریف، قادر باوکی سالەی ڕەوشە، حەمەی ئەوڕەحمان و حەمەی فەرەجی ڕەحمان، ئەحمەدی باوکی مەلا حسین، حەمە ئەمین کورسانی، سەعید باوکی حەمە بچکۆل، ئەحمەدی هاوسەری پەریزاد، ئەحمەدی باوکی مینەی خەجێ، حەمەی شا مراد، کەریمی ئەمین، حەمە ساڵەحی سلێمان، ساڵەح توڵەیی، حەمە ساڵەحی وەنەوش، حەمەی خام پەری، حەمە مینە دۆینە، قایەرو حەمەی قادر، خولەی قاسم، مام فەتاح، ئەول کەریمی حەمە ساڵەح، سالە پەری، ئەحمەد باوکی ئەول کاك، حەسەن سەقا، ئەحەی محە، ئەحە شەل، مام ساڵەح گەرمیانی، عەلی حەمە سەعید، سەیدەی دەف ژەن، حەمەی عارف گزیر، ئەم ناوانەی سەرەوە لە دوو قۆناغی پێشینەوەو پێشینە تردا سەردەمی ڕیش سپی یەتی حاجی ئەمین و فەقێ عەلی دا لە هەردوو بێستانسور، بەگوێرەی تەمەن کۆچی دواییان .

ئەم ناوانانەی خوارەوە لە دووقۆناغی ناوەندی و تا ڕاگوێزان بە گوێرەی تەمەن و هەندێکیان کۆچی دواییان کردووە، لە سەردەمی ڕیشسپییەتی عومەری فەقێ عەلی و ئەبو بەکر عومەردا:

بێستانسوری گەورە

عومەری فەقێ عەلی و ئەبوبەكرو بورهان و عەلی كوڕی، ئەحمەدی فەقێ عەلی و عەبدولحامی و ئەنوەر و كوڕانی تری.

قالەی حەمە عارف و سالّەحی حەمە عارف و حەمەی پەریزاد، مەحمودی پەریزاد، حەمە ڕەحیم حەمەی كەریمی یارە و عەبە بینۆ، حەمەی مام سالّەح، قادری مام سالّەح و مام هادی، توفیق ئالّتون و كوڕانی، عەزەو مەلا سالّەح و ئەحمەدی خونچەو كوڕانیان، قالە گودیلە و مەحموی حەسەن سەقا، حەمە ئەمین حەمە سەعید و كوڕانی، حەمەی سالّەح سوركە، خەلیفە كەریم و كوڕانیان مەحموی حەمە وەروەر، حەمەو ئەحمەدی حەسەن وەروەر ،قایەری سالّەحی حەمە سەعید، مەحموی سەلەو، حەمەو ئەحەی میمكە سەلەو مەلا عەبدولاّ و عەبدوڕەحمانی محەمەد، حەمە حسێن و ئەولقادر، كەریم كافەو ئەمینی قادرو ئەحمەدی قادرو عەلی كوڕی، ئەولكەریمی بۆڕە، مەجیە خەوە، ڕەشەی حەكە، حەمەو ئەحمەدی مام سەلیم، حەمە كیبرە، حەمە ئەمینی حەمە عەلی و عەزەی حەمە عەلی،حسن ئاغا، توفیقی حەمە ئەمین، سالّەحی ڕەوشە، حەمە بچكۆل، محمود و حەمەی حەلاو، حەمەی حسەین، حەمەی ڕەعە ، ئەولڕەحمانی برای عەلی ئەحمەدی عەولڕەحمان و براكانی و خولەی شانە، حەسەنی سالّەح سۆلّەیی و براكانی، حاجی ئەسعەد، ئەولكەریمی حەمەی سەلّتە، مام سعید و كوڕەكانی، ئەحەی شاموراد و براو كوڕەكانی، و سەعەی سالّەح قول قەوی و حەمەی سالّەح قول قەوی و كوڕەكانیان، حەمەی سەعیدی وەسمان و حەمە ڕەشید قادر وەسمان مەلا حسێن و كوڕەكانی عەلی و ڕەشید كەریم ، حەمەی ڕەحمان و حەمەی فەرەجی ڕەحمان سابیری حەمەی ڕەحمان و كوڕانیان، كوڕانی حەمەی كەریم و

کوڕەکانیـان و سـالەی خـەرامان کوڕانیـان، ئەحمـەدی شـا سـەلەم و کوڕەکانی، مارفی مچە لەیلیٚ و کوڕەکانی، مام ڕەشید، حەمە خڕەو عەلە سوور و ڕۆستەمی وەنەوش، سەعە فاتە، حاجی حەسەنی حەمە خان و حاجی مەجید، ئەحەی حەمە و حەمەی محەو کوڕانیان، عەلی ئێرانی، حەمە ئەمین چەنی مەنی، حەمەمینی میمکە گوڵخاس، حەمەمینی خەجیٚ، ئەحەی ئایشان، محمود و جەباری ڕەوشە، حەمەی عارف، حەمەمینی قالە عاسیٚ، ئەحمەدی کوڕی و کوڕانیان، ئەولکاکی ئەحمەد، مەلای فەرەج و ساڵح کەنۆ، خەلیفە حەمە مورداو کوڕەکانیان، عەلی کونجە ، فەرەج کەڵە شێر، حەمەی مەلا قادر و براکانیان، ڕەشەی خەلیفەو حەمەی فەرەج، ڕەشە شەل و هەندیٚ خزمانیان، حەمە کەریمی ڕوغزایی و مامە حەمە و حسەینە شەل، حەمەی فرج (ج)، حمەی مـلا قـادر و حمـەی رەعـە ، ئەورەحمان و ئەورەحیم و حمە قوچ ئێرانی و ئەورەحمانی باوکی حمە قیرە چەند کەسانی تر.

عەبەلە، کاکە رەحیم شێخ حسین،مام سمایل، مام غەفوور، ئەحمەد و عەبە کۆیی، عەبەی قایەرو حەمەی قایەر، لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستدا قوتابخانەی سەرەتایی لە گوندی بێستانسور کرایەوە و سەرەتا لە خانووەکانی ئاغادا دەستی پیٚ کردو دوایی قوتابخانەی تایبەتی بۆ کرایەوە و یەکەم مامۆستای ئەم گوندە مامۆستا مەحمود محمەدی ئەولی بوو بۆ کوڕان دوایی ئەویش مامۆستا بورهان نوری و مامۆستا وازح چەند مامۆستایەکی تر کە ئەو سیانەی سەرەتایان هونەرمەند و ڕۆشنبیرو وولاٚت پەروەرێکی مەزن بوون، بۆ کچانیش یەکەم مامۆستا مامۆستا نەسرینە سوور بوو کە خێزانی مامۆستا وازح بوو: ماڵیان لەم گوندە بووە.

بێستانسوری بچووك

عەلی قادرو حەمەی ساڵەح و کوڕەکانیان و عەزە کەڕ، ئەحە هەتیوو کوڕانی ئەحەی ئەفەو حەمەی ئەفەو ئەحە کەڵووڕ، حاجی قازی و حاجی قادر و حەمە غەریب و کوڕانیان، حەمەی فەرەج، حەمەی ناوە، ئەمینی خواڕەحم ، بلە قەڵەو کەریم و مەحموودی حەمەی سورەك، عەبدوڵڵای مستەفا و کوڕانیان، حەمەی سەمین، حەمە ئەمین زامار و قالەی فارس .حمە امین خوارەحم.

لە ڕووی شۆڕش و خەبات و قوربانی دانەوە هەڵبەتە نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە لەساڵی ١٩٧٤ ڕژێمی فاشی بەعس بە لیوایەك سەرباز و گەلە گورگە خۆفرۆشەکانەوە لەگەڵ مەلا بانگدانی بەیانیدا هەڵی کوتایە سەر ( گوندی بێستانسور) و چەند کێڵگەو ماڵ و عەماری زەخیرەو خانوو بەرەیان سووتان چەندین کەسیان کوشت، پۆلێك شەهید چووە سەر شەهیدەکانی کوردستان وە کۆمەڵێکی زۆریان لە خەڵکی ئاوایی گرت بەچاو بەستراوەیی سەرونگوم کران هەتا چەند ڕۆژێك کاتێك سەریان هەڵدایەوە و بەربوون پەریشان بوون کەسێکیان سەرو نگون بووە، نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کە ئەوە دووەم پەلامارو کوشتن و بڕین بووە بۆ سەر ئەم گوندە، هەڵبەت ئەم هێرشانەی ڕژێم بۆ سەر گوندی بێستانسور لەبەر ئەوە بوو کە ئەم گوندە زنجیرەی بەیەك گەیاندنی شارو شاخ بوە بۆ کاروبار لەڕووی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیشەوە چونکە بێستانسور ببوە میوانخانەیەك بۆ هەڵهاتووەکان و جێگەیەکیش بوە کانگای ئاڵوگۆڕی ئابوری.بەڵگەی ئەم ڕاستیانە بڕوانە کتێبی حسێن عارف ساڵێك لەتەمەن ل٨٥

ناوی ئەو مامۆستا ئاینی یانەی لە گوندی بێستان سور بوون

مەلا کاکە حەمە

مەلا عبدالرحمان - بێلوت

مەلا شێخ تۆفیق

مەلا عبدالله هجیج

مەلا شێخ عسمان دۆڵ پەمویی

مەلا قادر پێنجوێنی

مەلا عبدالله

مەلا شێخ محمد بەرزنجی

مەلا شێخ محمد خەوتاش

مەلا أحمد زێوێیی

مەلا محمد جوزەلە

مەلا محمد شەمەیی

مەلا عمر حمە رەزا مۆریاسی

مەلا احمد قسرتی

مەلا علی گێڵەرەیی

مەلا صاڵح

مەلا خالید ئاغجڵەرەی

مەلا عبدالله حمە نادر

مەلا خالید پەریەرۆیی

**بێستان سوور و گەڕەکەکانی ئەم گوندە**

بێستان سوور لە دوو گوند پێك هاتووە گوندی بێستان سووری بچوك (بێستان سووری کۆن) لەسەر دەستی حاجی (ئەمین کریم قەرەوەیس) لەسەدەی (١٧) ز بنیات نراوە، بێستان سووری گەورە لەسەر دەستی (فقێ علی قاسم کریم قەرەوەیس) لە سەدەی (١٨)ز بنیات نراوە.

بێستان سووری بچوك دەکەوێتە لێواری گۆمەڕەش لە دوو گەڕەکی سەرەکی پێکدێت یەکەمیان گەڕەکی (علی صالح) ئەمانە لە هۆزی عێل بەگین.

دووەمیان گەڕەکی حاجی قازی ئەمانە لە هۆزی کەماڵەیی جافن، لەسەردەستی (عمری فقێ علی) نیشتەجێ کراون زۆر نزیك بوون لە عمری فقێ علی بەدەم ئیش و کاری خۆشی و ناخۆشی یەوە بوون هەر شتێکیان بوایە ڕاوێژیان بە (کوێخا عمر) دەکرد، ئەو سەردەمە کە پێکهاتبوون لەم بنەماڵانە (حاجی قازی.حمە امین فرج.عبدالله کریم.برایم قەلەو.حاجی حمەمین.حاجی قادر -قادری فارس).

گوندی بێستان سووری بچوك دەکەوێتە بەینی گردی گۆمە ڕەش (قەڵای کچ) و (گردی سەراکۆن).

بەری ڕۆژهەڵاتیش گوندی بێستان سووری گەورەیە کەلە دوو گەڕەکی سەرەکی پێکهاتووە و ئەو دوو گەڕەکەش دابەش دەبن بە پێنج گەڕەکی بچوکەوە، گەڕەکی یەکەمی سەرەکی، گەڕەکی حاجی ئەمینی گەورەیە، بەری ڕۆژئاوایە، گەڕەکی دووەمی سەرەکیش

گەڕەکی (ئانی یە) کەبەری ڕۆژهەڵاتی گوندەکەیە، لە نێوان ئەم دوو گەڕەکەدا ڕێگەیەکی سەرەکی کەبەشی کۆتایی ڕێگای (بێکەسەیە) لە بەری باکوری گوندەکەوە شۆڕبۆتەوە بۆ بەری باشور بەلای مزگەوت و گۆمەکە کەناومان هێناون.

گەڕەکە بچوکەکانی ناو ئەم دوو گەڕەکەش، بەری ڕۆژئاوا گەڕەکی (دۆڵەکە) کە ڕیزەماڵێکە لە باکوری گوندەکەوە شۆڕدەبێتەوە بۆ باشوری گوندەکە، لەسەر لێواری بەشی کۆتایی دۆڵی دوو دۆڵەکە کەباسمان کردووە، ئەم گەڕەکە ڕووی کردۆتە ڕۆژئاوا.

گەڕەکی دووهەم گەڕەکی ناوەڕاستی یەکەم کە ئەمە گەڕەکێکی تێکەڵاون چواردەوری دراوە لە گۆڕەپانێك کە پەچەی ڕەشە وولاخی هاولاتیانی گەڕەکەکەیە کە ناسراوە بە پەچەی بەردەم ماڵی (حمە ئەمینی حمە علی)، ئەم گەڕەکە دەگاتە سەر ڕێگەی ناوەڕاست کەناومان بردووە.

گەڕەکی ناوەڕاستی دووهەم دەکەوێتە بەری ڕۆژهەلاتی ڕێگەی ناوبراو، ئەم گەڕەکەش گەڕەکێکی تێکەڵاوە چواردەوری داوە لە گۆڕەپانێك کە پەچەی هاوینەی ڕەشە وولاخی گەڕەکەکەیە، بە پەچەی بەردەم ماڵی (ئەحمەدی شاسەلەم) ناسراوە.

گەڕەکی (ئاغا)، ئەمەش گەڕەکێکی تێکەڵاوە شێوەیەکی سێگۆشەیی گرتۆتەخۆ لە بەری ڕۆژهەڵاتی گوندەکەدا.

گەڕەکی گۆمەکە، ئەمەش ڕیزە ماڵێکە لە بەری باشووری گوندەکەدا لەسەر گۆمەکە کە ڕووەو قیبلەیە، لە گردۆلکەکەی تەنیشتی مزگەوتی حاجی ئەمینەوە دەست پێدەکات بۆ گردۆلکەکەی

دەسپێكی گەڕەكی ئاغا تەنیشتی ماڵی حەمە ئەمینی حەمە سعید، بەرامبەر بەم گەڕەكە لە نێوانی دەستپێكی جۆگەی كاژاو و كانی (حەمەی مام كریم)دا كە ناومان هێناون گۆڕەپانێك هەبوو شوێنی هەڵپەڕكێ و شایی و بۆنەكان بوو، هەروەها شەتڵگای توتن و سەوزەواتی گوندەكە بوو، لە كۆتایی ئەم گۆڕەپانەدا پردە دارینە دێرینەكەی سەر جۆگەی كاژاو و گەڕەكی ئاغا و كانی باینجانی پێكەوە بەستووە كە ناومان هێناون.

لە دامێنی پردەكەشەوە شەلگەی كەنەسوورە كە ئاودێری زستانەی جۆكەی كاژاو بوو، شوێنی خشت بڕینی خانووبەرەی گوندەكەبوو.

لە باكوری گەڕەكی ناوەڕاستی دووهەمەوە (گڵەجانەكە) هەبوو كە بۆ تەڕاو و سواغی خانووبەرەی گوندەكە خۆڵی پاڵفتەیان لێوە دەهێنا، هەروەها مەشكەیان لێ دادەگرتەوە دوای خاڵی كردنی بۆ قاندانی بە دوكەڵ، لەسەروی ئەم گڵەجانەشەوە گۆڕەپانێك هەبوو كە بە (پشتەكە) ناسرابوو كە شوێنی یاریە فۆلكلۆریەكانی لاوانی گوندەكە بوو لە كاتی بێ ئیشی دا، شەوانەی مانگە شەویش منالان یاریان تیا دەكرد، هەربۆیە ئەم یاریانەش گۆڕەپانی قەبرسانی بەرامبەرەكە كە ناومان بردوو بەكار دەبران.

لاپاڵی نیمچە چیاكەی بێستان سوور كەبە (یاڵەكە) ناسراوە شوێنی ڕەشماڵی بەهارانی گوندەكە بوو وەك گوندێكی دەوار نشین.
لە نێوانی ڕێگای بێكەسەو دۆڵی دوو دۆڵەكەدا كەناومان بردوون بە دەشتی بێكەسە ناودەبراو شوێنی گوندە كەپرینەی گوندەكە بوو لە

هاوینان‌دا کەلە مێژوودا ساڵێك کارەساتی بەسەردا هاتووە و لە دواوە باسمان کردووە. لەم دواییانەشدا سەردەمی ڕاگوێزانی گوندەکان ئەو کانی ئاسەوارانەی کە باسمان کردوون بەبۆنەی پرۆژەیەکی ئاوەوە ڕژێم هەمووی شێواند بەسەر یەکدا.

هەربۆ مەبەستی پرۆژەی ئاوەکەش لەڕوی پشتەکەوە کە ناومان بردووە هەرلەدۆڵی دوو دۆڵەکەوە بەنداوێکی خۆڵین بەنیوەگۆیی لە ڕۆژئاواوە کشاوە بۆ باشوری ڕۆژهەڵاتی گوندەکە بۆ بەربەست کردنی لافاوی دوودۆڵەکە و ڕێگای دەشتی بێکەسە هەتا بچێتە سەر چەماوەکانی کە ناومان بردوون. لە دامێنی گوندە کەپرینەکەی کە باسمان کردووە گۆڕەپانی چاڵەکان بوو کە بۆ هەمارکردنی زیادەی دەغڵ و دانی جوتیارانی گوندەکە بوو، دەکەوێتە بەری ڕۆژئاوای بێکەسە.

بەرامبەریشی لەبەری ڕۆژهەڵاتەوە کێڵکەی هازەکان بوو کە بە خۆڕسکی و سروشتی دووجۆر هاز سەری ئێرەیان لە باراندا دادەپۆشی، چەشنی یەکەمیان هازە گولانە یان (هازە خوگەبوو) کەلە فارسی دا بە بەراز دەوترێ خوگ بۆیە پیازی ئەم هازە چاکترین خواردنی بەرازەکان بوو کە شەوانە لە چەمەکانەوە بە قاوەقاو دەهاتن و بە شفرەکانیان زەوی یەکەیان دەکێڵاو ئەو پیازەیان دەخوارد، ئەم هازە گەڵاکەی مۆر بوو چەشنی گوێی ئاژەڵ بوو، میلێکی مۆری جوانی دەردەکرد کەدەقاودەق لە میل چیوك و کلدانی کل و کلتور دەچوو.

چەشنی دووەمی هازەکان بە (هازەپەلکە) ناودەبرا گەڵاکەی هەر لە سپێناغ دەچوو، کە بۆ خواردنێکی پزیشکی چێشتێکی خۆشی پێلێدەنرا لەگەڵ مێوژو چل چەشن میوەی ووشك کراوەدا کەپێی دەووترا چل دەرمانە کە دار فرۆشەکان لە شارباژێرەوە دەهاتن بە بار لەم هازەیان دەبردەوە بۆ خۆیان وبۆ فرۆشتن، چونکە لەوێ باش لە دروستکردنی ئەم چێشتە دەزانن.

لە بەرامبەری ئاوایی سێ کیلۆمەتری بەری ڕۆژهەڵات چیای چەناغچیانە لەوێ بناری دارەکە و هەندێ دۆڵ و دۆڵی چاڵەپان هەن کە باسمان کردوون، ئێرە لەبەهاراندا جێگای هێنانی کنگر بوو بۆ کولاندن و لە پایزانیشدا بۆ تەپاڵە و کۆتەرە خرنوکە کە بۆ ئاگرکردنەوە بوو، کە دەستە کچان دەچوون بۆ ئەم شوێنە تا دەچوون و دەهاتنەوە بەدەم گۆرانی (بەیت و بالۆرەی گوڵناز و کوڕەشوان)ەوە کە ئەو شعرانە هەتا پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لە ناوچەکەدا باوبوو بنەمای ئەم بەیتە ڕوداوەکانی دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ئەم گوندە و لە دواوە باسمان کردووە.

تێبینی

– حاجی ئەمین ریشسپی ئیل بەگی جاف (ئالی بەگی) کە لە هەشت سەدەکاندا چوە بۆ حەج ماوەیەکی زۆری پێچوە، قورئانێکی زۆر گەورەی هێناوە کە بەخەتی زەرکەفی نوسراوە، ئەو قورئانە دەساو دەست ماوە کە خەڵکی سوێندیان دەخوارد دەیانوت بە قورئانەکەی حاجی ئەمین.

– ئەم خێزانە باڵەخانەیەکیان لەسەر تەلارسازی بابانی لەگەڵ مزگەوتی ناوبراودا بە تاق و نیوتاق و تەختە بەنگ دروست کردوە، بە ژێر زەمینەکەوە سێ قات بوە، دیوارەکانی بە خشتی کاڵ دروست کراوە و مەترێك پان بوە بەیناو بەین لە چینی دیوارەکەدا بە تێلاّی رەنگاورەنگ ریزبەند کراوە، وەستا سنەیەکان وتویانە ئەگەر رەنگ نەکرێن ئەوا کرم لێی دەدات . لەپاش تەواو بونی بیناکە تولە رەش مارێك دەردەکەوێت کە بە ئیسراحەت هەر لەو رۆژەوە بەناو خێزانەکان و سەر سفرەکاندا دێت و دەچێت بێ ئەوەی کەس دەستی بۆ ببات و ئەویش هیچ زەرەری هەبێت،ئەو مارە نەوە بە نەوە بە هەمان سەربەستی هەر مابوو نەیان دەهێشت کەس دەستی بۆ ببات، بەقەد دەستەکێکی گەورەی لێهاتبوو، بەندە نووسەر بەچاوی خۆم بینیومە بە باڵەخانەکەدا شۆربۆتەوە هەتا سەرەتای پەنجاکان، پاشان کەس نەیزانی لەپڕ دیار نەما (لە کوردەواریدا دەڵێن کە مار زۆر گەورە بوو هەڵیدەکێشنەوە بۆ ئاسمان) ئیتر ئەمە بایەخی هەیە یان نا خەڵك وای دەوت، دەیان ووت ئەم مارە فریشتەیە، سەیرەکەش لەوەدا بوو بە نەمانی ئەو مارە دوای سێ مانگ ئەو تەلارو باڵەخانەیە روخاو لەگەڵ زەویدا تەخت بوو، باش بوو زیانی گیانی لێ نەکەوتەوە.

– بەردەرکی سەرای ئێستا هەتا دەگاتە خانوەکانی حەمەی ئەورەحمان ئاغا بە موڵکیی هی بنەماڵەی حاجی ئەمین بوە و پێشکەشی کردوە بە میرەکانی بابان و حەمەی ئەورەحمان ئاغا ئەمە لێکدانەوەی زۆرە بەلاّم ئێمە بەوەندە کۆتای پێ دەهێنین.

– شاعیری گەورەی کورد (عیل بەگی جاف) کە شاعیرێکی

پێشبینی کار بوه شانی داوه له شانی حافیزی شیرازی ، ئەم شاعیره له هۆزی ئالی بەگی یەو له بنەماڵەی حاجی ئەمین بوه.

گژوگیای پزیشکی و خۆڕسکەکانی ئەم گونده

ئەم گونده له بەهاراندا گوندێکی سەر سەوز و جوانه که به هاوینەهەوار دەژمێردرێ له ناوچەکەدا هەرچەنده بەهارەکەی کەمێك کورته هەروەها پایزەکەشی کەمێك کورته، بەلاَم وەرزێکی خۆشه، هەموو جۆره گژوگیا و درك و داڵێکی کوردستان له سروشتی و پزیشکی و ناپزیشکی تێدابەدی دەکرێت، که هەندێك لەوانه له خوارەوه باسی دەکەین:

١. گوڵه خۆڕسکەکان (گوڵاڵه - گوڵه نیسان - گوڵه مەشقانه: که چەقیلەشی پێ دەڵێن مرەکەبی لێدروست دەکرێت- سالمه: که پیازەکەی بۆ هەوێنی دۆندرمه دەشێت - چاوپشیله: کەبۆ نەخۆشی دڵ باشه - گوڵه هێرۆ: بۆ نەخۆشی کۆکەی منداڵ باشه - حاجیله: که منداڵان دەیخەنه بەر خۆر وەك سەعات دەسوڕێتەوه یاری پێدەکەن - گوڵه زەردەکان: که چەشنێکیان وەك جوزەله منداڵ بەکاری دەهێنن - شیرین شاتەڕه: که گوڵەکەی بۆ برین باشه - نیسکۆڵه: که گوڵێکی سور و مۆری وورد و جوانه - گوڵه سوره: که گوڵێکی سوری وورده وەنەوشه - لاولاوی کێوی: که مالوێنچەشی پێدەووترێ - چەق چەقه و گوڵه گۆزروان ،خەشخاشه (چاران چەقیلەشی پێدەوترێت) ).

٢. گژوگیای پزیشکی یه خۆراکیەکان: (کنگر - گلك - تۆڵەکه - گێلاخه - کوڵ: کەبۆ شۆربای دۆخەوا بەکاردێت - کنیواڵ: که

سیره کێویلەشی پێدەوترێت ، پێ قەلە ، هاز: کە بۆ چێشتی چل دەرمانە بەکاردێت - کوزەڵە - بەنۆڵە - پونگە - چاوبازە - خەرتەلە - ڕازیانە - شویت - قارچك: کە سێ چەشنە أ. قارچکە گولانە ٪۱۰۰ زەهراویە، ب. قارچکە بیانە کەلەسەر قەدی درەختی بی سەوز دەبێت چەشنێکی پاك و خۆشە، ج. قارچکە چەتری کە لە جێی خەرمان و ناوچاڵی گەنمی دەرهاتوو دەڕوێت کە هەورە بروسکەی بەهار لێی دەدات کە ئەم جۆرەش خۆشە بەڵام هەندێکیان ژەهراوین دەبێت کەسێکی لێزان جیایان بکاتەوە).

۳. بەروبومە بەراو و دێمیەکان: (گەنم - جۆ - نۆك - نیسك - پاقلە - کەتان - ڕەشکە - ترۆزی - کاڵەك - شوتی - کونجی - گوش - توتن - مەرەزە - لۆکە - گوڵەبەڕۆژە - تەماتە - باینجان - بیبەر - فستق عەبید - بامێ - کولەکە - پیاز. شێلم).

(کارەساتێك لە بیرەوەریەکانی مێژوودا کە لە یاد ناچێت)

سەردەم سەردەمی دواکۆتاییەکانی جەنگی جیهانی دووهەم بوو، نەهامەتی باڵی کێشابوو بەسەر دونیادا، ئەگەرچی جەنگ وەك بەربەرەکانی نەگەیشتبووە ئەم ناوچەیە بەڵام وەك ئابلۆقەی ئابووری و کوێرەوەری ئێرەشی گرتبووەوە هەروەك شوێنانی بەرەی جەنگ، زەمەن سەرەتای چلەکانی سەدەی پێشوو بوو، ناوچەکە بەشێك بوو لە شارەزوور، بەپەرۆشەوە کشتیارانی ناوچەکە قۆڵی کاریان لێ هەڵکردبوو بۆ بەربەستکردنی نەهامەتیەکە، سەرجەم کێڵگەکانی دەڤەر داچێنرابوون بە کشتوکاڵی (گەنم، جۆ، کەتان، شمڵی و

ڕەشکە، نۆك، کاڵەك، ترۆزی و هیترا)، ئەمە کاتێك بوو کەخەریك بوو بەهار کۆتایی دەهات و سەرەتای دروینە دەستی پێدەکرد، هەتا چاو بڕکات دەشت و دەر وەك قەتران ڕەش دەچۆوە بەمەزراکانی (گەنمی ڕەش داس) ئەمە جۆرێك بوو لە گەنمی ئەو سەردەمە، قەڵەوو بەپیت و بەرپێـــژەن، بەیناوبـــەینیش دەشـــت زەردی دەکـــردەوە بـــە (گەنمـــە زەرتکە) کە ئەویش جۆرێکی گەنم بوو شانی دەدا لە ڕەش داسەکە، لاپاڵەکانیش سپی دەچونەوە بەمەزرای جۆ، ئەوە ئیتر مەزراکانی تر کـە باسمـانکردووە شـین دەچـونەوە و بـەیناو بـەین بـەیارەکان[٢٠] دیاربوون و سەریان بەپووش گیرابوو وە بەیناوبەینیش زەوی وەرد بڕرابوو بۆ وەرزی داهاتوو.

گونـدەکانی ئـەم دەڤـەرە (عەربـەتی خـواروو، باریکـە، قڕاڵـی، خرابـە، هـەردوو بێستان سـوور) کێڵگـەکانی ئـەم دەڤـەرە کـە (پەچـە بەرزی نێوان قڕاڵی و باریکە، دەشتی بەری عەربەت، دەشتی لاباریکە، دەشـتی شـێخ لالـە، بنـاری ئـەم دیـو دیـوی بیـاڵی بەرزاییەکانـی عەربەت.بێستان سوور، دەشتاییەکانی سێگۆشەی نێوان یاڵەکان و دوو دۆڵە، دەشتی بێکەسە، دەشتی بەری خرابە، دەشتی بیرەکانی ئاغا ( کە ناسراو بە پشتەکە)، دەشتی گێڵە لەڕ (کە دوایی بوو بە گێڵـەرە)، دەشتی زریسکەکە، دەشتی کێڵە سپی و گۆری گەوری، ڕەقەی زێڕینجۆ و لاپاڵەکانی یاڵەکانی بە بالأنتران کە بە واتای بەردە زەبەلاحەکان دێت وە یاڵی چناخچیان، کە بە بەری دارەکەو (چاڵە پانیش) ناسراون. ..

کێڵگـەکان زۆر هیـوا بـەخش بـوون، سـاڵەکەی بەڕاسـتی سـاڵی بەرووبووم بوو و کشتیارانی دەڤەرەکە زۆر بەپەرۆشەوە دەیانڕوانـی یـە بـەروبوومی ئـەو ساڵە و هیوایـان تـێ بڕیبـوو کەپێویـستیەکانیان گشت جێ بەجێ دەبێت و نەهامـەتی ئابڵووقە ئابووریەکەش لـە بەیـن دەبات، بۆیە زۆر بەدڵخۆشییەوە ئەوەی کە ڕووبەری کێڵگەکانیان کـەم بوو جل وبـەرگ و کەرەستـەی دروێنـەیان ئامادە کردبوو وەك (کڵاوی لباد، سەربەرگی لباد، شەڕواڵ و جلی سەر خەرمان، کڵاشی دۆمی کە جۆرێکە لە کڵاشـی کوردەواری، کەرەستـەکانیش وەك داس و هەسـان و جەوەنەی ئاوو (قەیناغ) جۆرە دەستکێشێکە کە لە مەعدەن دروست کراوە سەپان دەیکاتە دەستی بۆئەوەی قەڵاس و دڕك دەستی نەبات)، خـاوەنی ڕووبـەری کێڵگـە گـەورەکانیش (شـەرت و بڕەیـان ) لەگـەڵ سـەپان و وەرزێرەکـانی کـە لـە دەشـتی گەرمیانـەوە هـاتبوون بـۆ پەیداکردنی ڕۆزی یان لە دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە هاتبوون، ئەوە کۆڵکێشەکانیش لەوێوە ڕاوەستن کە ئافرەتی گوندەکان بوون لـە سەرەتاوە بۆ دروستکردنی شارا کە دەغڵ و دانـەکان لـە جاڕەکەدا لـە شێوەی هێلکەییدا کۆدەکرێنەوە پاش بەینێك دەگوێنرێنەوە خـەرمان، ئەمـە وێـڕای بەروبوومـە بەراوییـەکانیش دڵخۆشـکەر بـوون لەگـەڵ ئاژەڵداری.

ئیـتر ئـەو خەڵکـە هەنـدێکیان لێـرە و لـەوێ چـووبوونە سەرەوکاری دروێنە، ئەوەودواشی ئامادەباشـی بـوون زۆر بەدڵخۆشـی جوانـی بـەروبوومی ساڵەکەوە.. ئـەوەمان لـە یـاد نەچێت کـە سـەردەم دوور لە چارەسازی نەخۆشی و قەڵاچۆی مێرووە زیانـەوەرەکان بـوو،

ئـەوکات دەبـوو خەڵکەکـە بـزانن چـۆن لەگـەڵ بـارودۆخی سروشـتدا مامەڵە بکەن، بۆیە  بە زستانان کە دووربوو لـە بوونـی ئـەو مێروانـە لـە خانووەکانـدا دەژیـان و کـە بـەهاریش دەهـات وورده وورده کێـچ و مێـروو مێـشووله و مۆریانـە و مـشك و دووپـشك و تەنانـەت ماریـش سەریان هەڵدەدا، بەتایبەت مێشوولەی مەلاریا لەو گوندانەی کە نزیك کێڵگەی مەرەزەکان بوون، بۆیە دەیانگواستەوه بناری یاڵەکان و لـەوێ دەوارنـشین دەبـوون کـە بـەرەو کۆتـایی بـەهاریش دەچـون دنیـا گـەرم دەبوو، دەواریـش گـەرم بـوو دەچوونە پێدەشتێکی هـەواگرو کـەپریان دروست دەکرد و تیایدا دەژیان.

هەڵبـەت لـە دەشـتی بێکەسـەدا نزیکـەی (٢٥٠) مـاڵ لـە گونـده کەپرینەکەیانـدا دەژیـان، وەك ووتمـان بـەرەو کۆتاییـەکانی بەهار بـوو تـازه چـووبونه کـەپران و هێـشتا چـواردەوریان نـەبوو بـووه ڕوتـەن (چـونکه هێـشتا هاتوچـۆی زۆری مـرۆڤ و ئاژەڵـەکان ڕووی نـەدابوو)، لێرەدا باسی ماڵێك دێنینەوه باس کە هەر سەرەتای چونی کـەپرانیان شــەو لــەناوێك دووپــشکه ڕەشــەیەك دەدات بــە کــچێکی نزیــك دە ساڵانیانەوه کچەکە تا ڕۆژ دەبێتـەوه گیان لەدەست دەدات، ئـەو ماڵـە وێڕای کەمێك ئاژەڵداری و کشتیاری پیاوەکە بەئاڵ و وێڵـەوه خەریك دەبێت کە ئەو سەردەمە کڕین و فرۆشتن بـەزۆری (کاڵا بـە کاڵا بـووه) بـەڵام ئـاڵ و وێـڵ (کاڵا بـەپاره بـوە) ئـەو پیـاوه لەگـەڵ چـەند خزمێکـی خۆی بە باری وولاغ کە سەردەمی ئامێر زۆر لاواز بـووه، خـوری و زۆر شتی تریان لە باشوورەوه بردوه بۆ ڕۆژهەڵات، لەوێشەوه چاو و خەنە و مشکی و هەندێجار مافورو ئەوشتانەیان هێناوه بۆ ئەمدیو.

کە پێدەچێ خاوەنی ڕێژەیەك پارە بووبن چونکە کارەکانیان بەدراو بەرجەستە کردوە ئالەو سەردەمەشدا چونکە وەك ووتمان سەردەمی جەنگ بوو وە بەرپرسیارەتیش کەم بووە بۆیە دزو درۆزن لەناو چاودا دەمیان فڕاندووە، جا بۆیە دەڵێن ئەوەی لەو سەردەمەدا شتێك پارەی هەبووبێ لەژێر کۆڵەکەی کەپرەکاندا دایان ناوە و جا نازانرێ ئەمە وابووە یان نا بەڵام دەماودەم وادەڵێن، هەر ئەوکاتەش پیاوی ئەو ماڵە تووشی گرانەتا دەبێ و لەجێدا کەوتووە لەو بارودۆخە بێ داو و دەرمانەدا.

با ئەم خێزانە ناوبنێین خێزانی (س):

ئێوارە ناوێك لە دوانیوەڕۆوە لە کەپرەکانەوە سەیرکرا دووکەڵێکی سپی لە بەری ڕۆژئاواوە لە چەمەکانی تانجەرۆوە لای قڕاڵییەوە ئاسمانی گرتبوو، هەربۆیە خەڵکی گوندە کەپرینەکە کەوتنە مەترسی، هەروەك هەرجارێکی تر بۆ ئاگر کەوتنەوە کە دەکەوتنە مشور و بەرگریکردن کەسێکیان ناردە سەر لوتکەی یاڵەکان تا بزانن ئەو دووکەڵە چییە، کەسەکە بە پەلە هاتەوە و وتی ئاگرێکی زۆر قورس لە چەمی تانجەرۆوە کەوتووەتەوە، ئیتر بەهەر هۆیەك بێت دەشتی داوەتەبەر دەبێت هەرچی زووترە فریای بکەوین. هەڵبەت خەڵکی گوندەکان کە باسمان کردوون بۆ پاراستنی کێڵگەکان و لەوەڕگاکان هەریەکە لە ئاستی خۆیان بە ژن و پیاوەوە بە پەلە داری تەڕو گوێنی تەڕکراو و کونە ئاوو شەڵتە ئاوەوە بەرەو بەردەم ئاگرەکە ڕۆشتن، لەوەدا بوون بیکوژیننەوە بەڵام ئا لەو کاتەدا بایەکی زۆر بەتەوژم لە شەماڵەوە کە شەماڵی وا بەتەوژم زۆر دەگمەنە هەڵیکرد،

باو ئاگری قورەت[٢١] لە چاوتروکانێکدا پانتایی ئاگریان لە بەری عەربەتەوە گەیاندە دەشتەکانی چەمی تانجەرۆ بەوامبەر قەرەگۆل کە بە هیچ جۆرێ توانای کوژاندنەوە نەما، ئەوەندە ئاگرەکە جێگای مەترسی بوو بۆ گیانی خەڵکە ئاگرکوژێنەوەکە ئەوەندەش باکە جێگای مەترسی بوو، بۆیە بەناچاری خەڵکەکە پەنایان بردە بەر گوندە نزیکەکان چونکە دەووریان ڕووتەن بوو، وە هەروەها پەنایان دەبردە بەر وەردە کێڵراوەکان کە ئەوانیش ڕووبەرێکی ڕووتەن بوون، گەلێ ئافرەت و پیاو لە خەڵکەکە پڕوکابوون ئاویان دەکرد بەسەریاندا و گوینییە تەڕەکانیان دەدا بەسەریاندا تا بێنەوە هۆش، چونکە گرپەی ئاگر و دوکەڵ و تەوژمی باکە پڕوکاندبوونی.

ئەوەندەی چاو بنێی بەیەکدا هەموو ئەو دەشتایی و ڕوبەرانەی کە لەسەرەوە باسمانکردوون ئاگر بەبێ چارەسەر بەری پیاگرتن و کەبڵێسەی ئاگر گەیشتە یاڵەکانی بێستان سوور بەو بەرفراوانییە، ئیتر خەڵکی گوندە کەپرینەکەی بێستان سوور کەوتنە مەترسی چونکە زانییان لە چەند چرکەیەکدا ئاگر دەگاتە کەپرەکان کە دەوریان هێشتا شەخەڵ بوو، بۆیە بە پەلە هەرچی منداڵ و پیر و پەککەوتە و ئەو ئاژەڵانەی کە لەماڵەوە بوون لەگەڵ هەندێك زەخیرە و مەردەماڵ کە پێیان دەربکرایە هەڵیانگرت و بەرەو سەرچاوە ئاویەکان ڕەویان کرد.

با بێینەوە سەر خێزانی (س) کە لەسەرەوە باسمانکردووە، بریتی بوون لە هەردوو هاوسەر و کچێکی نزیك پانزەساڵ و کوڕێکی نزیك چوار پێنج ساڵان و کوڕێکی نزیك یەك ساڵە کە لە بێشکەدا بوو

و ماڵەکە پەنایان بردە بەر خەڵك و خوا کە یارمەتیانبەن کە پیاوە نەخۆشەکەیان بۆ دەربکەن و هەڵبەت زۆر بەپەلە ئەوە کرا، ژنی ماڵەکەش هەندێ مەردەماڵ و زەخیرەو کوڕە گەورەکەی دایە بەر، منالی ناو بێشکەکەو هەندێ ماڵیشی سپارد بە کچە گەورەکە، ئا لەم کاتەدا کە ئاگر گەیشتۆتە بەینی دووکەوانە لە کەپرەکانەوە، کچەکە چەردەیەك ماڵی بەکۆڵەوەیە و پەلاماری بێشکەکەش دەدات و هەرچەند دەکات هەردووکیانی بۆ هەڵناگیرێت و مناڵەکە دادەنێ هەروەی، بێشکەکە دادەنێ هەروەی، بۆیە بیردەکاتەوە کە منداڵەکە لە بێشکەکە دەربێنێ و لەناو دەفرێکی ماڵەکەی کۆڵیدا دەریکات، بەڵام منداڵەکە دەستێکی لە دەسترازەکەوە ئالاندوە بەئامان و زەمان بەرینادا و کچ بۆیدەرنایە، بۆیە وێڕای ئەو هەموو شڵەژاوی و ترسەش کە گڕپەی ئاگر لێی نزیك بۆتەوە شوێنی چەقۆ و شت دەزانێ لە ماڵەکەدا خۆی بەختدەکا لە پێناوی منداڵەکەدا و چەقۆیەك پەیدا دەکات و دەسرازەکە دەقرتێنێت، ئیتر بەئاسانی منداڵەکە هەڵدەگرێ بەڵام چی؟! ئاگر پرزەی لێدەبڕێ هەرچۆنێ دەبێت خۆی دەکێشێتە سەر ڕێگاکەی بێکەسە/بێستان سوور کە پانتاییەکی کەمی ڕووتەنی هەبوو، بەو شێوەیە خۆی لە ئاگر ڕزگار دەکات هەتا خەڵك و خوا پێی دەزانن دەگەنە سەری و بە لەبرێچوویی دەیانگەیەننە سەوچاوەی ئاوەکان، دەیانخەنە ئاو تا دینەوە هۆش و هێشتا منداڵەکە دەسرازە قرتاوەکەی هەر لەدەستییەوە ئالاندووە کە ئەمە نیشانەی کۆت و کەمەند بوو لە درێژایی ژیانیدا.

بێینـەوە سـەر ئاگرەکـە ئەوەنـدەی بڵێـی یـەك و دوو گونـدە کەپرینەکە دامرکایەوە کە لە شەقامی گشتی عەربەت.شارەزوورەوە کڵپەی ئاگربوو هەتا ڕووتەنەکانی پشتی گوندی بێستان سوور لە چاوتروکانێکدا سەرجەم دەشتەکانی تری بەردەمی ئاگرەکە کە لەسەرەوە باسمانکردوون هەتا لاپاڵەکانی کلکەی چناخچیان و ڕەقەی زێرینجۆ دامردەوە، ئیتر لەوێدا ئاگر لەبەرئەوەی کە گەیشتبووە ڕەقەنەکانی کلکەی چناخچیان و خڕی ئاوی چناخچیان ئاگرەکە کز بووبوو، خەڵکی گوندەکانی چناخچیان و کانی پانکە و زێرینجۆ لەبەر بەرگریکردنی کێڵگەکاتی خۆیان فریای ئاگرەکە کەوتن و لەلایەك کپ بوونەوەی ئاگرەکە لەبەر ڕەقەنەکان لەلایەکیش خۆشبەختانە باکە خستبوی، ئیتر ئاگر لەوێدا کوژایەوە و بەری ڕەنجی ساڵێکی ئەو ناوچەیەی کە باسمانکردووە بەرباد بوو، وێڕای سوتانی گوندە کەپرینەکەش کە هەبوو نەبوویان تیاچوو، ئیتر تەعزێ باریی کەوتە ناوچەکە، ئەم گوندە بەم کارەساتەوە ئەمە هەشتەمین جارە بە کارەساتی سروشتی و سیاسی وێران دەبێت و جاری نۆهەمیش دواتر بەهۆی ڕاگوێزانی بەعسییەکانەوە کاول بووە، بەروبوومە بەراوەکان و ئاژەڵداریەکە و هۆز و خزمانی دەوروبەر بوون بەهۆی کەمێك وورە و بووژانەوەی خەڵکەکە، لە کوردەواریدا دەڵێن (ماڵ سووتاو دەبێتەوە بە ماڵی سکەڕۆ نابێتە ماڵ).

خەڵکی گوندە سوتاوەکەش بە ناچاری وێڕای بارودۆخە ناتەندروستەکە پەنایان بردەوە بەر خانووەکان، دەوڵەتیش لەلای خۆیەوە بە هۆی بارودۆخی جەنگ و گرانیەوە مانگانە ڕێژەیەك

قومـاش و زەخـیرە و خورمـای دەدا بـە خەڵکەکـە(کـە پێـی دەووتـرا بیتاقـە)، ئەمـە بـوو بـەجێگای سـوودی مـاڵ سـووتاوەکانیش و ئیـتر وورده وورده خەڵکەکە هەستانەوە سەرپێ ئەوەمان لەیاد نەچێ کە خەڵکە دز و درۆزنەکە بەربووبوونە ژێر سەرەبزوتکی کۆڵەکەی کەپرە سوتاوەکان گوایە پارەدارەکان پارەیان لەوێدا داناوە وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێکردووە بەتابیەت خێزانی(س)، لێرەدا دەبێت بزانین کە هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدن زۆر کـەم بـوو یـان هـەر نـەبوو، بـەڵام چـەند پرسیارێك لە خەڵکەکە دەکرا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. پرسیار لە ژنی ئەو ماڵە کرا کە منداڵەکەیان بە کارەساتی دووپشك مردبوو: تۆ ڕات چییە بەرامبەر بەم کارەساتە ؟ وەڵام: من بـەهۆی مردنـی کـچەکەمەوە هـەر خـۆم تـازیٚ بـار بـووم، بـەڵام ئێـستا هـەموو گوندەکـەم تازێتبـارن، منیـش لەگەڵیانـدام، کـە سـەیر دەکـەم دەشـت و دەری کێڵگـەکان ڕەش پۆشـن وادەرانم زەمـین هـەمووی ئازیتبارە لەگەڵماندا.

٢. پرسـیار لـەو کـچە کـرا کـە خـۆی بـەختکرد لـە پێنـاوی منداڵەکەدا: تۆ دەڵێی چی؟ وەڵام: من ئەوکاتەی کە کەپرەکان ئاگریان گرتبوو کە هێشتا هەر سەرقالی لانکەکە بووم هەستم دەکرد کە ژیانی من تەواو بووە و دەسووتێم، یان دەبێت بمرم یا برا کۆرپەکەم ڕزگار بکەم، ڕوومدەکردە یەزدان و ئاواتم دەخواست کە باڵندەیەکی فریشتە بنێریٚ و منداڵەکە بگەیەنێتە جیٚی مەبەست، کە منداکەشم گەیاندە سـەر ڕێگاکـە لـە هـۆش خـۆم چـوو بـووم و بـە هەسـت ووریـابووم کـە خەڵکەکە گەیشتە سەرمان هەڵیان گرتین وام دەزانی ئەو باڵندانەن کە

نزام بۆ كردوون، كه ڕزگار بووم و هاتمەوه هۆش ئەوجا زانيم كه هاری كاری كراوم.

٣. له دەسته خوشكێكی ئەو كچەشيان پرسی كه خزمێكی نزيكيان بوو، تۆ چی دەزانی؟

وەڵام: من پێش ئەوەی ئاگر بگاته كەپرەكان هەوڵمدا يارمەتی دەسته خوشكەكەم بەم، دەستم دايه هيزەيەك ڕۆن كه دەريكەم بەڵام ڕۆنەكەم پيارژا ئيتر له ترسی ئاگرەكه هاريكاريەكەم لەبير چوو هەڵهاتم، كه سەيری دواوەم دەكرد نۆك و خووری و بابەتی ئاڵ و وێڵ لەبەر ماڵەكەياندا ئاگری گرتبوو كەچی هێشتا كچی ماڵەكه هەر سەرقاڵی ڕزگار كردنی منداڵەكه بوو لەبەر تينی ئاگرەكه.

٤. پرسيار له شوانێك، تۆ چيت دی ؟

وەڵام: سەرەتا وام نەدەزانی ئاگرەكه ڕووەو ئێمه دێت كه من و ڕانەكه له بەرزايی ياڵەكه بووين بەڵام كه زانيم به پەله ئاگر بەرەو لام دێت لەگەڵ سەگەكەمدا كەوتينه ڕاونانی ڕانه مەڕەكه بەرەو ڕووتەنەكان، تەنانەت بەناو كێڵگه و دەغڵ و دانيشدا، هەڵبەت ئاژەڵ هەستی تايبەتی هەيه بۆيه به ويستی من و سەگەكه هەڵدەهاتن و له وەردەكەدا وەك تۆپ خڕبوون.

٥. پرسيار له ژنێكی كۆڵكێش كەلەناو وەردەكەدا وەك بينی ئاو دەلەرزی: تۆ ئەم كارەساته چۆن دەبينی ؟

وەڵام: من كه دەمبينی ئاگر له زەمينەوه قرچەی دەهات له ئاسمانيشەوه با ، باوەشه پوشی به ئاگرەكەوه دەپرژان وام دەزانی كه له زەمينەوه ئاگر هەڵدەقوڵێ و له ئاسمانيشەوه دەبارێ، بۆيه

وامدەزانی کە دنیا ئاخری یەو کەس نەماوە من نەبێ، منیش دوا هەناسەمە.

٦. پرسیار لە زەلامێك کرا کە لەناو دوکەڵ و بەردەم ئاگرەکەدا پڕوکابوو، گەیەنرابووە ناو وەردەکان، ئاوی بەسەردا کرابوو بەحاڵ هەستی هەبوو، تۆ چیت دەبینی ؟

وەڵام: من وام دەزانی هەموو سەر زەوی نوغرۆ بووە کە بە هێواشی چاوم هەڵدەبڕی لە دوورەوە دەمبینی سەلکە کەرتەشی و قالۆرەی چاوبازەکان دەسوتان وام دەزانی هەمووی مرۆڤە، بۆیە منیش خۆم خستە بەردەم ساتی مردن.

٧. پرسیار لە وەرزێرێك کرا کە لە پێدەشتی گەرمیانەوە هاتبوو بۆئەوەی بەشان و قۆڵ و داس ژێوارێك بۆ منداڵەکانی بباتەوە، لەگەڵ خاوەن کێڵگەیەکی گەورەدا شەرت و بڕەی کردبوو، دوو ڕۆژ بوو لە درەودا بوو کە کارەساتەکە ڕوویدا: تۆ دەڵێی چی ؟

وەڵام: کە من لە دەڤەرێکی دوورەوە هاتبووم بۆئەوەی نان بۆ ماڵ و منداڵە ڕەش و ڕووتەکەم پەیداکەم زۆر بەدڵ خۆشی یەوە داسم لە کلۆش ڕادەکێشا کەچی ئاگرێکی قورەت ئەو ڕزقەی کە من بە تەمای بووم لوولی دایە گەروی خۆی کە بە پەلە خۆم گەیاندە وەردەکان، لە دوورەوە سەیری کێڵگەکەم دەکرد لە خەیاڵی خۆمدا دەم ووت ئێستا ئاگرەکە لادەداو کێڵگەکەم ناسوتێ بەڵام کەبینیم ئاگری تێبەربوو لەگەڵ قرچەی ئەودا دڵم دەقرچا چونکە وامدەزانی نەك ڕزقی ماڵ و منداڵەکەم بەڵکو خۆیشیان دەسوتێن، ئەم پرسیارانەی سەرەوە دوو ڕۆژ دوای کارەساتەکە بوون، لێرەدا

ئـەوەمان لەبیرنەچـێ کـە چـەند کەسـێك لـە دەغـڵ سـوتاوەکان کـە پاشـــەکەوتی ســاڵی ڕابردویــان لـــە چــاڵدا هـــەبوو هـــاری کـــاری وەرزێرەکانیـان دەکـرد چـەندیان بتوانیایـە یـان بـە تـەغارێك کـە پـێ دەچێ (٣٠) تەنەکە بووبێ بۆ ئەوەی بە دەستی خاڵی نەچنەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان. ریش سپی ئاوایی یارمەتی خەڵکی گوندی دا بە عەمبارەکانی.

با بێینەو سەر خێزانی (س)

وەك ووتمـان پیاوەکـەش نـەخۆش بـوو ئەوکاتـە، کـە تـۆزێ هاتەوە سەر خۆی لەگەڵ ئامۆزایەکیدا کە شەریکی ئاڵ و وێڵ بوون بڕیاریاندا بار بکەن بۆ سلێمانی، بەڵام ئەو بارکردنە ئەنجام نەدرا چونکە هەر ئەو ساڵە بۆ پاییز تاقە برای خێزانەکەی بە کارەساتی سـەیارە کـە تـازە هـاتبووە ناوچـەکە کۆچـی دوایـی کـردووە، سـاڵ وەرنەچـەرخا تاکـە براکـەی خۆیـشی کۆچـی دوایـی کـرد، خۆیـشی نەخۆشـی گرانـەتا لێـی هەڵدایـەوە کـە هـەموو سـاڵ و نیوێـك بەسـەر کارەساتەکەدا تێنەپـەڕی بـوو، ئـەو کارانـە بووبوونـە بـەرگر لەبـەردەم بارنەکردنەکەیدا بۆ شار.. هەر لەو ساڵەدا ئەو ماڵە کچێکی تریان بـوو، کـچە گەورەکـەیان بـەخزمێکی نزیکـی خۆیـان مێـردی کردبـوو، مێردەکەی ئەویش بەکارەساتی دووپشك پێوەدان کۆچی دوایی کرد وەك ئـەوەی دووپـشك بـەدوای ئـەو خێزانـەدا گـەڕابێت، پـاش بەینێـك پیاوی خێزانی(س) یش کە دەکەونەوە زستان دەمرێت.

پـاش یـەك دوو سـاڵیش کـچە بچکۆڵەکەشـیان بەکارەسـاتی کەوتنـە خـوارەوە دەمرێـت، ئیـتر خێزانەکـە دەکەونـە بـەردەم خزمەتـی

دایکێکی میهرەبان کە بە دڵفراوانی و کەرامەتەوە دەستی گرتبوو بەسەریاندا، جووت و گاکانی دەدا بەنیوەکار بۆ ئەوەی ژیانی منداڵەکانی پێ بگوزەرێنێ، وورده وورده منداڵەکان هەڵدەکشان هەتا چوونە بەردەم خوێندن، کوڕە گەورەکەیان وێڕای ئەوەی کە بەشەوان دەیخوێند بەڕۆژیش کەوتە کار دەستی داری گرتبوو بۆیە بەکشتیارە بچکۆلەکە ناویان دەبرد، منداڵەکان ساڵ لەدوای ساڵ گەورە بوون و پێگەیشتن، ڕیش سپی ئاوایی هەموو جارێ سەردانی ئەو دایکەی دەکرد و سوپاس گوزار بوو، چونکە بە هەڵوێستی پاك و ڕۆشنبیری منداڵەکانی پەروەردە کردبوو.. ؟

ئەوە ماوە بڵێین خێزانی (س) کێ یە

پیاوی ئەو خێزانە (حەسەن مارف) بێستان سووری کە ناسرابوو بە (حەسەن وەروەر) و ئەو نازناوەش لە بەرگریەك لەگەل تورکە عوسمانییەکاندا لە زەمانی (ڕەیف ڕەیف) واتە (سەفەر بەرلك) ەوە هاتووە، کە ئەو پیاوە باوکی بەندە (ئەحمەد کوڕە جوتیار) نووسەری ئەم کتێبە، وە ئەو منداڵی دەسرازەیەش بەندە (ئەحمەد کوڕە جوتیارە)!

بەیتی گوڵناز و کوڕە شوان

وەك ڕوون و ئاشکرایە (بەیت و بالۆرە) دیاردەیەکی بەر چاو بوون لە هەموو ناوچەکانی کوردستانداو هەر ناوچەیەك بە شێوە زمان و ئاخافتنی ناوچەی خۆی بە گوێرەی داب و نەریتی ناوچەکان ووتراوەتەوە جا بەشێوەی گێڕانەوە (حیکایەت) یان بەشێوەی

شانامە، یان بەشێوەی حەیران، هەندێك جاریش بەشێوەی هۆرە و سیاچەمانە ووتراوەتەوە، جا یان وەك چیرۆك و دەماودەم یان ئەفسانە  یان لە ڕوداوێكی ڕاستیدا ئەم بەیت و بالۆرانە هاتوون.
مەبەست لە بەیت(واتە شێوە هۆنراوەیی میللی) و بالۆرەش واتە بەدەم دەربڕینی جۆرە گۆرانیەكەوە هەریەك بە گوێرەی ناوچەكەی خۆی وەك لە سەرەوە باسمان كردووە.

هەڵبەت كە كاتێك منداڵ بوووم دایكم زۆر چیرۆك و بەیتی بۆ دەگێڕاینەوە دیارە (سەلما خاتوون) ی ڕۆژهەلاتی كە خۆی لەخۆیدا لای من چیرۆكێكی بەرچاوە لێرەدا ناتوانین باس لەو خاتوونە بكەین ئەوەندە نەبێ كە ئەویش ڕۆڵی باشی هەبووە لە گێڕانەوەی چیرۆكی گوێ ئاگردان بۆمان كاتێك كە منداڵ بووم، ئەویش وەك زانرابوو لە دەربەدەری لەدوای شۆڕشی پێشەوای مەزن هاتبووە گوندەكەمان و دراوسێمان بوو، لەگەڵ دایكمدا تێكەڵاویان هەبوو بۆیە زووزوو شەوانە كە ئێمە منداڵ بوین حیكایەتی بۆ دەكردین.

ئەوا لێرەدا (بەیتێك لە گێڕانەوەكانی دایكم دەخەمە بەر دیدو بیستی بەڕێزتان) بەو هیوایەی كە جێگای هەست ڕاكێشان بێت، ئەوەشمان لەبیر نەچێ كە ئەم بەیتە ڕوداوێكی ڕاستی یە لە ناوچەی شارەزوور، لە دەورەبەری عەربەت، پێچونێكی زۆریش هەیە كە لە گوندی بێستان سوور بوبێت وەك لە دیمەنەكانیدا دەردەكەوێت و دیاردەی زۆر ڕونی پێوە دیارە كە لەو گوندەدا ڕوی دابێ، كە دوایی باسی دەكەین.

هەر لە بێستان سووریشدا هەتا کۆتایی پەنجاکان ئەو بەیتە ڕەنگی دابویەوە لە ناو گۆرانیەکانی گوندەکەدا، ئەمە بەیتەکەیە (بەناوی یەزدان) بەناوی ئاهورا مەزدا:

(بەیتی گوڵناز و کوڕە شوان)

هەبوو نەبوو کەس لە ئاهورا مەزدا گەورەتر نەبوو، هیچ لە کەلتوری کوردەواری خۆشتر نەبوو، کەم بەیت هەبوو لە بەیتی گوڵناز و کوڕە شوان دڵگیرتر بوبێت، دەگێڕنەوە دێر زەمانێك لە ناوچەی شارەزوور (مامە فەتەی سەپان) پیاوێکی بە ساڵا چوو بوو، ژنێکی هەبوو ناوی (میم سافێ) بوو، کچێکی عازەبیشی هەبوو ناوی گوڵناز بوو، گوڵناز چی گوڵناز، نە بخۆیت نە بکەی سەیری سای گەردنی کەی، ئەوەندە جوان و شۆخ و شەنگ بوو، وەك دەڵێن مێوژە ڕەشەی بخواردایە لەسای گەردنیدا دیار بوو. مامە فەتە خاوەنی ماڵێکی کەم وەك لە کوردەواریدا دەڵێن کۆڵی یەك گوێدرێژ تەنها مەڕێك کاوڕێك و گوێدرێژێك و چەند مریشك و جووجەلەیان هەبوو لە کەوانەی ئاوایدا لە کولبەیەکدا دەیان گوزەران، بەڵام ژیانێکی ئاسودە.

هەر لەئاوایدا پیاوێکی بەساڵا چوو هەبوو کە شوانی ئاوایی بوو ناوی (مام وەیسەی شوان کارە) بوو، ماوەیەك خێزانەکەی مردبوو بە تەنها لەگەڵ کوڕەکەیدا دەژیا، کوڕەکەی ناوی خەسرەو بوو، خەسرەو چ لاوێکی باڵا بەرز و قەشەنگ و گەنم ڕنگ و مەچەك توند و جوان بوو، چ شمشاڵ ژەنێکی زانا بوو، مام وەیسەی شوان لە کوڵبەیەکی بچوکدا دەژیا و چەردەیەك ماڵی کەمی هەبوو لەگەڵ دوو

سێ بزن و مەڕ و گوێدرێژێك و یەك سەگ. تۆمەس بێ ئەوەی كەس بزانێ خەسرەوی كوڕەشوان و گوڵنازی كچە سەپان دڵ و دڵخوازی یەكتر بوون و بۆیەك دەسوتان، چاوەڕێی دەرفەتێك بوون كەڕۆژێك ببنە حەڵاڵ و هاوسەری یەك.

بەشی یەكەم :

بەیتەكە لێرەوە دەست پێ دەكات:

ڕۆژێ لە ڕۆژان قەزای ڕەبانی
مام فەتە هەڵسا چوو بۆ سەپانی
هەڵسایە سەرپێ پیرەی گورج و گۆڵ
سواری گوێدرێژ بوو بەبێ بۆڵەبۆڵ
نەقیزەی دەژەن وە گوێدرێژەوە
دەچوە درەو وەلا لێژەوە
وەدەم هۆرەوە وە قاچە لەقێ
جاجارە هەچە بۆ دەمە تەقێ
ڕۆیی تا گەییە سەر جاڕو پەرێز
داسی ڕاكێشا پڕ بە تواناو هێز
بیسمیلای لێكرد بۆ ڕزق و ڕۆزی
تەواوی ئەكەم ئەمڕۆ نا، سۆزی
پەلاماریدا هەروەكو هەڵۆ
بەری ڕاكێشا مەڵۆ بە مەڵۆ

**هەتا نیوەڕۆ ئەم شان و ئەو شان**

**وە هێز و توانا داسی ڕاوەشان**

**کۆڵکێشیش کێشای جا بۆ سەر خەرمان**

**لەم لاشۆ میمکە سافەی خێزانی**

**بە هەڵەداوان چوو بۆ سەر کانی**

**کونەی هەڵگۆزی زوو بە دەست و برد**

**ئاوی تازەی بۆ مام فەتە برد**

**پشکی کونەکەی لە ڕێدا بەربوو**

**سەرادامێنی میم سافێ تەڕ بوو**

**لەملاشۆ گوڵناز زۆر بەدەست و برد**

**پڕپۆڵەی وردی بۆ جوجەڵە برد**

**ڕۆژمان بەسەرچوو شەوگار هاتەوە**

**مام فەتەی هیلاك پاڵی دایەوە**

**میم سافێش لەبۆ گوڵنازی نازدار**

**حیکایەتی کرد تا نیوەی شەوگار**

**هەتا خەو زێفی پێ برد ئەوسا**

**وەدەم وەنەوزۆ چوە ناو جێگا**

**جارێکی تر ڕوژئەوێتەوە هەریەك وەك جاران**

**دەچنۆ وە دەم کارو فەرمانی خۆیان**

بەشێکی تری بەیتەکە:

ئەمجارە گوڵناز سەرەی دڵدارە
ئەڕوا بە لەنجە لە دورۆ دیارە
کچان دەست وە جام سەر وە خەنەوە
بەرەو ڕان ڕۆیی وە دەمخەنەوە
کوڕە شوان زانی ئەوە دڵدارە
دڵ و دەرونی بوو پارە پارە
چووە سەر بەردێ شمشاڵی دەرکرد
وە بەستەی ئاڵی زوو فوی پێدا کرد
نەك عاشق بەردی کرد بە قەترەی ئاو
گلەی پڕاو پڕ دەگرتە ناو چاو
ناشێ نەزانێ خەسرەو کوڕە شوان
کاوڕەکەی گوڵەی ناونابوو چاوجوان
بۆنی گوڵنازی نابوو بە ئەودا
ماچی تێدەگرت لە ڕۆژ و شەودا
کچان گەیشتن دەی مەڕ بدۆشن
نەیان دەزانی کوامیان دڵخۆشن
گوڵناز بەدەنی گشت پێدەکەنی
شوانەش لەولاوە بۆی ڕادەچەنی
بێری تەواو بوو گەڕانۆ بۆ ماڵ
گوڵناز و شوانە کەوتنە خەیاڵ

ئەو ڕۆژەش ڕۆیی شەوگار هاتەوە
هەریەك لەلایەك خەو دەیباتەوە
سۆزی خوا خۆیی و موڵکی دەمێنێ
بزانین ڕۆژگار چیتر دەنوێنێ

کات دەمەو بەیان بوو میم سافێ خەوێکی ئاش و پاشی دی گشت ئەندامی گیانی کەوتە لەرزەو بێ ئەوەی قسە بۆ گوڵناز و مامە فەتە بکات بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە پیرەژنە داناکەی ئاوایی کە دەستی خەوپەرژێنی هەبووە.

بەداخەوە ناوی ئەو ژنە دانایە لە بەیتەکاندا بە هیچ جۆرێ نەهاتووە نەمزانی ناوی چی بووە، بەڵام ئەوەندە هەبووە کە ژنێکی دانا و بە سەلیقە و قسەزان و خەو پەرژێنکەر بووە.

بەشێکی تری بەیتەکە:

داپیرە ووتی ئا کچە بێژە
خەوەکەت کورتە یاخود درێژە ؟
میم سافێ ووتی:
ئیمشەو لە خەوما باڵا عەرعەرێ
سەوڵێکی ناسك یەك خاتری تەڕێ
ئیمشەو لە خەوما دوو ئەستێرەی گەش
ئیمشەو لە خەوما جووتێ ماری ڕەش
ئیمشەو لە خەوما دوو هیلال نازدار

لەتەك ئەسێران ئەوان بوون بە چوار
ئیمشەو لە خەوما فندقێکی کاڵ
دوو کوڵمی نازار گەش و ئاڵ و واڵ
دوو خونچەی تازە پشکۆی بەر بەیان
دەشنانەوە وە خەندەی جوان جوان
ئیمشەو لە خەوما جووتێ هەرمێی کاڵ
وەجووت وەستابوون لەسەر سنگی ئاڵ
ئیمشەو لە خەوما پەنجەی وەك شمشاڵ
بۆ سمڵ مێخەك دەیکرد گڕوگاڵ
ئیمشەو لە خەوما جووتە ئەستونێ
ستونێکی بەرز کاری گەردونێ
ناکاو یەك دڵۆپ لیتاوی چڵکن
ڕژا وەسەریا و کردی سەر نگوون
وەك چراوگێك لە ئاسی خۆیدا
زوو کپ بۆوە خێرا لە جێی دا
داپیرە دیسان ووتی ئابێژە
وا دیارە خەوت دورووو درێژە
– میم سافێ ووتی
دوایی لەولاوە
بینیم لاوێکی قەشەنگ وێستاوە
خەریکە شمشاڵ لێدا بۆ ڕانێ
ڕانە مەڕ کپکا وە نەغمەی جوانێ

**ناكاو گورگێكی چەپەڵ نایە ڕان**

**كاوڕی چاو جوانی زوو كردە نیشان**

**لاوەكە خێرا چەقۆی دەرهاورد**

**ڕیشەی هەناسەی گورگەی دەرهاورد**

**ناكاو خۆشی پێی لە بەردێك هەڵكەوت**

**چاقۆ بەر پەڕەی دڵی جوانی كەوت**

**دەست وەجێ ئەویش گیانی لەبەر چوو**

**كە چوومە سەری هەناسەی نەبوو**

**هەرسێكیان كەوتن كاوڕو كوڕو گورگ**

**بواری نەدان پاییزی مەرگ**

**داپیرە ووتی سافێ سەر بادە**

**وەلای چەپەوە سێ پف حەوادە**

**خوا خاسیكا خەوەكەت شوومە**

**ئەو خەوە مایەی سێ سەر نگومە**

**كچكە خەو پرژێن خەوەكەت  وایە**

**كاری گەردونە و ڕەزای خوایە**

**عەرعەر بالآكە بالآی گوڵنازە**

**وا جوان و شۆخ و گەڵێ بە نازە**

**دوو ئەستێرەكە جووتە چاویەتی**

**دوو ڕەش مارەكەش زوڵفی خاویەتی**

**دوو هیلالەكەش برۆی مەستیەتی**

**شمشاڵەكانیش پەنجەی دەستیەتی**

**فندقیش لوتی ئاڵ جوانیەتی**

**دوو خونچەی تازەش لێوی خەندەرانیەتی**

**جووتە هەرمێکە مەمکۆڵانیەتی**

**دوو ورشەی هەنار کوڵمی جوانیەتی**

**دوو ستونەکەش جووتەی قاچیەتی**

**دەستیش بۆ سمڵ بۆنەی ماچیەتی**

**دڵۆپە چڵکاو ژاری بەدبەختە**

**کپ بوونی چراوگ مەرگی نا وەختە**

**چەقۆی کوڕەشوان هەڵبەت دوو بەشە**

**دەم و دەسکەکەی مانای دوو لەشە**

**کاوڕەکەش ڕۆحی گوڵنازە دیارە**

**گورگە شومەکەش ژاری کوشتارە**

**کوڕەکە پێی هەڵکەوت لەو بەردە**

**باری مردنە دەڕوا بەو دەردە**

**چە قۆکەش عەشقەو وەو عەشقە خۆی کوشت**

**خۆی وە دەستی خۆی خوێنی خۆیی ڕشت**

**دیارە گوڵناز و ئەو کوڕە شوانە**

**عاشق و ماشقەن زۆر چاك بیزانە**

**ئەگەر لە ماوەی شەو و ڕۆژێکا**

**ئەو مەرگەساتە چارەسەر کرا**

**ئەوا ئەو دوانە ئەبنە هاوسەر**

**کاری مەرگیشیان ئەویٚ چارەسەر**

بەڵام ئەگەر قەدەر دەستی خۆی وەشان
کاری گەردوونە و نایاندا ئامان
چونکە کوشتنی ئەو گورگە هارە
کەمێ ڕوناکی وە خەوتۆ دیارە
ها هیزە ڕاکەو فریایان کەوە
ماوەیان کەمەو دەخیل مەسرەوە

جا ئیتر میم سافێ وەدەم لەرزەوە خۆی گەیاندە ماڵەوە و هاوار هاوار و حاڵی بێ حاڵ بینی ماڵ چۆڵەو گوڵناز دیار نی یە، ئیتر نەیزانی خەبەرات چی یە، پەنای بردە بەر خەڵکی دەوروبەر، دەستم دامێنتان بمکەن چارەسەر، جا میم سافێ بە دراوسێکانی ووت ئیمشەو خوا بەخێری بگێڕێ خەوێکم دیوە لە خەوپڕژێندا ئەنجامی خەوەکە وایە گوڵناز و کوڕەشوان دڵخوازی یەکن و لە ماوەی شەو ڕۆژێکدا فریایان نەکەوین توشی کارەساتێك دەبن، بۆیە خەڵکەکەش هاتن بە هاواریەوە و چەند کەسێك لەگەڵ میم سافێ بەرەو یاڵەکە کەوتنە ڕێ، بەڵام دزاو دز کەوتبوون، چونکە کار لە کار ترازابوو کوڕەشوان لای ڕان بوو لە شوێنێکی نادیار، گوڵنازیش لەگەڵ کچ گەلی ئاوایی چووبوون بۆ تەپاڵەو کەوتبوونە ئەو دۆڵانەو نەیان دۆزینەوە و خەڵکەکە بێهودە گەڕانەوە.

لێرەدا بەشێکی تری بەیتەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

کچگەل جوقیان بەست چوون بۆ تەپاڵە
هەڵزنان وەڕووی ئەو کلکەو یاڵە
بڵاوەیان کرد کچان دۆڵاو دۆڵ
هەریەك وەلایە چارەکە لە کۆڵ
وە دەم گۆرانی وە نەرمە هۆرە
کچان بۆ یەکتر کردیانە نۆرە
تەپاڵەی ووشك و بنە خڕنوکە
کوام کچ زیرەکە چارۆکە پڕکە
گوڵناز دەستی برد بۆ بن تەپاڵە
زوو شەقەی هەڵسان لەو پەنجە ئاڵە
دوو پشکێکی ڕەش بەقەد یەك قولانج
پەنجەی گوڵنازی زوو کردە ئامانج
گوڵناز قیژاندی بۆ دەستە خوشکان
کچان کۆوە بوون چاو پڕ لە گریان
کچێکی ئاقڵ وە چلکە دارێ
تەپاڵەی لادا، دووپشك کەوتە خوارێ
خێرا وە بەردێك پانی کردەوە
تۆڵەی گوڵنازی چاك لێکردەوە
چزوەکەی قرتاند خستیە ناو چاڵ
لاشەکەی هەڵگرت بیواتۆ بۆ ماڵ
هیزە خێراکە گوڵناز بیمارە
با خێرا بیوەین بۆ بن ئەو دارە

تا لەوێ خێرا لە پەرچ و چەواڵ
تەرە دروست کەین کێشی کەین بۆ ماڵ
لەم لاشۆ سافێ لەگەڵ خەڵکەکان
لەناو چاڵەپان بۆ کچان گەڕان
نەیان دۆزینۆ گەڕانۆ بۆ ماڵ
دایکی گوڵنازیش حاڵی بوو بێ حاڵ
کچان نا ئومێد دیدە وەگریان
چوونە ئاوایی خەبەریان گەیان
(مام مەیکەی) حەکیم وەو کارەی زانی
چووە سەر کچە زۆر وە ئاسانی
ووتی ها هیزە ئاڕو تەوگیر
توتن و خەنەم بۆ بکەنە هەویر
چاوی کردەوە ووتی ئەی هاوار
جەرگم بڕاوە زوو بمکەن بیمار
مام مەیکەی حەکیم:.ئادەی وەك نەبەرد
زوو بۆم پەیاکەن شیری مانگای زەرد
بیکەنە گەروی تا بڕشێتۆ
هەتا ژەهراوی هەڵبێڕێتۆ
حەکیم زوو خەنەی نا لە برینی
لە حاڵی کچە هیوای نەبینی
ووتی خزمەکان دەستم وەدامان
دوو کارم بۆ بکەن ئامان سەد ئامان

ئەمشەو بیڕێنن وەهەر شێوەێ
پەلەشی لێبکەن شیرەکەی بەنێ
خەڵکی ئاوایی نەخەوتن کەسیان
شیری مانگای زەرد نەکەوت وە دەسیان
کچە نەڕیا تا پەرێشان بوو
نا ئومێد بوون گیانی لەبەر چوو
کار لە کار ترازا گوڵناز کۆچی کرد
لەتەك خۆی هەموو نازی دنیای برد
لە گشت ئاوایی بووە ڕۆڵە ڕۆ
خەسرەو کوڕە شوان هاتۆ نیوەڕۆ
کاتێ کە کارەساتەکەی زانی
بەر بووە شیوەن وە پەرێشانی
کەوتە دوای تەرم قوڕ وە شانەوە
وە دەرونی کەیل پەرێشانەوە

دوای ئەوەی کە بە خاك سپێردرا کە خەڵکەکە دەگەڕێنەوە بۆ ئاوایی لە داب و نەریتی کوردەواریدا لە دێر زەمانەوە وایە کە دەبێت لاوێك بۆ ماوەیەك بە دیار گۆڕەکەوە بمێنێتەوە بە تەنیا ئەوسا ئەویش بگەڕێتەوە.

جا بۆ ئەم مەبەستە خەسرەوی کوڕە شوان لێی خواستن کە ئەو بمێنێتەوە، خەڵکەکەش ئافەرینیان کرد و بەڵێیان بۆ کرد، هەرکە خەڵکەکە لە ملە ئاوابوون لە گەڕانەوەیاندا، کوڕە شوان بە فرسەتی

زانی و چەقۆی لە خۆی هەڵکێشاو خۆی دا بەسەر گۆڕەکەی گوڵنازدا بە دەستی چەپی باوەشی کرد بە کێلی ژوور سەریدا و دەمی پێوە ناو بە دەستی ڕاستی چەقۆکەی دا لەسەر دڵی و خۆی کوشت، هەڵبەت ئەو کاتە پاڵی دابوو بە ئێوارەوە کە شەو هات کوڕە شوان هەر نە گەڕابوەوە مام وەیسەی شوان هاواری برد بۆ ڕیش سپی ئاوایی کە خەسرەو بۆ نە گەڕاوەتەوە ڕیش سپیش دوو لاوی نارد بۆ سەر قەبران بۆ هەواڵ زانین، کاتێ کە چوون چیان بینی خەسرەو لە حەوت سالاّن ڕاستبۆتەوە بە پەلە گەڕانەوە بۆ ئاوایی خەبەریان برد بۆ ڕیش سپی خەڵکیش چوون بەپیری کارەساتەکەوە و بۆ سبەینێ ئەویشیان بەتەنیشت گوڵنازەوە بە خاك سپارد، ئیتر بۆ ماوەیەك شین و شەپۆڕ و تازیەت باری ئاوایی داگرت.

لێرەدا بەشێکی تری بەیتەکە دەست پێ دەکاتەوە:

خەو پرژێنی خەو ئاوها هاتە دی
کۆست کەوتە سەرجەم خەڵکی ئاوایی
لەم لاشۆ مامە فەتە و میم سافێی هەژار
هەر ڕۆ ڕۆیان بوو بە درێژی شەوگار
هەتا هەردوکیان چاویان لە دەست دا
مجرۆ لێی کەوتن ڕوناکییان نەما
لە پاش ساڵێکیش بەرودوا مردن
خوا ئاسودەی دان لە شیوەن کردن

مامە وەیسەی هەژار لە کولبەی چۆڵ
پەژارەی دنیای دابوو وەکۆڵ
هەردەم ئەیناڵاند هاواری ئەبرد
لە پاش شەش مانگێ تا گیانی سپارد
لەو ڕۆژگارەوە هەتا ئەم دەمە
ئەو کارەساتە کرا بەم بەیتە کە لەسەر دەمە
منیش لەولاوە هاتمەوە بە غەمباری زیز
مەرگتان نەبینم هەرگیزا و هەرگیز

ئەم کارەساتە هەر لەو سەردەمەوە کە سەرەتاکەی نازانرێ هەتا کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو کرابووە بەیت و بالۆرە و لەناو کۆڕ و کۆمەڵدا زۆر لە گۆرانیەکانی ناوچەکەدا ڕەنگی دابووەوە، وەك ئەم نمونانەی خوارەوە:

- بومە شوانەکەی هەق نادیاری
کە خوێنی خۆی ڕشت لە عەزرەت یاری

- هەر بار بارتوو بارت کرد وەڕاست
کاتێ کۆچت کرد هیممەتت نەخواست

- تەرمەکەت دریا وە بەرامبەرا
خەڵکی ئاوایی قوڕبەن وە سەرا

- چاوم چاوەڕێی ئەو کلکەو بەردە
بەشکو دەرکەویٚ ئەو گەردن زەردە

- دەشتی شارەزوور وەچاو ئەگێڕم
دڵم نایەڵیٚ لەیل وەجیٚ بێڵم

- منیش خۆم ئەکەم وەقوربانی تۆ
وەجیٚ و نایەڵم نەونەمامی نۆ

- سەرچاوەی دڵی پیران کوێرۆ بوو
کە بەنی جەرگیان سەرنخونۆ بوو

- خانم خەوتوە وەك خەرمانەی گوڵ
پەنجەی وەك شمشاڵ نای وەبانی دڵ

- لە ماڵی دنیا کاوڕێکم شك برد
ئەویشم بۆ تۆ قەزاوە گێر کرد

ئەمەو چەندەها بەیتی تر هاتونەتە ناو گۆرانیەکان لە شارەزووردا کە ناکریٚ هەموویان بڵێین.

ئەم بەیتە کە وەك لە سەرەوە ووتومانە لە دەوروبەری عەربەت ڕویداوە وە بە ڕونیش دەردەکەویٚ وەك گەلیٚ دیاردە کە لە بەیتەکەدا

ڕەچاو دەکرێ ڕوداوەکە لە گوندی بێستان سووردا ڕویدابێ، چونکە چەند دیاردەیەك کە لە بەیتەکەدا هاتووە بە بێستان سوورەوە دیارن: ووشـەی چـاڵەپان، گۆڕسـتانی ئـەودیو ملـە، کـانی یـە سـارد، تاقـە دارەکـەی بنـار و بوونـی مەیکـەی حـەکیم کـە تـا ئـەم دواییانـەش هـەر دەنگ و باس بوو کە حەکیمێکی میللی دێر زەمان لەم گوندەدا هـەبوە بـەناوی مەیکـە چنگنی، پێوەدانـی دووپشك زیـاد لـە چـەند ژمارەیـەك خەڵکی کوشتووە لەم گوندەدا.

جا بۆ ڕون کردنـەوەی ئـەم مەبەسـتە (لالـە حـاجی حمـەمراد) کـە خزمێکی خۆمان بوو، تەمەنی لە (١١٠) ساڵ هەڵکشابوو هەرچۆن بوو دەرگای پرسیارم لەگەڵدا کردەوە بۆ چەند بابەتێکی کۆن لەگەڵیدا ئـەم بەیتـەش، بەڕەحمـەت بێت لەوەڵامـدا ووتـی: ئـەم بـەیت و باڵۆرەیـە لـە شـارەزووردا هـەتا سـاڵانێك زۆر بـاوبوو بەتایبـەتی لـە گونـدی بێستان سوور کە من بۆچونم وایە کە ڕوداوەکە لەم گوندە ڕویدابێ.

جا بـەیتێکی تـریش هـەر لـە شـارەزووردا بـاوبوو بـەناوی بـەیتی (بلـە) ئیتر لـە ڕاسـتی دا پڕکێشیم نـەکرد کـە لالـە حـاجی بەیتەکـەم بـۆ بـاس بکـات لەبـەر پـیری و میـوانیش بـوو، ئیـتر مـن خۆشـی بـەیتی گوڵنـاز و کوڕە شوان چوو بە دڵمدا وەك کەلتورێکی کوردی و نەتەوایەتی زیاتر وەك کــەلتورێکی گوندەکــەم بۆیــە هێنامــە زمــان ئەگەرچــی کەمــو کورتیـەکیش هـەبێ ئـەوەمان لـە بیر نەچـێ، ئاخـافتی بەیتەکـە هـەمان ئاخافتنی شارەزوور و گوندەکەمانە و بەو هیوایـەی کـە لاپەڕەیـەکم لـە کەلتوری میللەتەکەمان زیندوو کردبێتەوە.

لێکدانەوەی چەند وشەیەک:

سۆزی = سبەینێ

تەوگیر = تەگبیر

ئاهیزە = ئا مەردینە

تەرە = ئامێرێك لە پەرچی دار دروست دەکرێ بۆ کار ئاسانی گواستنەوە، ڕادەکێشرێ

کوڵبە = خانووی شڕو شێواو

زێفی پێسەند = پرزەی لێبڕی

جوقیان بەست = ڕیزیان بەست

تێبینی:

دورگەیەکی بچوك لە باشوری ئاواییەوە دەکەوتە دەستە راستی کانی نەنکە و حەمەی مامە کەریم ، ئەو دورگەیە کەمێك بەرزایی بوو کە شێوەکەی هێلکەیی بوو روبەرەکەی نزیکەی ٢٥٠ م٢ دەبوو سەرەکەی بە بەهاران دادەپۆشرا بە گژوگیای جوان و گوڵە سالمەو بەیبون و گوڵاڵە سورە و چاوە کۆتر و حاجیلە، گیایەك کە گەڵاکەی لە گەڵای توو دەچوو پێیدەوترا کەڵەویَ ئەوانەی لێی دەزانن دەیکەنە چێشتێکی خۆشی پزیشکی،لە دامێنی ئەو دورگەیەدا بەندە لەگەڵ هاورێیەکم بە ناوی حەمە بچکۆل باخێکی بچوکمان دروست کردبوو کە لە راگوێزانەکەدا رژێم تەفرو تونای کرد.

کە مزگەوتەکەی حاجی ئەمین بە کارەساتێك سوتا، لەسەر حەوز و ئاوەکەوە مزگەوتێکی نویَ دروست کرا بە هاریکاری ئەورەحمان ئاغا ناسراو بە ئاغا لەگەڵ عومەری فەقیَ عەلی و خەڵکی ئاوایی، مزگەوتەکە پێك هاتبوو لە ژوری نوێژ و حوجرە و سالۆنێك و هەیوانێکی گەورە و هەورەبانێك کە روبەرەکەی جگە لە حەوشەکەی نزیکەی ٣٥٠ م٢ دەبوو، درێژی هەیوانەکەی ٢٠م٢ دەبوو، دارێکی مێژویی هەبوو کە لە باخی ئەورەحمان ئاغا

هێـنرابوو هـەموو هەیوانەکـەی دادەپوشـی ئەوەنـدە گـەورەبوو، لەسەر حەوزەکە سەحەنێك دروست کرابوو بەردی زۆر گەورە لە قەڵبەزەکانـەوە هێـنرابون بـۆ بـەردە نوێـژ، ئـەم مزگەوتـەش وەك مزگەوتە کۆنەکە جێگای فتواو دراسەت بوو، حەوزی دەست نوێژ و ئـاو خـواردن و خۆشـتن و مـردوو شـتن جیـا بـوو، جگـە لـەوەی ئاوی مرافق  بە جیا بوو، خـەڵکی بۆ پشوو و فێنکـی لـە هاویـندا لەو سەحەنە دادەنیشتن.

لـەپێش سـوتانی مزگەوتەکـەوە لەهەورەبانەکـەی هێلانـەی حـاجی لـەق لـەقێك هــەبوو کــە لەدێرزەمانــەوە هــەبوو، کــە مزگەوتەکەش سوتا لەسەر سیلەی هەورەبانە سوتاوە منارەییەکە هیلانەکـەی دانایـەوە تـا حـەفتاکانی سـەدەی ٢٠ هـەر مـابوو ، خەڵکی بە نەزەکردەیان دەزانی، خۆڵی منارە سوتاوەکە کە شوێن مـاڵی شـێخ حـسین بـوو دەیـان بـرد بـۆ پـیرۆزی بـە ماڵـەکانیان دەیانرژان.

باڵەخانەکەی حاجی ئەمین کەلەسـەرەوە باسمان کـردوە لـە سـەردەمی فـەقێ عـەلی دا دروسـت کـراوە، لەگـەڵ شـێخ محمـودی نـەمردا پەیوەنـدی و سـەروبەندییان گـەرم بـوو،یەکـەم راوێـژی شۆرشـی شـێخی نـەمر بـە کۆکردنـەوەی هـەموو ریـش سـپی و سـەرۆك هۆزەکـان و کـەیخواکان لـە باڵەخانەکـەی فـەقێ عـەلی دا بڕیـاری بـۆ درا، عارفـە گزیـر کـە باسمـان کـردوە دوو تـووی لـە

هەورامانەوەهێنابوو یەکێکیانی لەسەرچاوەی مزگەوتە تازەکەدا نێژرا بوو کە بە تووە زەبەلاحەکە ناودەبرێ کە ناومان بردوە، ئەوی تریان لەبەردەم مزگەوت و ماڵی حاجی ئەمین دا نیژرابوو، ئەم توانە تازە هەڵدەچون لەکاتی راوێژەکەی شێخی نەمردا، ئێخ دەڵێ برنەوێك دەنێم بەو توانەوە بزانم هێزی ئەم گولە برنەوانە چەندە؟ ئەوەبوو نیشانکردێکی کردبوو برنەوێکی پێوە دەنێ لەودیوەوە دەردەچێت وەك پشتی قەمور کۆپارەی کردبوو تا راگوێزانەکەش ئەو ئاسەوارە هەر دیار بوو، هەڵبەت بڕیاری شۆڕشی ئەیلولسش لە سەردەمی عومەری فەقێ عەلی دا هەر لەو دیوەخانەدا بوو.

ئەم گوندە هەردەم شۆرشگێڕ و لەئاستی خەباتی نەتەوایەتیدا شوێن دەستی دیار بوو کۆمەڵێك شەهیدی پێشکەش کردوە وەك عەلی حمە امین و بەهادین ، کۆمەڵێك پێشمەرگەشی هەبوە.

(عمری فەقێ عەلی سەرکردایەتی هێزێك بوە یەکەم چەخماخەی گولەی لەسەر تونێلەکەی دەربەندیخانەوە گرتە رژێم و دواتریش بوە رابەری سیاسی لە بنکەی وێلەکە، بەندە نووسەری ئەم کتێبە بەڕێوەبەری کاروباری راگەیاندن و رۆشنبیری و ڕێکخستنەکانی بنکەی نەوتی بووم و دواتر لە بنکەی بێدەن بۆتە پێشمەرگە،ساڵحی رەوشە نانەوای هێزی

قەرەداغ بوە، سالّحی حمەی عارف عدد رشاشی هێزی خەبات بوە، نامیقی حاجی ئەحمەد هەتیو پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو ئەمانە پێشمەرگە کۆنەکان بون، پیچشمەرگە نوێیەکانیش : نوری علی ناسراو بە وەستا نوری، خوالەی خولەی رەوشە ناسراو بە خولە ریشە، ئەمیری حمەی حەسەن وەروەر، جەزای خولەی وەروەر،شەهید بەهادینی حەسەنی فاتەو هەندێکی تریش.

ئەم گوندە لە کۆنەوە تا ئێستا لە ژن و پیاو چەند شێتێکی تیا بوە.

لەم گوندەدا سێ بنەماڵە هەبوو ریش سپیەکەیان بە ناوی عەلی ئیرانی کە پشتاو پشت لەم گوندە بوون و پێناسەی گوندەکەشیان هەبوە بەلاّم تەبەعیەی ئێرانی بوون، لە ئەنفالدا دەستی سیخورەکانیان پێدەگات وئەنفال دەکرێنئیتر بێ سەرو شوێن بوون تا ئەم سالاّنەی دوایی دەرکەوت کە سنورداش کراون و هەندێکیان نەماون ئەوانی تر لە کوردستانی رۆژهەلاّتن ، ژمارەی ئەم خێزانە ١٢ کەس بون.

# بەستی سێیەم

# گەشتێك بەنێو

# شاخی گۆیژەدا



شاخی گۆیژەی سەرکەش و شانازی شاری سلێمانی، دەبێ خۆی و لق و شوێنە سروشتی یەکانی دەورودامێنی، هەروا لە دارستاندا ڕووتەن بووبن؟

بۆ وەلامی ئەم پرسیارە بەڵگەنامەیەکی مێژووی وەك نوسراوەیەك لەبەردەستماندا نی یە، بەلام نابێت ئێمە لە ئاست ئەو پرسیارەدا هەروا دەستەوسان بوەستین و لەپشکنین کەمتەرخەم بین، بەش بەحالی خۆم لە ئەنجامی ئەو خولیایەدا کەچەندین ساڵ بوو لەسەرمدا بوو کەوتمە گەڕان و لێکۆڵینەوە بەدوای ئەوشتانەدا، کە لەومەبەستەدا شتێکم پێ بسەلمێنێ، بۆ بوونی دارستان، لە گۆیژەدا. کەوتمە گەڕان بەدوای پرسیار لە پیر و دانایان و زانایان و لێرەولەوێش مشوری سەرچاوەم دەخوارد کەوتیشمە گەڕان بەناو دۆڵ و لاچاڵەکانی شاخەکەدا بۆ دۆزینەوەی دار و ڕووەك و شوێنەواری درەخت، کە بەڵگەی سەلماندنی بوونی دارستانیان هەبێت !؟.

هەڵبەت لە حەفتاکانی سەدەی پێشووەوە بەو کارانە هەڵساوم هەرچیم دەستکەوت و بینیم بیستم و کەڵکم لێوەرگرت، هەم بۆ زانیاری مێژوویی و هەم بۆ زیندوگردنەوەی کەلەپوری ئەو شاخە سەرکەشە!، بابەتێکم گەلاڵەکرد، دەست لە دەست و هێز لە یەزدان، ئەمەی لای خوارەوە کەبەشێکی باسەکەیە و بەم بەیتە هۆنراوەیەی (پیرەمێرد)ی نەمر دەست پێدەکەم:

**شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە**
**باعیسی کەیف و سروور**
**هەردەمە بەرگێك ئەپۆشی**
**گاە سپی، گاە سەوز و سوور**

**پێناسەی گۆیژە**

ئەم زنجیرە شاخە لەبەری ڕۆژهەڵاتەوە کەوتۆتە پشتی شاری سلێمانی، بەشێکیشی کەوتۆتە سەروی ڕۆژهەڵاتی ناوچەی شارەزوور، سەرەتای سنورەکەی لە (دۆڵە میران) ەوە، کەبە(هەروتە) یان گردە گروێ ناودەبرێ دەست پێدەکات، لەوێشەوە بە زنجیرەیەکی کەمێك ڕاست ڕاکشاوە بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات، هەتا دۆڵی (دوکانیان)[٢٢].

ئەگەرچی ئەم شاخە لەهەرشوێنێکدا ناوێکی تایبەتی هەیە، بەڵام لە هەروتە و جادەی گشتی سلێمانی.چوارتاوە هەتا دوکانیان هەریەك زنجیرەی لێك دانەبڕاوە و هەمووشی هەرگۆیژەیە.

شاخی گۆیژە نزیکەی (٢٥)کم درێژە[٢٣]، بەرزاییەکەی لەڕوی دەریاوە (١٥٠٣,١٢٥٠م) بەرزە و لەڕوی زەویشەوە نزیکەی (١٠٠٠م) بەرزە.

چەند ڕیزە گرد و زنجیرە چیا دەکەوێتە دەوروبەری دامێنی گۆیژە، وەك:یاڵی حاجی سەمین لە باشورەوە. .ئەزمڕ لە باکورەوە، زنجیرەی شاخی (پوشێن \خرابە) لە ڕۆژهەڵاتەوە، کلکەی چەناخچیان

لـەخوارووی ڕۆژهەڵاتـەوە، یـاڵی هـەنجیرە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بـە پـشتی گونـدی هـەنجیرەوە، لوتکـەی هێلانـە چـەرخ لـە خـواروی ڕۆژهەڵاتـەوە لەپـشتی گونـدی کـانی پانکـە و گرێـزەوە.. کلکـەی مـوان لەباشـوری ڕۆژهەڵاتـەوە، یاڵی (کـانی سـپیکە و قەویلـە) لـە ڕۆژهەڵاتـەوە، کلکـەی سـەراوی سـوبحان ئاغـا لـە ڕۆژهەڵاتـەوە، چـیای سـەید صـادق لـە ڕۆژهەڵاتـەوە، چـونکە ئـەم کلکـە و یـاڵ و شـاخانەی سـەرەوە وەك لـە دەماودەم و پرسیارەکاندا بۆم دەرکەوت لە لق و بەشـەکانی دەوروبـەر و دامێنی گۆیژە دەژمێردرێن.[٢٤]

کورتەباسێکی مێژووی:

سەرەتا..ئەزمڕ ئەم شاخە شاخێکی کەمێك بەرز و سەختە کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاخی گۆیژە. ...(دۆڵەمیران) یان هەروتـە. دەکەوێتـە نێـوان ئەزمڕ و گۆیژەوە.

ناوی ئەزمڕ لەچییەوە هاتووە؟

کاتی خۆی لە کۆتاییەکانی پێش زایین و سـەرەتاکانی زایینـدا شـارێك هـەبووە لـە شـوێنی ئـەم شـارەی ئێـستای سـلێمانی دا، کەبـە شـاری (سـیلۆنا) نـاوبراوە[٢٥]، هەربۆیەشـە کـە بابانـەکان بناغـەی سلێمانیان هەڵکەند مۆرێك دەرکـەوت بەناوی سلێمان، پێدەچێ ئەو مـۆرە هـی پاشـای ئـەو شـارە یـا حـاکمی ئـەو شـارە بوبێـت کـەناوی (سلێوان) یان (سلێمان) بووە و ئیتر سلێمانی لە سۆرخی ئەو مۆرەوە ناونرا سلێمانی.

شارۆچكەیەك كە سەربە (شاری سیلۆنا) بووە و ناوی (ئەزین) بووە[٢٦] كەبەسۆرخی كچێكەوە ناوی ئەزمیرە بووە چونكە ئافرەتەكە ژنی شارەداری شارۆچكەكە بووە خوشكی (فەروخ شای كوڕی تەهران) بووە و ئافرەتەكە ناوی (ئەزمیرە) بووە، ئیتر شاخی (ئەزمڕ) بە سۆرخی ئەو ئافرەتەوە ناونراوە.

كە ئیسلام هاتە شارەزوور پەلاماری میرنشینی فەروخ شای داو سەرەتا لە سێ هەزار كەس لە سوپای ئیسلام دوانیان دەرچون، كە چووبوونە ماڵی پیرەژنێك لە قلیاسان ژنەكە زانیبوی ئەمانە داگیركەرن مشتێ خۆڵە مێشی كردبوە چاوی یەكێكیان و بەچەقۆ كوشتبوی، بەڵام كەسەكەی تر پیرێژنەكەی كوشتبوو بۆی دەرچووبوو دوایی بەسەركردایەتی ئەبوزەری غەففاری بە سوپایەكی بێ شومارەوە پەلاماری میرنشینەكەی فەروخ شایان دایەوە و دەڵێن بەرگریەكی چاك كراوە قڕانێك و كوشتارێكی زۆر لە دۆڵی قڕگەدا[٢٧] كەوتووە.

كە فەروخ شا توانای بەرگری نامێنێ لە پایتەختەكەی خۆی لە بنەی (ئەزمیرە) بەدیلی دەگیرێ، ئەبوزەڕ دەڵێ ئەوەتەی من شەڕ دەكەم لە هەموو شوێنەكاندا پاڵەوان و خۆڕاگری وەك (فەروخ شا) م نەدیوە ئەگەر مل كەچ كات بۆ ژێر ڕكێفمان ئەوا نایكوژم، فەروخ شا دەڵێ :من لە ئاین و وولاتەكەم زیاتر نیم، ئیتر كوشتیان.

بێینەوە سەر باسی گۆیژە: وەك بە دەماودەم دەڵێن ئەو ناوەی لەوەوە وەرگرتووە كە دارستانێكی زۆری پێوە بووە بەتایبەت گۆیژ، ئەم شاخە لە پشتی سلێمانی یەوە بە گۆیژە ناسراوە، كە بەرەو خواروی ڕۆژهەلات بڕۆین توشی دۆڵێك دەبی كەهەر لەسەر جادەی

گشتی چوارتاوه لەسەر شاخی گۆیژه بەلاتەریبی شۆڕدەبێتەوه بۆلای (گوندی قڕگه)، لەوێدا شاخەکه بە دۆڵی قڕگه ناودەبرێت، لەدۆڵی قڕگەش بەرەو خوار بڕۆین شاخەکه کەمێك بەرز دەبێتەوه و بە شاخی وێڵەدەر[٢٨] ناودەبرێت، لە وێڵەدەریش بەرەوخوار بڕۆین دەگەینە شاخی خەراجیان[٢٩]لێرداو لەم سنورەدا شاخەکه دۆڵاوی و هەندێ قەڵبەزاوی بەرزتر و لەوەڕگایەکی زۆر بژوێنە.. لە شاخی خراجیانیش بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆیت دەگەینە دۆڵی دوکانیان، کە دۆڵەکە کەوتۆتە پشتی عەربەتەوه لە دەستپێکه شاخی گۆیژەوه (بەسیتەکدا) شۆڕ دەبیتەوەو دۆڵێکی قوڵه، لەوێدا شاخەکەی لە یەك جیا کردۆتەوه بۆیە دەڵێن هەتا ئەو سنورە گۆیژەیە و لەوەدوا چیاکانی دامێنی گۆیژەن، ناوی دۆڵی دوکانیان لەوەوە هاتووه کەلەبەشی سەرووی دۆڵەکەدا لەسەر دووڕیانی شارباژێری دەشت و شارباژێری چیادا دوو کانی پاراوی لەم بەروبەری دۆڵەکەوه هەبووه.

بوونی دارستان

لە نزیکی تانکی ئاوەکانی سلێمانی یەوه کۆره دارێك هەبوو کە دار گۆیژ و بەڕوبوون و ناوچەکەش بە گۆیژەکە ناودەبرا، لەبەشی دۆڵەکانی نێوانی ئەزمڕ و گۆیژەدا کۆنە ڕەز و مێو، شوێن باخە هەنجیر، دار بە ڕوو دەوەنه ژاڵه و بەلاڵوك و چواله، تاکوتەرا هەبوون، لە لاپاڵەکانی گۆیژەدا شوێنی کۆپارە زەوی کە بەرزایی بچوك بچوکن، وەك گردۆڵکەی بچوك گەر هەڵت دەکۆڵی وەك ڕەگە داری پواوو کەوەك قامێکی خۆڵین وابوو نیشانەی بوونی شوێن داریان پیشان دەدا.

له دۆڵی قڕگەشدا لەبەشی سەرەوە دار بەڕویەکی مامناوەندی هەبوو، هەتا دەهاتیتە خوارەوە لێرەو لەوێ دەوەنە ژاڵە، تەڕ و زریسك، بنجە مارگیرە دەبینرا، لە دامێنیشەوە لە نزیکی گوندی قڕگەدا چەند داربەڕ و هەبوون، کەلە دۆڵی قڕگەش بەرەوخوار بچویتایە هەمان کۆیارە دارت لە نشیویەکاندا دەبینی و لە دۆڵی وێڵەدەریشدا کۆرە داربەڕو گوێز هەبوون جگە لە باخی تازە لێدراو هەرچۆن لە بنارەکانی گوێژە وەلەوێشدا دارستانی جۆراوجۆر لێدراوە، کە خۆزیام لە زووەوە تۆوی (بەڕو، گوێژ، قەزوان، ترشەسماق، چوالە، بستە.هەنجیرە کێویلە، هەرمێ) لێ بونایە، چونکە وەك کورد دەڵێ: (ئاوێك بە جۆگەیەکدا بڕوات هەر دەڕواتەوە)، گوێژەش چونکە دارستان بووە، زوو دارستان تێدا پەرەدەسێنێتەوە... لە وێڵەدەریشەوە بەرەو ڕۆژهەلات بڕۆین کەمێك ووشکانی و کەم دارە، بەڵام لە پشتی داربەڕولەو کۆزەرەقە[٣٠]وە سێ دار بەریزدا لەدۆڵێکدا هەبوون، لەنزیکی دار بەڕوەکەشەوە کۆرەدارێکی بەڕو کەناوی گوندەکەش هەر لەوەوە هاتووە، لەسەر گۆڕستانە کۆنەکەی کۆزەرەقەشدا داربەڕوویەکی گەورە هەبوو لە دامێنی خراجیانیشەوە دار بەڕویەك هەبوو، ئیتر کەبەرەو دۆڵی دوکانیان بڕۆین لە پشتی سەرەوەی دۆڵەکە داری زۆری پێوەبوو ناو دۆڵەکەش بڕۆین لە بەشی سەرەوەی دۆڵەکە داری زۆری پێوە بوو، ناو دۆڵەکەش هەندێ دەوەنە دارت بەدی دەکرد، لە دەشتی چوارتاقیشدا لە دامێنی دوکانیانەوە، دارێکی بەڕووی گەورە هەبوو کەبەدارەکەی حاجی یارە ناودەبرا، ئەم دار و شوێن دارانە کە باسمان

کــردن نیــشانەی دارســتان پیــشان دەدەن، بــەڵام ئــەو دارســتانە بەرســووتان کــەوتووە چ ســووتانی سروشــتی، چ سیاســی، دەڵێــن لەشـەڕەکەی ئیسلامدا سـووتاوە، دەشـڵێن لـە شـەڕی مەغۆڵـەکان، کـە شارەزووریان وێران کردووە سووتاوە، دەشـڵێن لەشـەڕی نێوان تـورك و ڕوســــــدا کەلەســـەر گۆڕەپـانی کوردســتان کـراوە ئـەو سـوتانە ڕویداوە(٣١).

هەڵبەت دوای خولیایەکم لە گەشتێکدا بە چیاو بەرزاییەکانی شارەزور و گوند و ئاسەوارەکاندا سەرەتا لە دوو بڕگەدا گەشتەکەم دەستم پێکرد کە چەند ساڵێك لەمەوبەر بوو، لە بڕگەی یەکەمدا لە رووکاری شارەزوور و سلێمانی دا بەناو چیاکانی گۆیژە کەلە ئەزمەر و هەرووتەوە دەستم پێکرد بۆ ڕۆژئاوا (دووکانیان و دۆڵی دووکانیان) ئەمەش بەدەست نیشانکردنی بەرزاییەکان لە ئاستی دەریاو و پێناسەیان و پێناسەی گوندەکانی سنورەکە و گەڕان بەدوای شوێنەواری دارستانی کۆنی ئەو چیایەدا.ئەم بڕگەیەم لە ژمارەی (٢)ی گۆڤاری سلێمانی دا بلاوکردەوە.

وەبڕگەی دووهەم لە ڕۆژهەلاتەوە دۆلی دووکانیان و دووکانیانەوە بۆ چیای سەیدسادق و بەرزایەکانی دەوروبەری بۆ هەمان مەبەستی سەرەوە کە ئەم بڕگەیەش ئەم چەند دێڕەی خوارەوەی بەردەستانە لە ژێرناوی (گەشتێك بەچیاکانی خرابە و دامێنیدا) ئەوەمان بیرنەچێت کە گەشتەکە بەگشتی لەژێر ناوی (گەشتێك بەچیاکانی گۆیژە ودامێنیدا و بەرزاییەکانی دوروبەری شارەزوور). لە بەشێکی تری گەشتەکەمدا لەژێر ناوی (ناوچەی هەڵەبجە)شدا پەڕیمەوە بۆ هەڵەبجە و قەڵەمڕەوی ئەو ناوچەیە، لەسەر ئەویش شتێکم تۆمار کرد کەلە گۆقاری ژمارە(٢٨)ی (سۆسیالیست) بلاوم کردەوە هەروەها لە گەشتی ناوچەی تانجەرۆ و شارەزور لە گۆڤاری هەلوێستی نیشتمانی ژمارە (٢) بلاوم کرەوە، دوایی پەڕیمەوە بۆ بناری ڕۆژئاوای شارەزوور واتا بناری بەرانان بەڕووی شارەزووردا، لەوێش خۆشترین و جوانترین و پڕ ئاسەوارترین گوندی

بنارەكەدا بەناوی گوندی باخچە شتێكم لەسەر ئەویش تۆماركردووە لە گۆڤاری ژمارە(٣٧)ی (پەیامی ڕاستی)دا بڵاومكردەوە دوایی گەڕامەوە بەناو گردە ئاسەوارییەكانی شارەزووردا و لەسەر ئەوانیش بابەتێكم نوسی و لە ڕۆژنامەی(كوردستانی نوێ) ژمارە(٤٢٩٠)دا بڵاوم كردەوە.

ئەوەی شایانی باسە لەسەر جوانترین و خۆشترین گوندی ناوچەی شارەزور(تانجەرۆ)كە(گوندی بێستانسورە)بابەتێكی بەش بەحاڵی خۆی تێرو تەسەلم تۆماركردووە.پەڕیمەوە بۆ بناری باشووری شارەزوور بە شی وارماوەی شارەزور لەوێش گەشتێكم كرد ، هەڵبەت ئەم گەشتانە لە كاتێكدا بوو ئیمكانیەتی من چ لەڕووی هۆكاری هاتوچۆ وە و هۆكاری وێنەگرتن توانام بەسەریدا نەدەشكا بۆیە زۆری بە پیادە وهەندێكیشی بە ماتۆڕ تەواوم كرد ئەگەر كەم وكورتیان هەبێ ئەوە هۆكارەكەیەتی. بۆ وەرگرتنی زانیاری كەڵكم لە بینین و بیستن و شتە دەماودەمەكان و پرسیار و هەندێ سەرچاوەش وەرگرتووە. هەرچەندە ئەمانە پەیوەندی بە گەشتەكەوە نیە بەڵام لە ڕووی مێژوویی و ئاسەواری و جوگرافیەوە توانی لەسەر(شارۆچكەی نەوسود)لە ڕۆژهەلات و كوردستانی باشوور و ژمارەی دانیشتوانی كوردستان و بابەتێك لەسەر كەركوك نوسیوە و لەسەر هەریەكەیان لە شوێنی جۆراو جۆر بڵاوم كردونەتەوە.ئیستاش وا لەخوارەوە لەژێر ناوی(گە شتێك بەچیاكانی خرابە و دامێنی و بەرزاییەكانی دەوروبەری و گوندەكانی سنورەكەدا)دخەینە بەر دیدەی خوێنەرانی ئازیز:

گەشتێك بەناو چیاكانی خەرابەو دامێندا

١. دۆڵـی دوكانیـان:ئـەم دۆڵـە كۆتـایی بـەزنجیرە شـاخی گۆیـژە دەهێـنیٚ و كەوتۆتـە نێوانـی گۆیـژە و زنجـیرە شـاخەكانی(خرابـە و چەناخـچیان).ئـەم دۆڵـە دۆڵێكـی قـولٚ ودرێـژە كـە لەپـشتی عەربـەت و گوندی چوارتاقەوە رێگایەكی قیرتاو بەناوەڕاستیدا دەڕوات.

زنجیرە شاخەكانی دامێنی گۆیژە:

لوتكەكانی بەری رۆژهەلاٚتی دۆڵی دوكانیان:

ئـەم لوتكانـە سـیٚ لوتكـەی بـە رزن ئـەوەی ناوەڕاسـتیان لـە هەموویان بەرزترە و قوچەكێكی ئاسۆییە بۆ ئەستێرەیەكی گەش. كە لـە دوای بـانگی مەغریبـەوە لـە لوتكەكـەوە ئـاوا دەبـیٚ و ئـەوەش نیـشانەی نوێـژی عیـشایە.روكـاری ئـەو دیـوی ئـە و لوتكانـە(گونـدی پوشـێن)ە گەرچـی پوشـێن لـە ناوچـەی شـارباژێر دایـە.بـەلاٚم سـەر بەناوچـەی تانجـەرۆ.عەربـەت)ە.لـە ڕوكـاری لای پوشـێنەوە دەوەنـی جۆراو جۆری زۆر پێوەیە.بۆیەش بە گوندی پوشێن ناو دەبریٚ چونكە لەوەڕگایـەكی پوشـی بـە ناوبـانگی هەیـە.ئـەم گونـدە بـە ناوبانگـە بـە میـوەی هـەلٚووژە قـادری كـە لەسـەر چـوالە موتوربـەی دەكـەن.بـەلاٚم ڕوكاری شارەزور نەداری میوەیە و نـە شـوێنەواری داری میـوە دیـارە. ئەو زنجیرە شـاخە لـە لوتكـەكانی دۆڵـی دوكانیانـەوە بـەرەو رۆژهـەلاٚت دەكشیٚ بۆ یاڵی خرابە.لەو سنورەشـدا هیـچ دارێك بـەدی نـاكریٚ هەتـا ئەچـێتە گونـدی خرابـە.بـەلاٚم لـە لوتكەكانـەوە بـەرەو پێدەشـت بـۆ خـوارەوە لەدەشـتی چـوارتاق و عەربەتـدا گۆرسـتانێكی كـۆن هەیـە و

لەسەر گۆڕستانەکە شوێنەواری کۆڕە دار بەڕوویەك بەدی دەکرا و دارێکی گەورەی بە ڕوو کە هەتا ئابلۆقەی سوتەمەنیەکەی ئەم دواییانەش هەر مابوو(بەدارەکەی حاجی یارە)ناود برا چونکە لەو گۆرستانە کۆنەدا مەزاری پیاوێکی خواپەرست کە ناوی(حاجی یارە) بوە لەو گۆرستانەدا بوو.

**شاخی خرابە**

ئەم شاخە لەو سنورەدا شاخێکی مام ناوەندی بەرزە و زۆر پان و پۆرە دۆڵێکی قولْ و پانی شێوە حەوزی تێدایە کە (گوندی خرابە) ی گرتۆتە باوەش ئەم گوندە بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێمەکارەوە خەریکن لەبەر بێ ئاوی ئاویان لە گوندی بێستانسوور دەهێنا و ئاژەڵەکانیشیان هەر لەوێ ئاو دەدا.لەناو ئاواییەکەدا چەند دار بەڕوویەك هەیە لە پشتی ئاوایشەوە لەسەر رێگای پیادەڕێی(خرابە/ شارباژێر)دەوەنە بەڕو دار گوێژە کۆڵە زۆرە.لە جێگایەکیش کە دراوی پێ دەڵێن لە خواروی ئاواییەوە دار بە روویەکی گەورە هەبوو.لەسەر ڕێگایەك کە لە خرابەوە بەرەو خوار بۆ شارەزوور(بێستانسور)دەڕوات وبە(کەرترپینەکە)ناودەبرا داربەڕوویەکی گەورە هەبوو.(لەگەڵ داوای لێبوردن چونکە ناچار بووم ناوی شوێنەکە وەك خۆی بێنم)لە ڕێگایەکی ترەوە کە لە (خرابە)بەرەو باشووری ڕۆژهەلآت و بەرەو شارەزوور دەڕوات لە بناری شاخەکەدا ئەو ڕێگایە دەگاتە گۆڕستانێکی کۆنینە.کە ئاسەواری کۆنە داری میوە دیارە و چەند مەترێکیش لەو لای گۆڕستانەکەوە بەرەو رۆژهەلآت دارێکی بەرووی گەورەی جوانی چەتر ئاسا هەبوو.کە ئاسەواری کۆڕە دارێکی لە

دەوروبەردا بەدی دەکرا. ئەو دارە جوانە(بە دارەکەی قادری حمە شریف)ناودەبرا.چونکەزەوی و زاری ئەو پیاوە لەوێدا بووە.ئەو پیاوە خەڵکی گوندی بێستانسور بووە.ئەو ڕێگایە کە بەرەو خوار لەدارەکەوە بۆ گوندی بێستانسور دەچوو بە ڕێگای دارەکە ناو دەدبرا).بۆیە بەم گوندە دەوترا خرابە کە لە کەلاوەوە هاتووە چونکە وشك و بیٚ ئاوە. بەرامبەر بەو دارە لە رۆژئاواوە(کلکەی عەربە ت)ئەمە کە زنجیرە گردێکی سروشتی لەسەر جادەی گشتی(عەربە ت.سە یدسادق)کە ٣ کیلۆمەتری عەربەت بەرەو رۆژهەلات بۆ ناو گوندی بێستانسور شۆر دەبێتەوە و کۆتاییەکەی لە باشورەوە دەگاتە سەر (گردی سەرا کۆنی شوینەواریی).ڕێگایەك بەسەر ملەو یاڵەکەدا لەگوندی بێستانسورەوە بەرەو جادەی گشتی(عەربەت.دەربەندیخان) دەچێت.ئەو ڕێگایە بەڕێی یاڵەکە ناودەبرا لەویٚ لە سەروی گوندی بێستانسوری بچوکەوە ڕێگاکە دەگاتە گۆمەڕەش و دارە ڕەش کە گۆرستان و گۆمێکی ڕەشباوە بۆیە بەو ناوە ناودەبراو دوو داری گەورەی بەڕوو و توو بەرامبەر بە یەك لەسەر گۆرستانە کە هەبوون.ئەم دارانە کە لەسەروە باسمان کردون هەتا ئابلۆقەکەش هەرمابوون.لە لاپاڵەکانی کلکەی عەربەتیشدا گۆیژە کۆڵە و رووەکە مارگیرە هەبوو.لەناوەراستی کلکەکەدا لوتکەی(مامە ڕەحمان)(گردی کچان)هەیە کەقوتەیە کی مام ناوەندیە.لە دۆڵی پشتی لوتکەکەوە زەوی و زاری مام ڕەحمان هەبوو.کە پیاوێکی تەمەن ١٢٠ ساڵی بوو.لوتکە و ریٚگا و قەڵبەزەکەی قەدپاڵی لوتکەکەوە.هەمووی بە ناوی ئەو پیاوەوە ناسرابون.لەسەر لوتکەکە ئاسەوارێکی مێژوویی هەیە،

لـە لاپاڵـەکانی ئـەم قوتەیـەدا گۆیـژە کۆڵـەو مـارگیرە هـەبوو.لـە رووی رۆژهەڵاتی(قوتەی مامەرەحمانەوە)لە پێدەشت و سەرووی بێستانسورە وە دۆڵێکـی کۆڵەکـەیی)هەیـە کـە بـە دوو دۆڵـە ناودەبرێـت.گوایـە سەرچـاوەی ئـاوی بێستانـسور کـاتی خـۆی لەوێـدا بـووە و بـەهۆی بوومەلەرزەوە بە دەماودە م دەڵێن رێڕەوی خۆی گواستۆتەوە بۆ ئەو سەرچاوەی ئێستا هەیە.جا ئەو دۆڵە ئەم بەرو ئەو بەری دارستان و قامیشەڵان بووە. ئەو دار و ڕووەکانەی کە لە سەرەوە باسمان کردون نیشانەی بوونی دارستانن لە سەردەمی پێشوودا و پێش سوتانەکان.

سەرچاوە:

١ . زانیاری ئەو باسەی سەرەوەم(لە حاجی حمەمراد خرابەیی تەمـەن ١٢٠سـاڵ وەرگرتـووە)ئـەم پیـاوەم لـەماڵی مـامم زۆرجـار دەبیـنی.بـەهۆی خزمایەتیـەوە، پیـاوێکی مێـژووزان وقـسەزان بـوو، هـەردوو جـەنگی جیهـانی یەکـەم و دووەمـی بینیبـوو.لـەکاتی ڕەیـف ڕەیف(سەفەر بەلەك)کە بردویانە لە ئەستەمبوڵەوە بە شـەو بە سۆمای ئەسـتێرەکاندا بـە چـەند مانگێك خـۆی گەیاندۆتـە ناوچـەکەی خـۆی، دوو گرانی گەورەی دیبوو وەك باسی دەکرد.باسـی ئـەو دوو دۆڵەشـی بـەو شـێوەیە دەکـرد کەلـە سـەرەوە باسـم کـردوە، هـەروەها لوتکـەی دوولـپی دوکانیـان و دارسـتانی یـاڵی خرابـە، کـە بـە دەمـاو دەم بیستبوی.

٢.(مامە رحمان)ناسراوبە (رحمان الرحیم پیوە) تەمـــــــــەن (١٢٠سـاڵ) خـەڵکی گونـدی بێستانـسور دەربـارەی زانیاریەکانـی سەرەوە و(کلکەی عەربەت)و یاڵ و قوتەی مام رحمان زانیاری دامێ.

٣. (حـاجی حمـه أمـین قالـه عاسـیٚ)تەمـەن(١٢٥سـالٚ)خەڵکـی گوندی بێستانسور ئەو پیاوەش پیـاوێکی خێرەومەند و مورید بوو، چـەخماخ سـازی تەقەمـەنی بـوو، لـە مـیزی ئـاژەڵ و قارچـکە گوڵانـە (کەجۆرە قارچکێکە لەئاوو پاشماوەی(مەڕ و بزن)پەیدا دەبێت باروتی لیٚ دروست دەکرد.ڕاوچیەکی چاك بوو.دەربارەی دوو دۆڵەش دەیووت کـاتی خـۆی سەرچـاوەی ئـاو بـووە.خـۆم دارو قامیـشم لیٚ بڕیـوە ڕاوە ماسیـــشم تێـــدا کـــردووە بـــەدەماودەم بیـــستبوی کـــە سەرچـــاوەی بێستانـــسور کـــاتی خۆیـــی لـــە دوو دۆڵـــەدا بـــووە و بوومەلەرزەیـــەك گواستویەتیەوە ئەو جێگایـەی ئێستای.دەربارەی دارستانی قـەڕەم و ژاژی شـارەزوور دەیـووت لـە بێستانـسور تـا سەرچـاوەی قومـاش بـە هەزار حالٚ سوار بە ناو بێشەو جەنگەڵدا دەئاژوو.دەیووت دەچووینە ڕاوە بـەراز سـەردەمێك گوێـچکە بـەراز لـە لایـەنی میریـەوە موکافەئـەی هەبوو.. وە دەیوت خۆم لە و یاڵانە دارم بڕیوە و لەگـەلٚ متومورودا لـە ماڵـــە جولەکەکانـــدا لـــە کـــاتی لاویمـــدا و لەکـــەلٚ کـــچە جویـــەك ڕێکـەتبوم.جارێك باوك و براکانی پێیـان زانیم و لـە تـەکیانا کەوتمـە شەڕ.بەڵام من بە چڵە دارێکی کوڵەکەی خـۆم تێیـان کەوتم و هەرچۆن بوو خۆم لە دەستیان ڕزگار کرد بەسەر پەیژەکەیاندا بازمدا بۆ کوڵـان بۆی دە رچووم.

٤. (حمـە أمـین قـادر حمـە شـریف)یـش پیـاوێکی بێستانـسوری تەمـەنی ٧٨سـاڵی بوو بـە هـۆی ئـەوەوە کـە لـە گونـدێکی تـر پیاوێکـی کوشـتبوو لـە سـلێمانی دادەنیـشت زانیـاری (دارە کـە ی قـادری حمـە شریف) دامیٚ کە باپیری خۆی بووە.

لەدامێنی ئەو دارە دەشتێك هەیە ڕێگەیەك دەدات بەناویدا بەرەو چاڵە پان، کەلە خوارەوە باسمان کردووە بەم دەشت وڕێگایانە دەوترێ دەشتی زریسکەکە چونکە ڕووەکە زریسك و شوێنەواری کانی و ئاو لە وێدا هەبووە، هەر لەو دەشتەدا جۆرە بەردێك هەبوو کە بە (گوئاسن)ناسرا بووە کە بەدەماودەم ئەڵێن لەقەڵبەزی مامە ڕەحمانەوە کە باسمان کردووە بورکانێکی بچووك رویدا کە پێدەچێ بگەرێتەوە بۆ٥٩٤ز کە ئەو روداوە هەبوو.شەرارەی ئاگر لە قەلبەزەکەوە گەیشتۆتە ئەو دەشتە و ئەو جۆرە بەردەی لێ کەوتۆتەوە.ئەو بورکان و بومەلەرزەیە هاوکێشەی بورکانەکەی پیرە مەگرونی کۆنە.وەکو وتومانە لەسەر لوتکەی مامە رەحمان یا(گردی کچان)ئاسەوارێك هەیە ئەو ئاسەوارە ماڵی یەکێك لە سەرکردە سەربازیەکانی ئەسکەندەری مەقدۆنی بووە کە کچێکی لە هیندستانەوە بە غەنیمە هێناوە لەوێ نیشتەجێی کردوە.دووپشکی نێوان عەربەت و شارەزور بە ناوبانگە بۆ کوشتار. بۆیە شەو لەناوێك کچەکە دووپشك پێوەی دەداو دەمرێ پێدەچێ ئەفسەرەکەش خۆیی کوشتبێ.لە ناو گوندی بێستانسور گۆرستانێکی کۆنی ئەو سەردەمە هەیە کە بە گۆرستانی کێلەبەرزەکان یان بەرامبەرەکە ناسرابوو پێدەچێ ئەو کێلە بە رزانە کە لە دوو مەتر بەزتربوون گۆری ئەو دوو کەسە بن بە دەماودەم.لەدامێنی دەشتی زریسکەوە گۆرستانێکی نادیار هەبوو بە کێلە سپی دەناسرا کە پێدەچێ لەسەر هاوکێشەی ئەسحابەسپی و ئەسحابەدرێژ و...هتد، ئەو ناوەهاتبێ وە ئەمە گۆڕی سە ردەمی داگیرکاری عەرەبەکانە چونکە لەدامێنی ئەویشەوە

گۆڕێکی بەکۆمەڵ هەبوو کە بە گۆڕی گەوری ناودەبرا ئەمەش ئەو کوردەشارەزوریانە بوون کەبەرگریان لە خاك و ئاو و ئاین و کەرامەتی خۆیان کردووە دوای کوژرانیان بەکۆمەڵ خراونەتە ژێر گردۆڵکەیەکەوە.کە بە داخەوە ئەوان بە گاور و ئەوانی تر بە پیرۆز ناودەبرێن.لە ڕۆژهەلاتی ئەو شوێنەشەوە گۆرستانێکی کۆنینە هەر هی ئەو سەردەمە هەیە کەمەزارێکی تیایە ئێستاش گوندی(زێرێن جۆ)مردووەکانیان لەوێ دەنێژن ئەم گۆرستانە و ئەو دەشتە بە تەپە عەرەبان ناودەبرا کە ئێستا(تاڵ عەرەوانی)پێدەوترێ چونکە ئەو شوێنە پێ دەچێت سەربازگەی داگیرکەرە عەرەبەکان بووە تاڵە عەرەبان لە تل عەربانەوە هاتووە کە ئێستا سوککراوە بۆ تاڵە عەرەوان.وە هەر لەبەرامبەری گۆڕی گەوریشەوە لەرۆژئاواوە لە ناو باخ و دارستانەکەدا لە ناوچەم و ئاوەکەدا دوو گۆڕستانی بچووك هەبوون کەیەکێکیان وەك گۆڕی بەکۆمەڵ وایە هیچ ناو و ناتۆرەیەکی نەبوو دەکەوێتە بەرانبەر بە ئاشێك کە بە(خەرگەڕەش)ناسرابوو.ئا لەوێدا کانیەکی پیرۆزی جوان هەیە کەئەویش بە کانی خەرگەرەش ناسراوە.خەرگەرەش پیاوێکی زاهیدی کورد بووە.

گۆرستانەکەی تر کە مەزارێکی تیابوو لەسەر بەرزاییەکی بچوك کە دەکەوتە سەر جۆگای ئاشێك کە بە ئاشی کاك ئەحمەد ناو دەبرا ئەم مەزارە بە مەزاری وە یس ناودەبرا بە پیرۆزی سە یر دەکرا چونکە دەگەڕایەوە بۆ ئەو کاتەی کە لە سەرەوە ناومان بردووە.ئەم وەیسە وەیسی مایدەشتە نەك وەیسی قەرەنی کە باس دەکرێ و یەکێك نیە لە عەرەبەکانی کە لە سەرەوە باسمان کردوە.

ج. کلکەی چەناخچیان

١. کە لە دارکەی قادری حمەشەریفەوە بەرەو ڕۆژهەڵات(کلکەی چەناخچیان)ناو دەبرێت و کۆتایی زنجیرە شاخی خرابەیە لەو کلکەیەدا نزمترین بەشی زنجیرە شاخەکەیە و ووردە ووردە هێلکەیی لەسەر پردی چەناخچیان لەگەڵ زەوی یەکسان دەبن.

بەڕوی ڕۆژئاوادا لە ناوەڕاستی کلکە و یاڵەکەدا دۆڵێکی پان و پۆڕ هەیە کە بە چاڵە پان ناودەبرێت پیادەڕێ و کاروانەڕێی شارەزوور و بەرزنجەیە، لە چاڵە پان و دەوروبەریدا نیشانەی شوێن داری بەڕوو چواله بەدی دەکرا، بەڕووی ڕۆژهەڵاتیشدا لەودیوی چاڵەپانەوە گوندی چەناخچیانە کە گوندێکی وشك بێ ئاوە و دانیشتوانی کۆچەرن و لە هۆزی بێسەرین.

لە بەردەم ئاواییەکەدا داربەڕویەکی مام ناوەند هەبوو کە بەرەو نشێوی بچویتایە داری گۆیژەکۆڵە هەبوو.

– کلکە بە مانای کۆتایی زنجیرە شاخ کە بەرەو نزمی دەچێ و شێوەیی هێلکەییە.

– یاڵ بە شوێنێك دەوترێت کەزنجیرە گردۆڵکەیەکی سروشتی مام ناوەندیە و ڕێگەیەك پێیدا دەڕوات لەم دیو بۆ ئەودیو کە ئەمە ملەو یاڵیشی پێدەوترێت، هەرچی(قوتە یان لوتە)شە ئەوە لوتکەیەکی بەرزە لە ناو زنجیرە گردۆڵکەی سروشتیدا.دەشبێت بڵێین بە لوتکەیەکی بچوك دەوترێت لوتە کە بچوك کراوەی لوتکەیە.

کلکەی چەناخچیان بەردەڵانی و ڕەقەنە بەردی چەخماخی زۆرە کە لەگەڵ ئەستێ کە ئاسنێکی سێگۆشەیە ئاگری پێ دەکرایەوە هەر

بۆیە ئەو ناوچەیە چ پردەکە چ ڕێگاکە و چ گوندەکە چ کلکە و یاڵەکە هەموی لە سۆرخی ئەو بەردە چەخماخانەوە بووە بە(چەخماخ چیان) پاشان بووە بە چەناخچیان.زانیاری ئەم سنورەم لە مام تۆفیق ئاڵتون تەمەن ٨٥ساڵ خەڵکی گوندی چەناخچیان و(رحیم سارایی)خەڵکی گوندی هەنجیرە تەمەن ٧٥ساڵ وەرگرتوو. هەروەها پێدە چیٚ لە (قەرە چەناخە واتە زۆر ویٚژەوە هاتبێت چونکە خەڵکی ناوچاکە تیژڕەو بوون لەڕوی عەشایەرییەوە ئەم کلکە و یاڵ و زنجیرە گرد و شاخانەی خوارەوەش بەزنجیرەکانی دامێنی گۆیژەو لقەکانی دادەنرێن چونکە تەواوکەری ئەو زنجیرە شاخانەن کە نێوانی شارەزوور و شارباژێردا کشاون گەرچی لەچەند جێگەیەکدا لێك دابڕاون بەلاّم وەك ووتمان بەدەماودەم وتراوە کە سنوری شارەزور و شارباژێردا کشاون ئەو زنجیرانەش ئەمانەن:

یاڵی هەنجیرە ئەم یاڵە دەکەوێتە ٣ کیلۆمەتری بەری ڕۆهەلاّتی کلکەی چەناخچیان کە کەوتۆتە سەر ڕێگای بەرزنجە و گوندی هەنجیرە کوێرە دێیەکی بیٚ ئاوە کانیەکی کەم ئاوی هەیە گوندەکە پالّی داوە بەسەرەتای دەستپێکی یاڵەکەوە، لە بەری ڕۆژئاواییدا داربەڕویەکی بچوك هەبوو لە پێشتی ئاوایشەوە لە سەر مەزاریك دار بەڕویەکی گەورە هەبوو دەوروبەری کوێرە کانیەکە و لاپاڵەکانی یاڵەکەش شوێنەواری دار هەنجیری زۆری پێوە دیار بوو گوندەکەش هەر بەو ناوەوە ناونراوە)ئیتر ئەو ملەو یاڵەو شۆر دەبێتەوە بۆ پشتی گوندی کانی پانکە و گرێزە و لە لوتکەی هێلانە چەرخ کۆتای بەو زنجیرە یاڵەکە دێت هەر لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەو لوتکە و یاڵە

شـوێن ئاسـەواری داری بـەڕو هـەنجیر و گوێـژە و بـەلاڵوك و ڕووەكـە زریـسكی پێوە دیـارە و دەمـاودەم دەلێـن ئـەو ڕووەكانـەی زیـاتر پێوە بـووە ئێـستاش لاپاڵـەكانی هێلانـە چـەرخ پێدەشتەكانیـشی بـە دارسـتانی سـنەوبەر و داری میوەهـات لێـدراوە.لـە دامێـنی یاڵەكـەوە لەسـەر گۆڕسـتانەكەی كـانی پانكـە داربەڕویـەكی گـەورە هـەبوو، و لەڕوی ڕۆژهەلاَتیشەوە لە دامێنی هێلانە چەرخدا و لەبەردەم گوندی گرێـزەدا داربەڕویـەك و دارتوویـەكی كۆنـە سـاڵ هـەبوون لـە پێدەشتی گرێزەدا لە ڕۆژهەلاَتـەوە بـە نزیكـی ١,٥كم لـە گرێـزەوە لەسـەر جادەی گشتی دار بەڕویەكی گـەورە هـەبوو كـە ئەمانـە هـەموو نیـشانەی بونـی دارستانن لە كۆندا.

كـانی پانكـە دوو گونـدن لەسـەر جـادەی سەیدسـادق و زۆر ئـاوەدان و پێـشكەوتووە گومێكـی پـان كەوتۆتـە نێوانیـان و نـاوی گوندەكە لەو گۆمەمانەوە یان كانیە پانەوە هاتووە دەڵێن(كانی پانكە) گردی شوێنەواری جوانیش لە لای گۆمەكە دایە.

گرێـزە گونـدێكی ئاوەدانـە كەوتۆتـە لاپـاڵی بـەری ڕۆژهەلاَتـی لوتكە ی هێلانە چەرخ ناوەكەی لە گردە لێژەوە هـاتووە كـە پـاڵی داوە بە لاپاڵەكەوە یـان لـە گرێ ڕێ وە هـاتووە چـونكە ئـەو زەویـەی ڕەقەن بێت و كەوتبێتە لاپاڵ ئەوە بە(گرێ ڕێ)ناو دەبرێت زەویەكانی پشتی بنە جـوت و گرێـزەش لـەو جـۆرە زەویـەن، بۆیـە پێدەچـێ نـاوی گرێـزە لـەوەوە هاتبیـت ئـەم نـاوەش لەسـەر زەمـان سـوك كـراوە بۆتـە گرێـزە. بنەجوت گوندێكی كاتی بووە بۆجوتیارەكان.

هێلانە چەرخ: ئەمەلوتکەیەکی بەرزە و هەندێ رووەك و بنچکی تا ئێستاش پێوە ماوە  و شوێنەواری گەلێك روەکی میوە دیارە لەم لوتکە و کەورگانەدا جۆرە باڵندەیەك هەیە  کە وەك باز وایە بە چەرخ ناودەبرێت بەهەمیشە لەو بەرزایانەدا هێلانەیان کرددوە و  بۆیە ئەو لوتکە یە بە هێلانە چەرخ ناودەبرێت.زانیاری ئەم سنورەم لە حاجی ملا مجید  کانی پانکەیی خەیات تەمەن٧٥ساڵ و حاجی ملا رحیم تەمەن٦٥ساڵ و مام رحیم  سارایی وەرگرتووە کە خۆیان بینیویانە و بە دەماو دەم بیستویانە.

کلکەی موان:ئەم کلکەو یاڵە دەکەوێتە بەرامبەری گوندی گرێزە لە باشورەوە بە نزیکەی(٢) کم و کلکەکەی بە پشتی گوندی موانەکاندا لەرۆژهەڵاتەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە کشاوە، دەست پێکی ئەم یاڵە لەمەزاری (کاکە میر)ەوە دەست پێدەکات کەمەزاری لاوێکی خواناسی کوردە خەڵك چوارشەممان بۆ چارەسەری نەخۆشی باداری دەچنەسەری چواردەوری مەزارەکە دارستانە بە (توو، بەڕوو، چنار، بی) کۆنە ساڵە.ئەگەر لەوێوە بە یاڵەکەدا سەرکەوێت لە لاپاڵ و دۆڵ و نشێوەکانیدا(گۆیژە کوڵە، زریسك،بنچکەمارگیرە،داری بەڕوو)دەبینیت و ئاسەواری شوێنی رووەکیش زۆر دیار بوو هەرە دارە دیارییەکانی ئەم یاڵە دوو داری بەرووی گەورەبوون کەلە دۆڵێکی بەری رۆژهەڵاتی یاڵەکە وە بوون بەرامبەر  بەجادەی گشتی سەیدسادق.لەدامێنی یاڵەکەشەوە مەزاری (مەحمودی سەرەواڵە) هەیە  کەئەمیش پیاوێکی خواناسی کورد بوە کۆرە دارێکی(بەڕوو، توو)ی لەسەرە.جافە کۆچەرەکان شتی گرانبەهایان لەبن ئەو دارانەدا داناوە هەتا لە

کوێستان گەڕاونەتەوە لەبەرپیرۆزی و لە ترسی مەزارەکە کە کەس نە یتوانیوە دەستیان بۆ ببات.ئەم کۆڕە دارانە نیشانەی  دارستانن لە کۆندا بۆ ئەم یاڵ و سنورە.

موان: چەند گوندێکە لە ناوچە یەکدا کە ئاودار و کشتوکاڵ دارن، چەم و زنجیرەیاڵ و گوندەکە و گردەکە هەموویان ناویان موانە ئەمیش لەوەوە هاتووە کە پیاوێکی (مغی) کەخەلیفەی زەردەشت بووە دوای تێکشکانی(گومتا)ی(مغ)کە یەکێك بووە لە پەیڕەوکەرانی ئاینی زەردەشتی لەپاش(ئەستیاك) دوا پاشای ماد بووە.ئەو پیاوە (مغە) کەهاتووە بەمدیودا لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بووە بە ئاینداری و بە خێوکردنی رەشەولاخەوە خەریك بووە خەلکی ناوچەکەش رێزیان لێگرتووە هەتا ئێستاش هەر رەشە ولاخێك هەڵکەوتوو چاك و رەسەن بێت دەڵێن ئەوە گای مغانییە، ئیتر ناوچەکە ناونراوە مغان بە ناوی ئەو پیاوەوە پاشان لەسەر زمان ئاسان کراوە بۆ(موان)یاخود لەژێر کاریگەری ئاینی ئیسلامدا بوبێتە موان لە مغانەوە.

خەڵکی ناوچەکە تا ئەم دواییانەش کەواو سەڵتەیان لەبەر دەکرد پشتوێنێکی حەوت لۆیان بەسەردا دەبەست لەبەر کەمەریاندا( ٣)قۆیان دەخستە پشتێنەکەوە ئەم لە ڕووانگەی مغەکانەوە بووە کە ئەوان لە هێمای زەردەشتەوە وەریان گرتووە کە حە وت لۆکە حەوت ڕەگەکەی خۆرە و(٣)قۆکەش بە واتای (وتەی چاك، کرداری چاك، بیر و فیکری چاك)کە دژی کارە خراپەکانە.

ئەم زانیاریانەم لە ملا تایەری موان کە پیاوێکی ئەدەب دۆست و زاناو قسەزان بوو لە ماڵی خۆیان بۆی باس کردم  و کتێبی کۆماری

ئەفلاتونی پێشکەش کردم. هەروەها لە کتێبی (دراسات کوردیە)ی د.جمال احمد رشید باسی ئەم ناوچەیە و مغەکانیش لەو سۆراخەوە دەکات.

یاڵی کانی سپیکە: ئەم زنجیرە یاڵە کەوتۆتە بەرامبەری گرێزەوە، نزیکەی ٥کم لە ڕۆژهەڵاتەوە. کانی سپیکەی پەرخ گوندێکە پاڵی داوە بە دەستپێکی زنجیرە یاڵەکە وە لە بەشی سەرەوەیدا دەوروبەری گوندەکە(٢-٣) دار بەرِوی تیابوو لە یاڵەکەشدا دوو دار هەبوو، بنچکە مارگیری لە گەلێك شوێنی ئەو لاپاڵەدا هەبوو ئەم زنجیرە یە شۆڕ دەبێتەوە بۆ دۆڵی قە ویلە کە گوندێکی وشك و بێ ئاوە لەم دۆڵەشدا دار بەڕویەك هەبوو ئیتر بەرەو ڕۆژهەڵات هە تا بێت زنجیرە یاڵەکە بەرزتر دەبێتەوە تا دەگاتە دۆڵی سەراوی سبحان ئاغا وسەرچاوەی گۆمی سەراو.لەولاپاڵ و دۆڵاندا شوێنی دار بەدی دە کرا، دەوروبەری گۆم و سەرچاوەکان کۆرە دار بووە، ئێستاش دارستانی سنەوبەر لەسەر شێوەی تازە لێدراوە داری گۆیژە کوڵ و روەکی مارەگیرە لەولاپاڵانەدا بەدی دەکران.ئەم زنجیرەیە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕوات هەتا دەگاتە چیای سەیدسادق ئە م چیایە سەخت و لوتکەدارە و بووە بە دوو بە شەوە (شارۆچکەی سەید سادق و چەمی چەقان) دەداتە ناوەراستیدا ئەم لوتکانە تاوێری گەورەیان پێوەیە شوێن ئاسەواری داری گۆیژە و بەلاڵوك و زریسك و رووەکی مارەگیرە و بە ڕووی پێوەیە دیارە ئێستاش مارگیرە و کۆیژە کوڵەو دەوەەنە بەڕوی کەمێك پێوەیە لێرەو لەوێ و تاکو تەرا.ئەم زنجیرە چیایە بەرەو باکوور هەڵدەکشێ بەرەو دۆڵەکانی کەولۆز.ئا لێرەدا

دەردەکـەویٚ کەئـەم زنجیرە شـاخ و چیا و یاڵانـەی باسمـان کـردوون لەسەرەوە.بە هەردوو دەڤەری شارەزور وشاربازێر یان کردووە بە دوو بەشــەوە.. لەهەموشــیاندا شــوێنەوار و دیــاردەی بونــی دارســتان دەردەکەوێت وەك لەسەرەوە باس کراون.جار نەجارێك بەڵکو چەندین جـار بەرسـوتان کـەوتون سـوتانی سیاسـی و سروشـتی بـە هۆکـاری نادیار. هەتاوەك ئێستا بونەتە روتـەن.بەڵام ئەوەتا خەریکە و لێرە و لـەویٚ لـەم زنجیرانـەدا دارسـتان نـویٚ دەکرێتـەوە.بـەو هیوایـەی کـە هەنگاوی باشتری بۆ هەڵگیریٚ، بۆ هەموو زنجیرە شاخانەی سەرەوە(بە ڕەز و مێـو و چـواڵە و هـەرمیٚ و هـەڵوژە قـادری و گۆیـژە و بـەڕوو و ترشــەسماق و بـستە و چــەقالە و شـیح و هــەنجیر و هــەنار و داری دارستانی جۆراو جۆر و لە ڕیگـای بیری ئیرتوازیـەوە ئـاودار بکریـت و لـەو شـوینانەدا دەگونجیٚ هـەتا ببنـە جێگـای سـەیرانگاو حەوانـەوەی خــەڵکی ووڵــات و دەرەوە وە ئاوهــەوای ناوچــەکە بگــۆڕن لــە ڕووی ئاڵوگۆڕی هەواوە دەرامەتی دەڤەرەکەش باشتر بکەن.

کـانی سـپیکەی پـەرخ گونـدێکی بچووکە خـە لکەکـەی(لـەهۆزی بـەرخ)ین و کانیـەکی سـپی بچوکی هـەبوو بـەو نـاوەوە نـاونراوە کانـی سـپیکە.خـەڵکی ئـەم گونـدە بـە کـشتوکاڵی دێمـەکارە ئاژەڵداریــەوە خەریکن.زۆرجار کۆچیان بۆ کویستان بۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن و لەبەر بیٚ ئاویی، خەڵکی ئەو گوندە لە سەراوی سوبحان ئاغا ئاو دەهێنێت.

گونـدی قەویلـە:ئەمـە گونـدێکی ووشـك و بیٚ ئـاوە ولـە سـەراوی سوبحان ئاغا ئاو دەهێنێن و هەندیٚ جار کۆچ دەکـەن بـۆ کوێـستان بـۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن و کشتوکالی دێمەکاری خەریکن.لە هۆزی قەویلەین

سـەراوی سـوبحان ئاغـا: ئەمـە گونـدێکی ئـاوەدان و ئـاودار و خاوەنی کشتوکاڵی بەراوی بەرەکەتن. دوو گۆم لەناو دۆڵەکەی پشتی گوندەکەوە هەڵدەقولێن لە کۆندا دارستان بوە و بە دەماودەم دەڵێن ( ١٢) سـوارەی مـەریوان دوای گەڕانـەوەیان لـە راوە بـەرازە لـە بـن ئـەو کـــۆرەدارەدا حەواونەتـــەوە و نەخـــشەی پـــەلاماردانی ئەرتەشـــی داگیرکـەری ئێرانیـان بـەلای مەریوانـدا هـەر لـەوێ دانـاوە.ئەمـە بـە دەمـاودەم باسـکراوە. وەهـەر بـەدەماودەم دەڵێـن نـاوی ئـەم گونـدە سەرچاوەکەو یاڵەکـەی ئـەم سـنورە لـەوەوە هـاتووە کـە گوایـە رۆژێـك کابرایـەکی رێبـوار لەپـشتی گۆمەکانـەوە کـە ئەوسا هـەموی پیـادەڕی (کاروانـەڕێ)بـوە سـوارەکە کـە دەگاتـە سـەر ئاوەکـە.ئەوسا دیـارە زۆر قـوڵ و گـەورە بـوە جـا کـابرا لا دەداتـە سـەر گۆمەکـە و ماینەکـەی رادەگرێت و خۆی دەڕوات دەست بە ئاو بگەیـەنێ ماینیش خەریکی ئاو خواردنەوە و لەوەڕاندن بوە لـە گوێـی گۆمەکـەدا لـە ناکـاودا پیـاوە سەیر دەکات ئەسپێکی ئاوی لەگۆمەکـەوە دەرچووە و یـەکێك دەڵێت لـــە ماینەکەپـــەڕیوە وە یـــەکێکیش دەڵـــێ ماینەکـــەی بردۆتـــە نـــاو گۆمەکـەوە.ئیتر لـەو رۆژە وە ئـەو ناوچـەیە بـە(سـەرای سـوبحان ئاغـا) ناودەبرێت.چونکە کابرای سوارە ناوی(سوبحان ئاغا) بووە.

چـیای سەیدسـادق کـە ئێـستا دوو بەشـە دوو لوتکـەی بـەری رۆژهەڵاتی شارۆچکەکە و چەمی چەقان و بەری لای ڕۆژئاوایی.دەڵێن ئەم چیایانە خۆی پەیوەست بون.بەڵام لە ئەنجامی لافاوێکی زۆر کە لەدۆڵەکانی کەوڵۆزەوە هـاتوە و چـەمی چـەقانی دروسـت کـردووە ئـەو شاخەی دابڕیوە لەیـەك.چـەمی چەقان ئەوسا چـەمی(چەقان)بوە یـان

چیغان لەبەر زۆری رووەکی تەرکە و چیغی لیٚ دروست کراوە.ڕیٚرەوی ئەم چەمەش پیٚش ئەو لافاوە بەرەو شارباژێر بووە.ئەم چەمەمەش هەردەم لە زەمانی سەفەوییەکان و عوسمانیەکاندا کە کوردستانیان داگیردووە سنوری نیٚوان ئیمراتۆریتەکە یان بووە ... دەشلٚیٚن شەڕیٚکی خویٚناوی لەسەر چیای سەیدسادق رووی داوە کە پیٚدەچیٚ شەڕی مەغۆلەکان بیٚت. کوڕیٚکی لاوی خوا پەرست نزای کردووە چیاکە دووبەش ببیٚت و سوپای دوژمن دەستەپاچە بن و چیاکەش دووبەش بوە و دوژمن هەر بەردەوام بوە لە پەلامار هەتا ناوچەکانی گرتووە. گۆری شاعیری ناسك خەسالٚ (وەلی دیٚوانە) لەسەر گردەکەیە لە ناو گۆرستانەکەدا.زانیاری ئەم باسەی سەرەوەم لە (حاجی محمود رحمان) کە پیاویٚکی قسەزان بووە.تەمەن ٨٠ سالٚ زیاتر دەبوو. لەسەردانیٚکدا لەمالٚی خۆیان و گوندی سەراو ئەو باسانەی کردیان لەسەر دەماودەم بۆ گیٚڕامەوە و جاریٚکر تریش لە دوکانی(کاك فایەق) ناسراو بە فایەق فەنی سەرۆکی تیرەی شیٚخ سمایلی چاوم کەوتەوە بە حاجی ناوبراو هەمان باسی کرد لەسەر داوای خۆم و کاك فایەقیش وتی ئەمە دەماو دەمیٚکە کە هەردەم وا باو بوە.بەلاٚم ڕای لافاوەکە راستترە لە مەسەلەی شەڕەکە بۆ دووبەش بوونی شاخەکە.لە دامیٚنی چیای بەری رۆژئاوای(سەی سایەق)بە تەنیشت سەراوی سوبحان ئاغاوە گوندیٚك هەیە بە نای (قلرخ)دانیشتوانی لە هۆزی (کەمالٚەیی)ین کاتی خۆی ئەو شویٚنە پەچەڕانی هەمان هۆز بووە و کەلەویٚدا نیشتەجیٚ بوون پیٚ دەچیٚت ناوی گوندەکە لەو پەچەڕانەوە هاتبیٚ چونکە لە ریخی پەچەرانەکەوە هاتوە.

لــه ســێ کیلۆمــەتری ســەروی (ســەید ســایەق) لــە ســەر ڕێــی (پێنجوێن) گوندێکی گەورە هەیە بە ناوی (شانەدەری)کە دانیشتوانی لە هۆزی (شێخ سمایلی)ین.

*** 

وەکو زانراوە بە درێژای مێژوو شارەزوور لانکی شارستانیەت بووە، کە هۆزەکانی (گۆتی و لۆلۆیی) دەولەتێکی ڕامیاری و سەربازی و ئیداری تۆکمەیان لە نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش زایندا دامەزراندوە بە ناوی دەوڵەتی (زاموا ) کە ئەم گۆتی و لۆلۆییانە بە پاڵەوانی مێژوو ناسراون وە ئەمانە باپیرە گەورانی کوردبوون.

پایتەختی ئەم دەوڵەتە قەڵای (یاسین تەپە) ی ئێستا بوە لە شارەزوور لە باشوری گوندی بێستانسورەوە کە تەنیشتی ڕۆژهەڵاتی خاك و خۆڵە، ئەم قەڵایە هاوشێوەی قەڵای (کاکۆك) ە کە قەڵای کەرکوکی ئێستایە کە بە قەڵای تۆکمەی کاکە ناسرابوو.

هەرچی ئاسەواری کۆنی ئەم دوو قەڵایە یە دەچنەوە سەر یەك و سەر زەمەنی گۆتی یەکان خگە لەوەی کە قەڵای یاسین تەپە لەو بچوکترە.

قەڵەمڕەوی دەوڵەتی زاموا هەموو کوردستانی ئێستا بووە و زیاتریش، ئەم دەوڵەتە بە درێژای مێژووی تووشی گەلێك ململانێ و شەڕ و شۆڕ هاتووە، لە تەك بابلی و سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوری و تەناتەت لە تەك (پرسیدەکان) کە دەوڵەتی فارس بوون. لەم شۆڕشانەدا گەلێك سەرکەوتن و تێکشکانیان بەخۆوە دیوە هەتا دوا جار بەیەك جاری تێك شکاون. لێرەدا نمونەیەك دەهێنینەوە، کەئەکەدییەکان زلهێزی سەردەمی دوو هەزارەی پێش زایین بوون بە سەرکردایەتی (نارام سین کوری سەرجۆنی ئەکەدی ) هێرشێکی فراوانی کردە سەر گۆتی یەکانوبە سەرکەوتنیان، خۆی لە (کارداکا ) کە قەرەداغی ئێستایە دانیشت و کوڕەکەی کە لاوێك بوو ناوی

(شارکاڵ) بوو لە یاسین تەپەی پایتەختی گۆتی یەکان نیشتە جێ کرد وە نازناوێکی کوردی لێنا بە ناوی (شارگشتی) واتە پاشای شاران.. ئەم داگیر کارییە خایاندی هەتا هۆزە گۆتی و لۆلۆی یەکان لە بزوتنەوەیەکدا بە سەرکردایەتی (ئەلۆلۆمیش)بۆ یەکەم جار سەرنەکەوتن، وەڵێ بەردەوام بوون لە بزوتنەوەکە هەتا بۆ دووەم جار بە سەرکردایەتی (ئانۆپات) (ئانۆ بانینی) ئەم جارەیان بۆ دوا جار ئەکەدییەکانیان بەزان و دەوڵەتی زاموایان تونـدوتۆڵ کـرد و پایتەختیان هەر یاسین تەپە بوو. هەندێ جار پایتەختی زستانەیان ئەبردە قەلاّی کاکوك کە لە سەرەوە ناومان هێناوە و پێدەچێ ئەو سەردەمە دروست کرابێ.

هەر بۆیە بەهەر چواردەوری قەلاّی یاسین تەپەدا لە ناوچەی شارەزوور کە لەبەر بە پیتی و بە بەرەکەتی ناوچەکە ململانێی زۆری لەسەر بووە، گردی زۆر بە هەر چواردەوری یاسین تەپە دوور و نزیك بۆ چاودێری بەرگری دروست کراون بۆ ناوچەکە کە لە دوایدا ناویان دێنین.

جا لێرەدا پێویستە باس لەوە بکەین کە ئەو ئاسەوارانە جێدەستی گۆتییەکانی باپیرانمانن نەك هی هیچ لایەکی تر. کە بەداخەوە سەرچاوە داگیر کارەکانی ناوچەکەو تەنانەت نێو دەولەتیش کە بەکرێ گیراون بەرژەوەندیشیان وایە کە ئەو شوێنەوارانە بدەنە پاڵ فلاّن دەوڵەت فیسار چاخ و سەردەمی تر کەچی دیسان بەداخەوە مێژوو نوسان و ئاسەوار ناسانی خۆشمان هەر گرنگی بەو سەرچاوە چەواشانە دەدەن کە دەبوو بۆ بنەماکەی

بگەڕێن. دیارە فلاّن دەوڵەت و فیسار سەردەم ئەم ناوچەیەیان داگیر کردوە و (مۆرك و نیشان کردو پەیکەرو هەندێك دابوو نەریت و تەنانەت دراویشیان لەم ناوچەیەدا بەجێهێشتووە) بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم دەڤەرە ببێتە ئاسەواری ئەوان.

﴿بەندە ( ا. ك. ج ) لە بۆنەیەکی تردا باسی ئاسەوارەکانی داگیرکەرانم لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ (ژ. ٢٦٣٠) دا بلاّو کردۆتەوە و کەناڵەکان گرنگیان پێ دا کە ئەوە ڕاستە نەك سەرچاوە چەواشەکان﴾

ئەم جارەش لە گەشتێکدا بەناو گردەکانی ناوچەی شارەزوردا گەڕام و ناوەکانیان و شوێنەکانیانم دەست نیشان کرد، کە کۆمەلێك گردو قەلاّی شوێنەواری سەردەمی (زاموا) ن و لە شێوەی نیوە هێلکەیەك قوچ بونەتەوە وەك وتمان بۆ پاراستنی شارو گوندو ناوچەکەو چاودێرییان..

گردەکان

١. یاسین تەپە:.ئەم قەلاّیە قەلاّیەکی لاکێشەیە لە گوندی بێستان سور کە بەرزییەکەی بیست و پێنج مەتر دەبێت و درێژی یەکەی نزیکەی دووسەدو پەنجا مەتر دەبێتبە هەر چوار دەوریدا لە سەرەوە ستارەی خۆلینی هەیە کە نزیکەی دوو مەتر بەرزە لە هەر چوار گۆشەیەکەوە مەتەرێزی چاودێری بەرگری هەیە.

لە ڕوی باکورەوە لە ناوەڕاستەوە قشڵەیەکی ئیداری و نیشتەجێی هەیە لە ناوەڕاستی ڕوبەری سەرەوەیدا شوێنێك هەیە

پێی ی دەوترێت زیندان لای باشوری قەڵاکە ڕوباری تانجەرۆیە، سێ لاکەی تری چاڵاوێکی پێنج مەتر قوڵ و پانی هەیە کە بە بەربەندێك لە چەمە ڕەشەوە ئاو بۆ چاڵاوەکە ڕاکێشراوە لە کاتی جەنگ و پێویست دا. چـــەمە ڕەش لـــە گونـــدی بێستانـــسورەوە سەرچـــاوە دەگرێـــت بەربەندەکە هەم وەك پردێکیش بووە بۆ پەڕینەوەی ناوچەکە کە هەتا ئێستاش شوێنەواریان ماوە.

٢. گـردی گۆمـە ڕەش: ئـەم گـردەش لای ڕۆژهـەڵاتی گۆمێکـی قووڵە بە ناوی گۆمە ڕەش لای باشوری جۆگەی پوشێنە دوو لاکەی تری چاڵاوێکە کە ئاوەکەی لە بێستانسورەوە سەرچاوەی گرتووە بە گوێرەی ئاسەوارەکان ئەم گردە چاودێرێکی گرنگ بووە بۆ پاراستنی گـردی (سەراسـورخ) کـە ئێـستا گـردی سـەرا کۆنـی پێـدەوترێت و کـە ناوەندێکی ئیداری و سەربازی گرنگ بووە.

گونـدی (بێستانـسور) بـە نـاوی ئـەوەوە نـاو نـراوە. گـردی بێستانسور و گردی کاژاویش دوو شوێنی بەرگری و چاودێری بوون هـەم بـۆ یاسـن تەپـەو هـەم بـۆ سەراسـورخیش. ئـەم چـوار گـردەی کـە باسمـان کـرد بـەڕیزی یەکـدا کـە نزیکـەی کیلۆمەترێکـدان گونـدی بێستانسور زیاتر لە دوو کیلۆ مەتریش دەکەونە باکوری یاسین تەپە. ئەوەتا گردی بیستانسور دوای پشکنینی ورد دەرکەوت کە شوێنێکی ئاسـەواری زۆر گرنگـە بۆیـە پێویـستە رون کردنـەوەی زیـاتری لەسـەر بدەین:

**ئاسەواری گردی بێستانسور لە نێوانی هەزارەی حەوتەمی پێش زایین و شارستانیدا**

لە گەشتەکەمدا بەناو گردەکانی شارەزووردا ئاماژەم بە ئاسەوارەکانی داوە و مێژوویانم گێڕاوەتەوە بۆ سەردەمی گۆتی و لۆلۆیی یەکان و پێشتریش ، کە ڕەچەڵەکی ئەم وولات و نەتەوەیەی کوردەواریمانن . هەڵبەت پشتم بە بینین و بیستن و دەماودەمەکان و بۆچوونی خودی خۆم بەستبوو .وەك لەسەرەوە ووتوومانە لەو بابەتانەدا پشتم بەهەندێ سەرچاوەو بۆچوونەکان بەستووە کە لە بابەتەکاندا ناوی شاندێکی ئاسەوارناسی ئەوروپی ڕۆژهەلاَت ناسم هێناوە کە لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لە نەخشە پلانێکی ئاسەوارو گردەکانی شارەزوور دا بۆ توێژینەوە و کنە و پشکنین لەسەر دۆزینەوەی پێناسەی ئەو ئاسەوارانە ، ئەوەبوو لە ئەنجامی هەر کنەو پشکنینێکی ئەو شوێنانەدا لەبەر بوونی دەستی داگیرکاران و چەواشەکارانی کەلتوری نەتەوایەتیمان مێژووی ئێمەیان تێدا سفر دەکردەوە، کە جێگای داخە ئەو توێژینەوانە دەبوونە سەرچاوە و لەگەڵ ڕێزمدا مێژوو نووس و ئاسەوارناسەکانی خۆشمان زۆرجار پشتیان بەو سەرچاوانە دەبەست کە هەمووی سڕینەوەی مێژوومانە کە نەدەبوو پشتیان پێ ببەسترێت، چونکە شێواندن و چەواشەکارین.ئەو شوێنەوارانەی کە دەدۆزرانەوە و شوێن پێ و جێ دەستی داگیرکارانی ئەم گەلە بوون لە مێژوودا دەخرانە ڕوو، وەڵ چینەکانی ژێرەوەی ئەو ئاسەوارانە کە مۆرکی باوو باپیرانمانی پێوەبوو دەیانشاردەوە و کپیان دەکردەوە ،

تەنانـەت نـەك لـە پەراوێزیـشدا ئامـاژەی پـێ بکرێـت ، بەهـەموو جـۆرێکیش دەسـڕانەوە . بـەڵام بەنـدە لـە گەشـتەکەمدا و لـە بڵاوکراوەکانمدا هەر سووربووم لەسەر بۆچوون و شتە دەماودەمەکان و هەرگیز بایەخم بەوسەرچاوە چەواشانە نەداوە چونکە ئێمە دەبێ لە ڕاستییەکان بگەین هەتا بێگومان بین ئاسەوارەکانمان هی باوو باپیرانمانە ئەگەر چی لێمان شاراوەتەوە ، وە دەبێ بۆ داڕشتنی مێژووی کەلتوری خۆمان بەدوای سەرەداوێکدا بگەڕێین هەتا لەکونی دەرزی یەکەوە دەمانباتە قۆناغی کۆتایی ، وە دەبێ چاونەترسانە گوێ نەدەینە ڕەخنەو ڕەخنەکاریی نادروست ، خۆ کەس بەڕەی کەلتوری خۆی ناسوتێنێ ئەمە ڕۆحێکی نەتەوەیی یە و دەبێ بەدوایدا بچین و خۆمان سەرچاوە بۆ خۆمان دروست بکەین . دەبێ هیچ نەبێ قوتابییەکی دواکەوتووی خوالێخۆشبووی ( داماوی موکریانی ) بین کە چەکوش و پاچی هەڵگرت و لەسەر بنەمای کەلتوری نەتەوایەتیمان پەیکەری تاشی، ئەوەبوو ڕۆژهەلاَت ناسەکان پەیکەرەکەیان گێڕایەوە بۆ سێ ڕۆژ لەوەوبەر ،(حوزنی) خوالێخۆشبوو سەرەتا نیگەران بوو وای زانی بەدرۆ کەوتووەتەوە بەڵام هەر ڕۆژهەلاَت ناسەکە ووتی ئەگەرچی ئەمە دروستکراوی سێ ڕۆژ لەمەوبەرە بەڵام بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر ، ئەوەبوو مامۆستای گەورەمان ( حوزنی ) شادمان بوو لەوەی کە کردوویەتی هەڵە نەبووە.

ئێمە بۆ لە ڕاستییەکان بترسین و لەژێر ناوی ئەکادیمیانە بووندا کە ڕاستییەکەی ئەکادیمیانە بوون شتێکی ڕاست و بەجێ یە

بەڵام کە سەرچاوەی ڕەسەنمان دەست نەکەوێت دەبێ پشت بە بۆچوون و دەماو دەمەکان ببەستین ئەوکاتە دەگەینە ئەنجامێك کە نەخشەی مێژووی خۆمان دارێژین لێرەدا ئەوە دەبێتە ئەکادیمیی ڕاستەقینە.

بۆچی سەیرێکی ئەوەش نەکەین کە پاشایەکی ئێران زەمین هەموو شتێکی تەواوی لە خۆشی ژیان و پێویستییەکانی نووسین لە خۆشترین شوێندا خستە بەردەستی (فیردەوسی) کە بیرمەندێکی زانا بوو پێی ووت مێژووی ئێران زەمینم بۆ بنەخشێنە بەچەند کات دەتەوێت ، ئەوەبوو ئەویش لە ڕێگای شانامەکانەوە بە سەدان ڕووپەڕ هەر لە قەوقاس و ئازربایجانەوە لە باکوورەوە ، بەسەر سنوری صین و ڕووسیادا لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا بەشێکی خوارووی ئاسیا و سەر دەریا لە باشوورەوە ، بە ڕۆخی دیجلەشدا لە ڕۆژئاواوە هەتا باکوور ، بەشێکی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەی میزۆپۆتامیای کردە موڵکی ئێران زەمین و جوغرافیا و مێژوو و کەلتور و هەموو ڕووداوەکان و هەموو پاشاکانی ئەو سەردەمە و لەگەڵ پێشووتری لە ئەفسانەو شانامەکاندا نەخشاند ، کە لە سەدا لای کەمی پەنجای چەواشەکاری و داتاشین بوو کەچی کەسیش نەیوت بەر چاوت بە کلەوەیە و فیردەوسییش وەك بەسکی بانان بۆی دەرچوو ئەوەتا نوسراوەکانیشی دەکرێنە سەرچاوە. ئەی ئیتر بۆچی ئێمە لە ئاستی ڕاستی مێژوو و جوغرافیاو کەلتوری خۆمان دەستەوسان بین ئەگەر تەختە تاش نەبین با تەختە ڕێکخەربین ، هیچ لە ڕاستیش لانەدەین هەتا بتوانین وەکو خەڵکیی مێژووی ڕاستی خۆمان داڕێژین .

ئــەوەتا لــە ئاســتی بەڕاســت دەرچــوونی بلاوکراوەکانمــدا خۆشبەختانە لە شارەزوور لە گوندی بێستان سوور لە یەکێك لە گردەکــان بــەناوی ( گــردی بێــستان ســوور ) ەوە کــەلتوری بــاوو باپیرانمان دۆزرایەوەو هەموو راستیی یەکانی خستە ڕوو کەژیان لەم شوێنەدا دەگەڕێتەوە بۆ حەوت هەزار سالْ پێش زاین کە سەرەتایی گۆڕانی ژیانە لە سەردەمی ڕاوەوە بۆ سەردەمی نیشتەجیْ بون کە بە کۆنترین ئاسەواری نیشتەجیْ بون لەقەلْم دەدرێت و پاشماوەی دانەوێلْەکان و ئێسك و پروسکی مرۆڤ و ئاژەلْ و بالْندە و سوالْەت و دەفــری پاراســتنی دانەوێلْــەو شــت و مەکــەکان و تەلارســازی و هۆکارەکانی ژیان دەرکەوتن ، کە لەلایەن تیمێکی ئاسەوارناسی بەناوبانگی جیهانیەوە کە تایبەتن بەو شوێنەوارانەی کە لەسەر ئاستی جیهان زۆر دەگمەنن. کارەکەی ئەمانیش نەخشە ڕێگای ئەو پلانەیە لەسالأنی پەنجاندا ئەنجامدراوە وەك لەسەرەوە باسمان کردوە بەلأم ئێستا ئەو هەلەیان بۆ رەخساوە کە کنەو پشکنینەکەیان بە راستگۆیانە بە ئەنجام بگەیەنن. هەلْبەتە دەتوانرێت بوترێت ژەندین گــردی تــر لــەو ناوچــەیە هەیــە لەوانەیــە ســەرجەمیان لــەو جــۆرە ئاسەوارەی تیدا بدۆزرێتەوە، کە ئەمەش ئەوە دەردەخات دانیشتوانی ئــەم ناوچــانە بــە هیــچ گوشــارێك ناوچــەکەیان بــەجیْ نەهێــشتوەو نیشتەجێی بون. ئیتر ئێمە چۆن نەلْێین هەموو ئاسەوارەکانمان هی باوو باپیرانمانەو ئەگەر لێرەو لەویْ شوێنەوارێکی داگیرکارانیش دەرکــەوێت ئــەوا نابێتــە مولْکــی ئــەوان و هەلْبــەت شــوێن پــیْ ی داگیرکاری یەو هیچی تر .

٣. گردی عەربەت: ئەم گردەش دەکەوێتە شارۆچکەی عەربەتی ئێستا، کە کاتی خۆی بە (ئاروبوت ) ناوبراوە کە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پاشکۆیەکی مێژووی ئاینی. (بەندە(ا.ك.ج) لە گۆڤاری هەڵوێستی نیشتمانی ژمارە (١) بابەتێکم لە ژێر ناوی شارەزوور و ناوچەی تانجەرۆ بڵاو کردەوە کە مێژووی(ئاروبوت) بەشێکی بوو. ئەم گردە خاڵێکی گرنگی بوو. بنکەیەکی ئاینی ئەو سەردەمە بوو هەروەها چاودێرێکیش بوو بۆ بەرگری سەراسورخ و یاسین تەپە کە نزیکەی دوو کیلۆ مەتر کەوتۆتە باکوری سەراسورخ و چوار کیلۆ مەتریش کەوتۆتە باکوری یاسین تەپەوە.

٤. گردی خاك و خۆڵ: ئەم گردە کیلۆ مەترێك کەوتۆتە ڕۆژئاوای یاسین تەپە و لە گوندی قەرەگۆل دایە کە خاڵێکی چاودێری ڕووباری تانجەرۆ بەشی ڕۆژئاوای یاسین تەپەبووە.

٥. گردی مارف: ئەم گردە دەکەوێتە یەك کیلۆ مەتری ڕۆژهەڵاتی یاسین تەپە، وە دەکەوێتە گوندی زیرین جۆ خاڵێکی چاودێری دەوروبەرەکەو یاسین تەپە بووە.

٦. گردی دسکەرە: دەکەوێتە گوندی دسکەرە بە نزیکەی حەوت کیلۆ مەتری ڕۆژئاوای یاسین تەپە کە چاودێرێکی سەربازی گرنگ بووە بۆ هێرشی دوژمن لەوێوە.



**دیمەنی گردی ڕەرایەن و یەخشی**

**٧. گردی زەڕایەن و یەخشی: ئەم دوو گردە لە ڕیزی یەکدان لە زەڕایـەن و یەخـشی دوو خـاڵی سـەربازی و ئیـداری بـەرکری بـوون لـە بەری نزیکەی شەش کیلۆ مەتری بەری یاسین تەپەوە.**

**٨. گـردی مـالوان: لـە ناوچـەی مـالوان ئـەم گـردە چـاودێرێکی گرنگی ناوچە ئابووریەکە بووە لـە نزیکـەی شـەش کیلـۆ مـەتری بـەری باشوری یاسین تەپەوە.**

**٩. گـردی مـوان:.ئـەم گـردە کەوتۆتـە ناوچـەی مـوان لـە نزیکـەی شـەش کیلـۆ مـەتری بـەری ڕۆژهـەڵاتی یاسـین تەپـەوەن ئەمـە خاڵێکـی گرنگی ناوچە ئابووری و سەرچاوە ئاوییەکانی بووە، ئەم گردە دواتر**

مۆرکێکی ئاینی وەرگرتوە کاتێك کە پیاوە ڕۆحانیەکانی زەردەشت پەرتەوازە بوون یەکێکیان لێرە نیشتەجێ بووە هەڵبەت ئەمانە پێیان ووتراوە (موغەکان) بۆیە ناوچەکەو گردەکە بووە بە (موغان) (موان) (بەندە لە گەشتێك و بۆنەیەکی تردا لەسەر ئەم باسەم نوسیوە).

١٠. گردی سەرای سوبحان ئاغا: ئەم گردە لە نزیکەی دە کیلۆ مەتری بەری ڕۆژهەلاّتی یاسین تەپەدایە، ئەم گردە خاڵێکی گرنگی سەربازی و ئیداری و سەرچاوە ئاوییەکان و ئابوری و ستراتیجی یەتی ناوچەکە بووە. دەکەوێتە گوندی سەراو.

١١. کۆمەڵە گردەکانی بەری ڕۆژهەلاّت لە ناوچەی خورماڵ و هەڵەبجە کە ئەمانەش خاڵی چاودێری بوون بۆ ئەو ناوچەیە کە زۆر قەرەباڵغ بووە. وەك:.تەپە زێرینە، تەپە کوڕە، تەپە تۆڵەکە.. . هتد

١٢. گردی بەکراوا:ئەم گردە گەورەترین گردی ناوچەکەیە لە ڕووی گەورەیی و گرنگیشەوە دوای یاسین تەپە، کە دەکەوێتە بەری ڕۆژهەلاّتی قەلاّی یاسین تەپەوە لە دامێنی ڕۆژئاوای هەڵەبجەدا و بەرامبەر گوندی زەمەقی.

ئەم گردە گرنگیەکی ستراتیجی ئیداری و سەربازی و بازرگانی بووە لە دەڤەرەکەدا.

جگە لەم گردانە کۆمەڵێ گردۆڵکەی بچوکی ئاسەواری تر هەبوون وەك گردی قۆرتاس لە دوجەیلە، هەروەها کۆمەڵێك بەرزای سروشتی لە ناوچەکەدا بوون بۆ هەمان مەبەستەکانی سەرەوە بەکار هاتوون وەك :بەرزاییەکانی (بێستانسور، چەناخچیان، کانی پانکە، موان، کانی سپیکە، سەید سادق، کانی کەوەی چووخ).

ئەم گردانە کە باسمان کردن کاتی خۆی بە تەپەو کۆ ناوبراون بەلاٌم ئێستا بە تێپەڕبوونی زەمەن بەسەریاندا ناوی ئەو شوێنانە و ئەو کەسایەتیانەی کە ئێستا لە دەوروبەریدان وەرگرتووە وەك لەسەرەوە باسمان کردووە.

ئەم گردانە گەورەکانیان بەرزییان نزیکەی ٢٥ م وە ئەستوریەکی ١٠٠ م بازنەی دەبێت، بچوکەکانیان نزیکەی بەرزی ١٥ م و بازنەی ٥٠ م دەبێت.

گەورەکانیان وەك:سەرا کۆن، کاژاو، یەخشی، مالوان، موان، سەراو. بچوکەکانیش ئەوانی ترن کە لە سەرەوە باسمان کردوون.

شارەزوور بەدرێژای مێژوو بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، سەرەتاکەی زاموا بووە واتە وولاٌتی سارده سێر، چونکە ئەو سەردەمە بە زستان ووتراوە (زیم، زاموا) بە هاوینیش ووتراوە (ریم)، دواتر بە ناوچەی شارەزور ووتراوە(نامار)کە بە واتای ناوچەی ڕووبار دێت چونکە ئەو کاتە بە ڕووبار ووتراوە (نەدروو، نەهروو) چونکە ناوچەکە ئاودار بووە و خاوەنی (سیروان، تانجەرۆ، زەڵم، قلیاسان، چەمە ڕەش و هی تر ).

شارەزوور بە دریژای مێژوو جگە لەو داگیرکارییانەی لەسەرەوە باسمان کردوون زۆر وێران کاری تری بەسەر هاتووە وەك (دەست درێژییەکانی ئاشووری، ئەسکەندەر، ساسانیەکان، ئیسلام، مەغۆلەکان، عوسمانیەکان، سەفەویەکان هەتا دابەش کارییەکەی پەیمانی زەهاو کوردستان دابەش کرا بە دوو بەش وە دابەش کارییەکەی لۆزان کە ئینگلیز کوردستانی دابەش کرد بە چوار

پارچەوە لەمانەش شارەزوور بێبەش نەبوون لەو زوڵمانە.

شارەزور وەك لەسەرەوە ووتمان چەند ناوێکی هەبووە بەلاّم لەسەردەمی زوحاکدا(زوری کوڕی زوحاك )جارێکی تر شارەزوری ئاوەدان کردەوە کە ئەو سەردەمە شارەزوور ئاوەدانترین شوێن بووە لە ڕووی نیشتەجیّ و ئابوریەوە، شارەزوور چەند ناوێکی هەبووە وەك :(شار زۆر واتە ئاوەدان، شار زۆڵ واتە ئاودارو زۆنگاو، شارگۆر واتە نشێویی ، شوەی تر واتە نیمچەدۆڵ ،شێوە قەبر کە ئەمانە هەموویان سەرچاوەی پیتو بەرەکەت و ئاوەدانین).

وەك دەڵێن گوێرەکە ساوا ماوەیەکی زۆر بەسەربانندا ڕای کردووە ئەوەندە خانووەکان پاڵیان داوە بە یەکەوە. ئاسەواری نیشتەجێی ئیدارەی زووری کوڕی زوحاك لە نەویّ و بەردەبەل هەر دیارە. شارەزوور بەپێی زانیارییە کشتوکاڵیەکان بە پێنجەمین دەڤەری جیهان دادەنرێت لە پیت و بەرەکەتی زەوی و زارەوە.

**بۆ ئەم چەند دێڕەی سەرەوە کەڵکم لەمانەی خوارەوە وەرگرتووە:**

- کتێبی میدیا، رحلة تاريخ الحظارات/ فؤاد سفر، دەوڵەتی سۆرباتۆ /د. جمال رشيد
- نامیلکەی شارەزووری کشتوکاڵی/پرۆژەی شارەزوور، بیست و دەماو دەم لە پیر و زانایان لە کاتی گەشتەکەمدا.

گردەکەی قۆرتاس

بۆ بەڵکەنامەی ئەوەی کە ئاسەوارو شوێنەوارەکانی کوردستان دەگەڕێنەوە بۆ سەر گۆتی و لۆلۆییەکان و ئەمە شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو سەردەمە لە دەوڵەتی زاموا. ئەگەر ئێمە بۆ سەرچاوە بگەڕێین سەرچاوەیەکی ڕوون و ئاشکرامان دەست ناکەوێت بۆ سەلماندنی ئەو بەڵگەنامانە چونکە بەڵگەنامە ڕەسەنەکان هەموو شێوێنراون و لەناوبراون ئەوەی هەیە لە لایەن داگیرکارانی عەرەب و فارس و تورکەوە چی لە ڕێگەی خۆیانەوە بێت یان بەکرێ گرتنی ڕۆژهەلأت ناسە ئەوروپایی و بیانیەکانەوە بوبێت بۆ چەواشە کردن و گۆڕینی ئاسەوارەکانمان بەهی خۆیان، بۆ پاکتاو کردنی ڕەگەزی ولأت و نەتەوەی ئێمە. ئەوەتا دەبینین لە ڕێگای شانامەکانی فیردەوسی و ئەفسانە عەرەبیەکان (بۆ نمونە:گلگامێش) یان هەر کارێکی تری دەوڵەتی تورك بۆ شێواندنی ناسنامەی کوردایەتیمان هەوڵیان داوە و هەوڵەکانیشیان بەهۆی داگیرکاریەکانیانەوە سەرکەوتو بووە. من بەش بە حاڵی خۆم لە هەندێك بلأوکراوەمدا پشت بە بینین و بیستن و شتە دەماو دەمەکان دەبەستم تەنانەت تێبینیشم هەیە لەسەر مێژوو نوس و ئاسەوارناسەکانی خۆمان کە پشت بە هەندێك لەو سەرچاوە چەواشەکارانە دەبەستن، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ هەر کەسێك تەنها دێرێك لەسەر کورد دەنوسێت بە باشە. لەم بابەتەدا ئەوە دەخەینە ڕوو کە ئاسەوارو شوێنەوارەکانی کوردستان موڵکی نەتەوایەتی خۆمانن. ئەویش ئەو کنەو پشکنینەیە کە لە گردی(قۆرتاس) لە شەستەکاندا کراوە. منداڵ بوم لە ساڵی

١٩٥٧ شـاندێك هاتنـه گوندەكـەمان، هەڵبـەت دوای بـۆم دەركـەوت ئاسـەوار نـاس بـوون، داوایانلـه سـەرۆك خێڵـی گوندەكـەمان كـرد كـه هاوكاریـان بكـات، ئـەوان جێبێكیـان پێبـوو ئـافرەتێكی زۆر قەڵـەوی ئەڵمانی سـەرۆكی شاندەكه بوو، ئـەوانی تـر چەند ئاسـەوار ناسێكی فارس و تورك و عەرەب بوو كوردێكیشیان وەك وەرگێر و رێنیشاندەر لەگەڵ بوو، سـەرۆكی شاندەكه نەخشەیەكی گـەورەی دەرهێنا لەسـەر مێزێك داینـا بـه دارێكـی نـوك تیـژ ئامـاژەی بـۆ هەنـدێك شـوێن دەكـرد لەسەر نەخشەكه لەوانه (گردی یاسین تەپه، بەكراوا، گـردی عەربـەت، گردی قۆرتاس) له شارەزوور. ژنه قەڵەوەكه به وەرگێڕەكـەی ووت كـه بـه سـەرۆك هۆزەكـه بڵێـت كەسـێكی بـەتوانایان لەگـەڵ بنێرێـت بـۆ ڕێنمایی كردن، ئەویش گەنجێكی به ناوی محمدی اسماعیل نـارد لـه گەڵیان كه هەردەم ئەو گەنجه ڕێنمایی گەشتیارو ڕاوچیەكانی دەكرد كـه دەهاتنـه ناوچـەكه، سـەرەتا چـون بـۆ گـردی یاسـین تەپـه، كـه گەیشتبونه سەر شوێنەواری قەلاكه، ژنەكه دەستی كردبوو به گریـان، (دەیـان ووت هەڵبـەت ئـەم ئافرەتـه لـه وەچـەی ئـەو گاورانەیـه كـه ئـەم شـوێنەیان دروسـت كـردوه بۆیـه بـۆ شـوێنەواری بـاو باپیری دەگـری، نـەیان دەزانـی بـۆ پـشت گـوێ خـستنی ئـەو ئاسـەوارە مەزنـه دەگـری) هەڵبەت دوای داگیر كاری (عەرەب/ئیسلام ) بـه شـوێنەوارەكان دەوتـرا گاور كرد. ئەم قەلایه له دوای قـەلای كـەركوك دێـت هـەر لەسـەر هـەمان تـەرزو هـەمان كەرەسـتەی قـەلای كـەركوك دروسـت كـراوە. ئـەو شـانده بڕیاریان وا بوو لەو شوێنانەی كه ئاماژەمان بۆ كـرد لەسـەرەوە، كنـەو پـشكنین ئـەنجام بـدەن بـەلام ئـەوەبوو شۆڕشـی چـواردەی تـەموزی

پەنجاو هەشت بەسەردا هات و هەروەها هەلأیسانی شۆڕشی ئەیلولی بەدوادا هات و ئەو ویستە دوا کەوت بۆ کاتێکی دیاری نەکراو، هەڵبەت وەك ووتم خۆشبەختانە بۆ ڕوودانی بەڵگە نامەیەك بۆ گەڕانەوەی ئاسەوارەکانی شارەزوور بۆ سەردەمی گۆتی و لۆلۆیەکان، ئەوە بوو لەشەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە ڕوانگەی ئەو کەشفەی سەرەوەدا دەرفەتێك هەڵکەوتبوو کە لە گردەکانی شارەزووردا کنەو پشکنین بکرێت، جا بۆ ئەو مەبەستە شاندێك لە ئاسەوارناسانی تورك و عەرەب و فارس و ڕۆژهەلأت ناسانی ئەوروپایی کە ئاسەوارناسانی کوردیشیان وەك ڕێنومایی کار لەتەك دابوو، پێدەچیٚ کە هەردوو گەڕیدەو ئاسەوار ناسان(تەها باقر، فواد سەفەر) یان لەگەڵدا بووبیٚ، سەرۆکی شاندەکە ئاسەوار ناسێکی دکتۆر کە ناوی پیٚ دەچیٚ نووری بووبێت لەگەڵ بوو کە عەرەب بوو، کرێکارێکی زۆریان لە ناوچەکە گرت بۆ کاری کنەو پشکنین هەڵبەت بۆ هەڵکەندن و فڕێدانی خۆڵەکان بووەو هیچی تر، هەروەها چەند کەسێك لە قوتابیانی ناوەندی و دوا ناوەندی کە لەکاتی پشوو بوو گرت بۆ چاودێری کردنی کاروباری کرێکارەکان و نوسینی ڕاپۆرتی ڕۆژانەو کاروباری ئیشەکە نەك بۆ چاودێری کردنی دۆزینەوەکان، چونکە دۆزینەوەکان زۆر نهێنی بوون دەردەکەوێت کە گەلێك گڵکارو پیٚ دەچیٚ تابلۆی نوسراو پەیکەرو دراو سواڵەت دۆزراونەتەوە و بە نهێنی لە تورەکەی تایبەتدا هەڵگیراون بۆ داغان کردنیان بە مۆزەخانەکانی ئەم لاو لادا و شاردنەوەیان لە کورد. کە چینی یەکەمیان شیکار کردووە بە بۆچونی ئەوان هی سەردەمی عوسمانیەکان بووەو چینی دووەم هی سەردەمی

ئەمەویـەکان بـووە و چـینی سـێهەم هـی سـەردەمی ساسـانیەکان بـوو چینەکانی دواتر هەرچیان ناو نابێت ئەوا چینی ژێرەوە بە ڕاشکاوانە هـی سـەردەمی گۆتـی و لۆلۆیـەکان بـووە بـەڵام ئـەوان ئـەم چـینەیان شاردۆتەوە قەدەغەیان کردووە لە ناسـینی لـە لایـەن کوردەوە هەڵبـەت ئـەم زانیاریـە لەلایـەن هەنـدێك لـەو قوتابیانـەوە تێبینـی کـراوە و ڕوون کراونەتـەوە، هەڵبـەت ئـەو کنـەو پـشکنینە لـە یـەکێك لـە گردەکانـی شارەزووردا بووە بەناوی قۆرتاس، ئائەمە ئـەوەمان بۆ دەردەخـات کـە گومان لەوەدا نامێنێت کە ئاسەوارەکانمان هـی بـاو باپیری خۆمـانن و شاردنەوەو چەواشە کردن، کردونی بە موڵکی کەسـانی تـر بـەڵام ئێمـە نابێـت پـشت بـەو سەرچاوانە ببەسـتین دەبێـت بۆ بنـەمای ڕەچـەڵەکی خۆمــان بــچینەوە. دەرفەتەکــە نــەما بــەهۆی کودەتــا یــەك لــەدوای یەکەکانی عێراقەوە هەروەها بەردەوامی شۆڕشی ئەیلول. دیسان هـەر لـە ڕوانگـەی هـەمان کـارەوە پـشکنین دەرچـوو بـۆ گـردە گەورەکانـی باشـوری کوردسـتان. ئـەم قەڵایـە (یاسـین تەپـە) شـوێنێکی ئیـداری و سـەربازی زۆر گرنگـی دەوڵـەتی شـارەزور بـوە واتـە زامـوای گۆتـی و لۆلۆیـەکان، هـەروەها گـردی عەربـەت کـە بەنـدە لـە گەشـتەکەمدا لـە ناوچــەی تانجــەرۆ ڕوونم کردۆتــەوە بــڵاوم کردۆتــەوە هەڵبــەت ئــەم پـشکنینەی یاسـین تەپـەو گـردی عەربـەتیش هـەروەك پـشکنینەکەی گردی قۆرتاس بنـەما ڕەسـەنەکەی لێ شـاردراوەتەوە کـراون بـە موڵکـی نەتەوەکانی تر بەڵام موڵکـی ڕەسـەن و پێناسـەی نەتەوایـەتی خۆمانن ئاسـەواری ئـەو دەوڵەتانـەی کـە لەسـەر کەلـەپوری ئێمـە دەرکـەوتوون تەنها شوێن پێی داگیرکاریەو هیچی تر.

گردی عەربەت:

گردی عەربەت چی یە و لەکوێ یە ؟ لە گۆڤاری ژمار (١) ی هەڵوێستی نیشتیمانیدا ( بەندە بەنێونیگایەك) ئاماژەم بۆ بنەمای ئەم گردە کردووە کە لە خوارە وە باسی دەکە ین، هە روەها لە رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٢٦٣٠)دا کورتە باسیکی کەلتوری ئاسەوارەکانی کوردستانم ئاماژە پێداوە، هەروەها لە کوردستانی نوێ ژمارە(٥٢٩٧) دا باسی هاتنی شاندێکم کردووە کە بو توێژینەوەو کنە و پشکنینی ئاسەوارەکانی شارەزوور هاتبوون کە لەژێر ناوی (قورتاس) دا کورتە باسێکم پێشکەش کردووە، هەروەها لەو کنە و پشکنینەدا ناوی گردی عەربە تیش هاتووە.

بەندە لەم بڵاوکراوانە و بڵاوکراوەی تریشدا گلەیی ڕەخنە ئامیزم هەبووە چونکە نووسەران و مێژوونووسان و ئاسەوار ناسانی کوردی خۆمان گرنگی بەسەرچاوە چەواشەکان دەدەن کەدەبوو گرنکی بەسەرچاوەی ڕەسەنی خۆمان ودەماو دەمەکان و ببین وبیستن بدەن، جابۆیە من زیاتر گرنگی بەوشتانە دەدەم بۆئەوەی بنەمایەك لەسەر مێژوو کەلتوری ڕەسەنی خۆمان داڕێژم، هەڵبەت لەم کارەشدا نابێتە سوتاندنی پەڕەی مزگەوت یان خەتایەك تەنها ئەوەندەیە کە پێویستمان بە داڕشتنی مێژوویەکی ڕەسەنە بۆ وولات و نەتەوەکەمان، ئەوەی ئەوکارەی من بەباش نازانێ گەردنی ئازاد بێت و من سوورم لەسەر کارەکەی خۆم. .

ئەوە تا لەو بڵاوکراوانەی سەرەوەدا ئاماژەم بۆ ئەو چەواشە کاریانە کردووە کەلە لایەن دوژمنان و داگیرکەرانەوە لەسەر ئاسەواری

نەتەوایەتیمان کراوە وە لە خواریشە وە کۆمەڵێ شت دەربارەی چەواشەکاری دەخەینەڕوو، وەچۆنیەتی گرنگی دانمان بەکارە دەماودەمەکان زیاترە.

لێرەدا پێویستە بچینە ناو قوڵایی مێژووە وە بۆئەوەی ڕامان بکێشێت بۆسەر گردی عەربەت، (یاقووتی حەمەوی و قەزوینی) لەنووسینەکانیان دا ئاماژە یان بەوە داوە کەشەڕی (تالووت و جالووت) لە شارەزووردا ڕویداوە، ئەو نەهرەی کە لە کتوبە سەماوییەکان و قورئاندا هاتووە ئەوە (تانجەڕۆ)ی ئێستا بووە کە بە نەهر یان نەدرو یان نامرۆ ناوبراوە، کە تالووت دەبێتە مەلیك بەپرسی پێغەمبەری سەردەم ئەو کۆمەڵە ئاوارەیەی کە ناوچەکەیان بەجێ هێشتووە لەترسی زەبرو زەنگی جالووت کە تالووتیش گەیشۆتە نەهری تانجەڕۆ بە لەشکری ئاوارەکان و لەشکری خودی خۆیانەوە پێی ووتون ئەمڕۆ ئێمە بەڕۆژووین ئەوەی لەو نەهرە ئاو بخوات ئێمە پێویستمان پێی نیە و بابگەڕێتە دواوە، هەڵبەت زۆرێکیان ئاو دەخۆنەوە و دەریان دەکات، ئەوەی کە دەمێننەوە لەشکرێکی کەم دەبن، جالووت هێرش دەباتە سەریان بەڵام دەست بەجێ (داود) ی پێغەمبەر جالووت دەکوژ یێ و ئیتر لەشکری جالووت بۆی هەڵدێن و ناوچەکە ڕزگار دەبێت.

خۆ دیارە ئەم ناوچەیە ناوچەی ڕەچەڵەکی کوردە و بەشێکە لە کوردستان، کوردەکانی ناوچەکە بەتاییەت ئاوارەکان ئیمان بە (داود) دەهێنن و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش ئاینزای کاکەیی کە بنەمایەکی زەردەشتین بنەمای ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە چونکە

ئەوەتا تا ئێستاش داود بە پێغەمبەری خۆیان دەزانن، وەهەروەها لەو لەشکرەی کە لەگەڵ جالووت و داود هاتونەتە ناوچەکە چەند خێزانێکیان لێ نیشتەجێ بووە لە کوردستان.

هەڵبەت ئەو جولەکانەی کەتا ئەم دواییانەش لە کوردستاندا بوون بەشێکیان لەو ڕەچەڵەکە بوون بەتایبەتی جوولەکەکانی (ئەساتیس) کە بابلیەکان زەبروزەنگی لەگەڵدا بەکارهێناون هەتاوەکو (کۆرش) پاشای فارس دەوڵەتی هەخامەنشی ڕزگاری کردن لەدەست بابلیەکان و جوولەکەکان هەتا ئێستاش وەك پێغەمبەرێك دەڕواننە کۆرش و بە (ئەلقوش) ناوی دەبەن ئەو جوولەکانە تێکەڵ بە جوولەکەکانی ئاوارەبووی جەنگی عەرەب - ئیسلام کە لە کوردستاندا نیشتەجێ بوون.

ئەم ڕەچەڵەکانە دێن و دەچن یان ئاین و ئاینزاکان هەتا سەردەم دەگاتە سەردەمی زەردەشت هەتا کوردیش بە پێغەمبەری خۆیانی دەناسن، وەك ووتمان کاکەییەکانیش بەشێك دەبن لەو ئاینە، ئەو ئاینە ئاماژە بەهاتنی پێغەمبەرێك دەکات بەناوی (سۆشیانەت) واتا (ڕۆحیانەت) کە حەزرەتی عیسا و ئاینەکەی دەگرێتەوە، دواتر ئەم ئاینە سەرهەڵدەدات و لە کوردستانیشدا شوێنکەوتویان دەبێت ئەوەتا تائێستاش لەبازیان و قەرەداغ و هەندێ شوێندا ئاسەواریان دیارە وە پاش ماوەی ئەو ڕەچەڵەکە تا ئێستاش لە کوردستاندا هەن تێکەڵ بە پاشماوەی کلدانی و ئاشوریەکان، ئالێرەدا دێینەوە سەر گردی عەربەت کە ڕەنگە خوێنەرانی بەرێز بڵێن ئەم باسەی سەرەوە چ پەیوەندییەکی بە گردی عەربەتەوە هەبێت؟، لەلایەك هاتنی تالووت و

داود لەناوچەکەدا پاشماوەی جوولەکەکانیان بەجێ هێشت، لەلایەك لەقەومی جالووت پاشماوەیان لێ بەجێما کە لەگەڵ کورددا پێکەوە دەژیان، لەلایەك پاشکەوتوەکانی ئاینی مەسیح لەناوچەکەدا بونیان هەبوو، بەجێماوەکانی قەومی جالووت کە پەیڕەوی (بوت) یان کردووە زەردەشتیەکان کە پەیڕەوی ئاگریان کردووە هەموو ساڵێك لە بەهاردا لە سەری ساڵی تازەدا بۆنە و تقوساتی ئاینی هەبوو، ئەو شوێنەی گردی عەربەتیش جێگای ئەو ڕێوڕەسمانە بووە، زۆرجار پێکدادان لەنێوان پەیڕەوانی ئاگر و پەیڕەوانی بوت دا ڕووی دەدا، هەتا قەشەیەك لە ئاینی مەسیح کە زۆر ڕاوێژکارو ڕێکخەر بوو هێمایەکی بۆ کردن کە دیوی ناوەوەی تەنور بووە و مەشخەڵی ئاگری تیابووە، دیوی دەرەوەشی شێوەی ئەو بوتە بوو کە ئەوانی تر پەیڕەویان دەکرد، پێی ووتن فەرموو ڕێوڕەسمی خۆتان بگێڕن ئەوە ئاگر و ئەوەش بوت، ئیتر لەو ڕۆژگارەوە ئەو شوێنە ناونرا (ئاگروبوت) دواتر بووبە (ئاروبت) دواتر بووبە (ئەربت) کە ئەمانە هەرهەموویان یەك واتایان هەیە، کە عەرەب - ئیسلام گەیشتە ناوچەکە و ئاینەکانیان خستە سەر بیروباوەڕی خۆیان، هێماکەشیان داپۆشی، هۆزێکی عەرەب لێرە نیشتەجێ بوون کەتا ئەم ڕۆژگارەیش بنەمایان ماوە بەڕەچەڵەك بەڵام ئێستا کوردن، ئەم شوێنە ئیتر ناونرا عەربەت واتا (بيت العرب) بۆیە بووبە عەربەتی ئێستا.

وەك لەسەرەوە ووتومە کەڵك لە شتە دەماودەم و بینین و بیستنەکان وەردەگیرێت و دوای ساغ کردنەوەی سودی لێ وەردەگیرێت بۆ داڕشتنی کەلتوری نەتەوەکەمان:

١. هەڵبەت بۆ بەشێك لەم بەشەی سەرەوە لە (شێخ بەهادین قەرەداغی بەتەمەن و کەلەپوردۆست) م بیست کە ئەو لە ڕابوردوودا لەدەستنووسی مامێکیدا کە زاناو مێژوو نوس بووە خوێندویەتی یەوە کە ڕوداوەکەی ئارو بوت کەوەك لەسەروە وتومانە لە لایەنی قەشەیەکی مەسیحی یەوە بەناوی (مارکەیباب) ە کەگیروگرفتی نیوان ئایینزاکانی چارەسەرکردووە، وەك لەسەرەوە باسمان کردووە دیارە ئەم بابەتە بە تێروتەسەلی لەدەست نووسی ناوبراودا باسی ناوچەی گردی ئاروبت و ناوچەی تانجەرۆی ئێستای کردووە.

٢. هەرلەهەمان دەست نووسداهاتووەکە (حاخامێکی جوولەکە) کە لە ناوچەی تانجەرۆ و قەرەداغی ئێستادا دەمڕاستی ئەو جوولەکانە بووە کە لە سەروە باسمان کردووەلە ململانێکانی عەرەبا.ئیسلامدا لەناوچووە بەماڵ و منداڵەوە تەنها کوڕێکی مێردمناڵیان لێ ماوەتەوە، بەڕێکەوت ئەو کوڕەخۆی گەیاندۆتە ماڵی (زەردی بەگ) کە ئەو سەردمە زەردی بەگ دەمڕاستی ناوچەی قەرداغ بووە لەوشوێنەی کە ئێستا پێی دەڵێن شارۆچکەی قەرداغ بەو شوێنە ووتراوە زەردیاوا بەهۆی زەردی بەگەوە کە ئەم ناوە تا ئەم دووایییانەش بە قەرداغ ووتراوە زەردیاوا، کوڕەجوولەکە کە دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەماڵی زەردی بەگ زۆربەناز و باز گەورە کراوە کە کوڕێکی جوان خاس و سوارچاك وتۆکمە بووە و زورگوێڕایەڵی زەردی بەگ بووە و پێی ووتووە بابە، ناویان ناوە ( قارەمان) لەبنەماڵەی خۆشیان ژنیان بۆهێناوە و گوندێکیان بۆ ئاوەدان کردۆتەوە بە ناوی گوندی قارەمان کە هەتا ئێستاش ئەو گوندە بونی هەیە لە فە رداغ.

دوای مردنی خاوەنی دەستنووسەکە (واتا مامی شێخ بەهادینی ناوبراو لەسەرەوە) نازانرێ ئەو دەستنووسە کەوتۆتە کوێوە.

بێینەوە سەر گردی عەربەت، ئەوشانەدەی کە باسمان کردووە لەسەرەتای حەفتاکان کەوتنە کنە و پشکنینی گردەکە، چاودیر و کرێکارکی زۆریان لە ناوچەکەدا گرت بەکرێ تەنها بۆهەڵکۆڵین، بەلاّم ئەگەر سەرەداوێکی ئاسەواریان دەستکەوتایە ئەوا چاودێری تایبەتی و نهێنی خۆیان بەکۆکردنەوەی هەڵدەستان، ئەوشتەی پێویست بوایە ڕوونی کەنەوە ئەوە ئاشکرایان دەکرد ئەوەشی ئەوان مەبەستیان بوایە ئەوە گومشێریان دەکرد و لە تورەکەیەکی تایبەتیدا ڕەقەمی تایبەتیان لێ دەدا کەهەر خۆیان بیانزانیایە نهێنگرەکانیان خێرا دەیان برد.

هەڵبەت لە چینی سەرەوەدا ئاسەواری دیواری قوڕ و بەردینی عوسمانیەکانیان دیتەوە ئاشکرایان کردووە، لە چینی دووەمدا ئاسەواری عەرەب.ئیسلام کەبوونیان لێرەدا هەبووە بینرا ئەمەشیان ئاشکراکرد، چینێکی تر شوێنەواری مۆرکی ساسانیەکانیان دەست کەوتبوو بەلاّم چینی ژێروتر بێگومان لەوەی کە ئاسەواری گۆتی و لۆلۆیی و تیرە و هۆزو ئاینزاکانی سەرەوە کە باسمان کردووە لەگەڵ ئاسەواری پەیکەری ئاروبت دەرکەوتوون، بەلاّم ئەمانەیان شاردوتەوە و بەژمارەی تایبەت کەهەر خۆیان ئەزانن گومشێرێنیان کردوون و شوینەکەیان داپۆسیوەتەوە.

ئەم کارە لەلایەن چاودیرە خۆماڵی یەووریاکانەوە هەستی پێ کراوە، ئاوا داگیرکارەکان مێژوومان چەواشە دەکەن و ئێمەش بەو چەواشەییە پشتیان پێ دەبەستین کەجێگەی نیگەرانی یە.

مەرکەزی ئەم ناوچەیە بەهەندێ ڕوانگەدا دیارە ئەو شوێنەی ئێستای بێستان سوور بووە، هەڵبەت ووشەی ( شویتر)کە قوزوینی باسی دەکات لە شارەزووردا مەبەستی لەو شوێنەیە کە دۆڵێکە لە شارەزووردا وێنەی نییە کە دوو دۆڵەیە لەگەشتەکەمدا باسم کردووە.

❊❊❊

کاتێـك کەلـە بەشـێك لـە بابەتـەکانی بێـستان سـوور بومـەوە کەڵکەڵـەی گونـدی باخـچەم کەوتـە سـەر، کـە دەکەوێتـە بنـاری بـەرانان سـەربە ناحیـەی (تانجـەرۆ.عەربـەت) کەدەکەوێتـە بەرامبـەری بـەری ڕۆژئـاوای عەربـەت، کەماوەیـەك لـەم گونـدەدا لەوەبـەر ژیـابووم و گوندێکی جوان و پڕلەئاسەوارە بۆیە بەرەو ئەوێ بەپیادە لە ڕێگای کلکـەی یـاڵی بێـستان سـوورەوە بـەرەو دارە ڕەش و لاباریکـە کەوتمـە ڕێ هـەتا سـەر جـادەی (عەربـەت.دەربەنـدیخان) لـەوێ بەباریکـە ڕێ ووشکەنەدا بەرەو ڕۆژئاوا لـەخواروی گونـدی باریکـەوە بـەرەو گونـدی قڕاڵـی، سـەرەتا بەبەرزاییەکدا ڕێگاکـە سـەردەکەوت بـەرەو گۆڕسـتانی کۆن ونوێـی گوندەکـە کەئاسـەوارێکی کۆنینـە لـە قەبرسـانەکەدا بـەدی دەکـرا کەلەهـەر چـوار لایەکـدا شـوێنەواری چـوارتاق هـەبوو بۆیـە کەپرسـیم ووتیـان ئـەو ئاسـەوارە پێـی دەووتـرێ چـوارتاق، کەبەدەماودەم پێی دەچێ قشڵەی عەسکەری سەردەمی عوسمانیەکان بوبێـت کەلـە قـسڵ وگـەچ دروسـت کـراوە، تـا ئـەم کاتـەش ئاسـەواری بەباشی بەدی دەکرا.

دواتـر بـە دۆڵەکـەدا چـومەخوارەوە بۆنـاو گونـدی قڕاڵـی کـە دەکەوێتە نشێویەك نزیك لە ڕۆخی ڕوبارۆچکەی تانجەرۆ، ئەم گوندە بـە کـشتوکاڵی دێـم و مـەرەزە لـە لقـەکانی تانجـەرۆداو ئاژەڵدارییـەوە خەریك بوون، خـەڵکی گوندەکە بـەزۆری لـە هـۆزی عێـل بـەگین حـەوزو ئاوێکی بەرفراوان و جوانی سازگاری هەیە، لەماڵی خزمێکی نزیکمان لامدا بەناوی (حاجی خواڕحم).

ئەم گوندە هەندێ کەس پێیان وایە کەناوەکەی تورکی بێت، بەڵام ناوێکی کوردی پەتی یە، چونکە ڕووبەرە زەویەکی تیایە، گڵێکی خەنەیی ئاڵی کانزایی تیایە کە خەڵکی گوندەکەو گوندەکانی دەوروبەر دەیبەن بۆ سواخدانی سەربانەکان، ئیتر هەچ سەربانێك بە قوڕی ئەو گڵە سواخ بدرێت ئەوا لە زستاندا دڵۆپە ناکات، کە پێی ئەڵێن قوڕەئاڵە، جا ناوی ئەم گوندە لە بنەڕەتدا بەو ناوەوە هاتووە (قوڕەئاڵە بووە بە قڕاڵی).

ئیتردوای حەوانەوەم بەرەو روباری تانجەرۆ بەرەو ڕۆژئاوا کەوتمەڕێ ئاوەکە تاڕادەیەك کەم بوو کەپەڕیمەوە بە بەرزاییەکەی ئەوبەری چەمدا سەرکەوتم، کەسەیری خوارەوەم کرد گۆمێکی پانی شینی قەزوانیم بەرچاوکەوت کەماسی گەورەگەورە بۆ خۆراك یان بۆ یاری سەردەکەوتن و دەکەونە ژێرەوە، لەدڵی خۆمدا ووتم سەریان لە ڕاوچی یەك دەخورێ، ئیتر بەباریکە ڕێ ووشکنەدا هەر بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتم تا گەیشتمە گوندی (گورگەچیا) ڕێگاکە دەیدا بە ناوەڕاستی ئاواییەکەدا بەڵام من لاڕێم کرد بەبەرزاییەکەی پشتی ئاوایدا لەترسی سەگ چونکە کەسێکم بەدی نەکرد یارمەتیم بدات، وەك بیستم ئەم گوندە زۆر لەکۆندا لەلایەن چەند کەسێکی چیایی دزێوەوە ئاوەدان کراوەتەوە کەپێیان ووتون گورگەکانی چیا، بۆیە گوندەکە بەو ناوەوە ناونراوە کەئێستا دانیشتوانێکی سادەو لەسەرخۆ کەبە کشتوکاڵی دێمەکارو ئاژەڵداریەوە خەریکن.

ئیتر بەرەو بنار کەوتمەڕێ تا گەیشتمە سەر سنورەکانی گوندی باخچە، لەوێ ڕەقەن وبەردەڵان دەست پێدەکات، بەردەکانی ناو

زەویەکە کراونەتە کەڵەك، لەناو کەڵەکەکەدا جۆرە خشۆکێکی سەیرم بەدی کرد کەهەندێکیان بۆرباون و هەندێکین سەوزبوون کە دەقاودەق لە تیمساح دەچن، بەقەد مارێك ئەستوربوون پێیەکیش درێژن ئەمانە چەند ناوێکیان هەیە، هەرناوێکی بۆنەی خۆی هەیە، بۆنمونە (قوم قومە کەلەبەرئەوەیە زمانێکی درێژو دووفاق دەردەکات و قرخەیەك دەکات لەدووری دووسێ بوستەوە لەیەك و دوودا نێچیرەکەی لەزمانی دەئاڵێنێ و قوتی دەکات لە گەرویدا، بزبزۆکە کەئەمە بوە پێی دەڵێن ئەوەندەی چاوتروکانێك لەبەینی دوو کەڵەکی پێج سەد مەتری دا لەمبەر دەگاتە ئەوبەر یان خێراخێرا کەشتێك بەدی دەکات بە دوژمنی دەزانێت وەك بیترسێنێ زووزوو سەردادەنەوێنێ و بەرزی دەکاتەوە هەربۆیەش پێیدەڵێن بزبزۆکە) ئەمانە هەندێکیان لەوان ووردترن قۆری چونکە لەکاتی ڕاکردندا قۆڕەقۆڕدەکات پێی دەوترێ قۆڕی لەوانیش ووردتر هەیە کەشەوگەردی پێدەووترێ، گەورەشیان هەیە کەبەقەد پشیلەیەك دەبێت بزن مژەی پێدەووترێ چونکە فرسەت لە بزن دەهێنێو گوانەکانی دەمژێ.

ئیتر بەرەو بنار کەوتمەڕێ هەتا گەیشتمە سەر بەرزاییەکەی بەرامبەر گوندەکە، لەوێ دارێکی کۆنەساڵی بەڕووی مامناوەندی هەبوو کەبە دارەکەی (پیر محمود) ناسرابوو، ئەگەر لەو دارەوە سەیری داربەڕووە هەرەگەورەکەی سەر قەبرسانەکەی تەنیشتی گوندەکە بکەین کە بە دارە گەورە ناسراوە یان سەیری دارگۆیژە مامناوەندی یەکەی نێوان گوندی باخچەوکەمالان لەباکوری باخچەوە بکەیت یان لەباشوری باخچەوە لەنێوانی باخچەو گوندی (شەمە)دا

دار گۆیـژێکی تـری مامناوەندی هەیـە ئەگـەر هێڵك لـەنێوان ئـەم چـوار دارەدا بکێشین ڕاست وێنەی پاقلاوەیەکمان دەداتێ، ئیتر چومە سـەر کارێزەکەی دراوی دێ کە بە کانی چێوێ واتـە سارد ناسراوە، دواتـر چومە گوندەکەو چومە ماڵی خزمێکم بەناوی (مامەحەمەی پیرە).

لێرەدا دار گۆیـژەکان یادگارێکی دەسالێ لەوەوبـەری سـەردەمی پێـشمەرگایەتیم وەبـیر دێنێتـەوە کەلـە ڕێپێوانێکـی دووردرێـژدا بـە فـەرمانێکی فـەری پێـی هەڵـسام، ئیـتر لێـرەوە مەبەسـتی گەشـتەکەی باخـچەم تـەواوکرد وەك خـوارەوە، دواتـر گەڕامـەوە بـۆ ئـەو گەشـتەی دەسـاڵ لەمەوبـەر وەك یادگـار لەڕوانگـەی بـیرەوەری دارگۆیژەکـەی کـەباسمان کـردووە وەك: دوای ئـەوەی کـە لـە جەولـە و گەشـتێکی فەرمی گوندەکانی (ئەسێڵ. کانی هەنار. دەلوجە. قەلاٌقایمز. دوکەرۆ. قامیشان. میریاسی).

لــە میریاســیدا کــە گوندێکــە کەکەوتۆتــە نــاودۆڵێکی ڕووی ڕۆژئـاوای چـیای بـەرانان لەبـەری قەرەداغـەوە، ئـەم گونـدە گوندێکـی کۆنـەو (میریاسـین) ناوێـك کەلەوەچـەی زەردی بـەگ بـووە ئاوەدانـی کردۆتەوە بۆیە بەو ناوەوە ناودەبرێت، لەم گوندەدا ماڵی پورە خەجێ کە خێزانـی ڕیـش سـپیی ئـاوای بـوو خـەڵکی گونـدی بێـستان سـوور بـووەو بەخزمایـەتی بـەوان دەگەیـشتم، کوڕێکـی هاوتەمـەنی خۆمـی هـەبوو نـاوی حمـە رەئـوف بـوو زۆر هاوڕێیـەتیمان پەیـداکردبوو بۆیـە هەردەم لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆماڵـەوە، لەوکاتـەدا کە لـە مـاڵی ئـەوان بـووم نامەیـەکم بۆهـات کـەزۆر بەپەلـە بگەمـە قـەرەداغ بـۆ مەبەسـتی گواستنەوەم (نقل) لەناوچەی قەرەداغەوە بۆ ناوچەی وارماوە.

قــەرەداغ خــۆی لەبنەڕەتــدا (کــارداك) بــووە وەك ناوچــەیەك کەلەسنوری بازیانی ئێستاوە لە باکورەوە بەدۆڵێکی تونکەتونکاویدا بەرفراوان شۆردەبێتەوە بۆ سنووری دەربەندیخانی ئێستا، شاخێك دەکەوێتە بەشی باشووری ئەو هەرێمە کە دەکەوێتە بەرامبەر گەندی (حەمەی کەرەم.شێخ مستەفا)، کەبە (شاخەڕەش) ناودەبرێت، ئیتر لە داگیرکاری تورکەکاندا فرسەتیان لە ووشەی شاخەڕەش هێناوەو ناوچــەکەیان لــە (کارداکــەوە گۆڕیــوە بــۆ قــەرەداغ) ئــەو شــوێنەی شارۆچکەی ئێستاشیان کردووە بە بنکەیەکی ئیداری خۆیان بە ئەویشیان ووتوە قەرەداغ وەك شارۆچکە، کەلەخۆیدا (زەردیاوا) بووە کەکەسێك ئەمیرێکی کورد بووە بەناوی (زەردی بەگ) ئاوەدانــی کردۆتەوە وەك گوندێکی شارەدێ و بەهەموو ناوچەکش ووتراوە زەردیاوا..

بنکەیەکی هێزی سەرەکی پێشمەرگە لە قەرەداغ بوو، مـن لێپرسراوی ڕیکخستنی بنکەی (نەوتی) بووم کە گوندێکە لەبناری بەشی ڕۆژئاوای بەرانان لە بەری قەرەداغ، گوایا ئەم گوندەش کە ئاوەدان کراوەتەوە لەشوێنێکدا دامەزراوە کە ئاوێکی چەوراو لە شوێنێك هەڵقوڵاوە بۆیە بەو سۆرخەوە ناونراوە نەوتی، کە نامەکەم پێگەیــشت لەمیریاســی بەپەلــە گەڕامــەوە بنکــەی نــەوتی و خۆمــم کۆکردەوە دوای خواحافیزی بە پشتی ئاوایی حەمەی کەرەمدا بە تولەڕیی دارستان و بەردەڵانەکەدا کەوتمە ڕێ هەتا گەیشتمە گوندی (داری زایین) کە دەکەوێتە نێوان نەوتی و قەرەداغەوە، لەدۆڵێکی بەری گوندەکەدا تەنکاوێك کە پێدەچێت زستاناوبێت هەبوو چونکە

ئەوکاتە پاییز بوو بارانێك باریبوو بۆیە ئاو بەکزی لە تەنکاوەکەدا بوو لەوبەری تەنکاوەکە نیمچە چیایەك داخزابوو کە بەشی سەرەوەی درزەکەی دیاربوو پێدەچێت بەفر و زەقایەتی زستانی پار دایخزانبێت.

ئیتر بەهەمان ڕیگەدا ڕۆیشتم لە نەوتی یەوە نزیکەی (٣) کاتچمێرێك گەیشتمە قەرەداغ.

هەتا کاری نەقڵەکەم تەواوکرد بووبەلای عەسر، بۆیە چوومە ماڵی ناسراوێك بەناوی (محمودی خەلیفە مراد) کە پێشتر خۆی لە بێستان سوور ژیابوون، ئەوشەوە لەوێ مامەوە بەیانی بەرەو باکوور کەوتمەڕێ بە ڕێگا فراوانەکەی (سلێمانی. قەرەداغ) دا هەتا گەیشتمە گوندی (ولیان) ئەم گوندە بە شاتووەوە بەناوبانگە ئیتر ڕێگاکە لادەداتەوە بەرەو چیا بە دارستان و ڕەقەن و تولە ڕێیەکدا، لەوێوە هیچ شارەزاییەکم نەبوو کە ڕێگای نزیکەی زیاد لە (٥) کاتژمێرە بۆ گوندی زڕگوێز کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی چیای بەرانان لەبەری شارەزووردا، لە ولیان لە کەسێکم پرسی بۆ زڕگوێز دەڕۆم و نەشارەزام ئیتر خستمیە سەر تولە ڕێگاکەو ووتی زۆر بزنە ڕێو تولە ڕێی لێدەبێتەوە بەڵام تۆ ئەم ڕێگایە بەرمەدەهەتا دەتباتە (فیسارە نیشان گرد) کە بەرزاییەك بوو لەسەر چیاکەو ووتی ئەودیوی ئەوێ دەربەندی زڕگوێزە، نابێت چاو لەو بەرزاییە ببڕیت بۆ ئەوەی ڕێگەیەکی تر نەگریتەبەر.

ئیـتر زۆر بـە هیلاکـی و برسـێتی و تونێـتی وە زۆر بەپەلـە ئـەو ڕێگاچـۆڵەوانیەم گرتەبـەر هـەتا سـەرەنجام لـەنزیك بـانگی مەغریـب گەیشتمە ئەو شوێنەی کەپیشانی دابووم، ئیتر لـەوێ وەشارەزابووم هەناســـــەیەکی شـــــادیم هەڵکێشائەگەرچـــــی زۆرمانـــــدووبووم، شـارەزاییەکەم ئـەوەبوو کـە یـەك دوو سـاڵ لەوەبـەر لەگـەڵ یـەك دوو هـاوەڵی قوتـابیم کەخـەڵکی زڕگوێـز بـوون بەدیـدەنی لـە سـلێمانیەوە چـووبووم، یـەکێك لـەو برادەرانـە نـاوی (سـاڵح ئەحمـەد) بـوو، هێشتا ماڵەکـەیانم پێـدەزانی، ئیـتر داخزامـە نـاو دەربەندەکە کـە حـەوزوئاو و باخەسێوێکی بەرفراوانە باخی (غەفورئاغای حاجی مەلا سەعید) بوو کـــە یـــەکێك بـــووە لـــە کەســـایەتیەکانی ســـلێمانی، بـــەلای ماڵـــی باخەوانەکـەدا ڕۆیـشتم و بـۆ ئـاو خواردنـەوەو دەم و چـاو شـتن چـومە سـەر حەوزەکە باخەوانەکە خوڵکـی کـردم بـەڵام مـن کـات درەنـگ بـوو دەمویـست بگەمـەئاوایی بۆیـە لەگـەڵ بـانگی مـەغریب دا لـە دەرگـای مـاڵی (مـام ئەحمـەدی بـاوکی کـاك سـاڵح) م دا ئـەو شـەوە میوانداریان لێکردم بەلام من لەبەر ماندوویی حەزم دەکرد تـەنها دووچـا بخـۆم و بنووم، بۆ بەیانی لە تەق و ڕەقی کابانی ماڵ خەبەرم بۆوە دوای نان خـواردن بـەرەو گونـدی زڕگوێـزی بـچوك کەناسـراوە بـە (زڕگوێزەڵـە) نیوسـەعاتێك دەبێـت لـە زڕگوێـزەوە بـەڕێ کـەوتم تـا چـوومە لیژنـەی ناوچەی شۆڕش کە ئەوکاتە لەوێبوو، کاروباری نەقڵەکەم تەواوکرد ئیــتر ڕێگایــەکی یــەك ڕۆژی تــەواوم لەبــەربوو کەبەشــی هــەرەزۆری چۆڵەوانی بوو، سەرەتا زۆر یـا کـەم ڕۆیشتم تـا گەیشتمە گوندێك کـە (یـەك ماڵـە) یـان پـێ دەووت لەناودۆڵێکـدابوو دوو سـێ مـاڵ بـوون

تانەچـویتایەتە سـەربانەکان نەتـدەزانی ئـاوایی یـە، یـان بەپـشتی گوندەکەدا لەترسی سەگ کەئاگام لێ بوو سەگی خراپیان هەبوو ئیتر زۆر بەپەلـە کەوتمـەوە سـەرڕێگا زۆر ڕۆیـشتم یـان کـەم تـا گەیـشتمە دامێنی بەری بەری ڕۆژهەڵاتی (کەماڵان) کە چەند خولەکێك دەیدا بە خـوارووی گوندەکـەدا، لەوێـشەوە بـەخێرای ڕۆیـشتم تـا گەیـشتمەوە دارگۆیژەکـە بووبـووە روانگـەی بیرەوەریـەکانم، ئیـتر ڕۆیـشتم تـا گەیشتمە دامێنی گوندی باخچەی گەشتەکەمان کە ڕێگاکە دەیدا بە چەند خولەکیك خوارووی بەری ڕۆژهەلاتی گوندەکەدا، لەم گوندەدا خزمم هەبوو و ماوەیەك تیا ژیابووم بۆیە ویستم لادەم بەڵام دووری ڕێگاکـە نەیهێـشت بۆئـەوەی بگـەم، ڕۆیـشتم ڕۆیـشتم تـا گەیـشتمە دارگۆیژەکەی نێوان گوندی (باخچە و شەمە) ئیتر لەوێ پڕباخەڵم کرد لـە گۆیـژ لـە هـەردوو دار گۆیژەکـە کـە تـازە پێگەیـشتبوو ڕۆیشتم تـا گەیشتمە دامێنی بەری ڕۆژهەڵاتی زیاد لـە چارەکی دامێنی گوندی شـەمە، لـەوێ توشـی بێـستانەوانێك بـووم کـە کاڵـەکی لێکردبـۆوە کاڵکەکان هەریەك جۆرێك بوون، لێم پرسی ئەمانە چەشنیان چی یە؟، وتـی: (شـەمامی - شـێلمی - ڕووشـە. فاتـەبۆرە. مـەرەنی) و نەوعـی تریشی هەبوو، خوڵکی کردم و زۆر بەپەلە یەك قاشی کاڵەکم خواردوو بە چۆڵەوانیەکەدا ڕۆیشتم هـەتا گەیشتمە پشتی گوندی (زەیۆمـەر) بەناو زەوی یە بەراوەکانی ئەوێشدا ڕەتبووم ڕووەکێکی گوڵە (سـەوڵ) ی زۆر دڵ ڕاکێشم بینی ئیتر ڕۆیشتم هـەتا گوندی (نەمـەڵ) دەرکـەوت کە زۆر لە خوارەوە بوو بەڵام ئاهێکی خۆشیم هەڵکێشا کە زانیم نزیك بومەتەوە، شەڵاڵی ئارەق بووبووم، پێڵاوم بەپێوەنـەمابوو، شـەکەت و

ماندوو، هەرپەلەم دەكرد بۆ زوو گەیشتن بەماڵی خوشكم، ئیتر دام بەپشتی گوندی (خەرجانە) داو لەوێوە پاش چەند چركەیەك بەكولەمەرگی خۆم گەیاندە گوندی (جۆلانە) كە كۆمەڵێ كەس و كاری یەك بوون لەهۆزی ڕۆغزایی بەرەی وەسمان، ئیتر لە دەرگای ماڵی خوشكەكەمم دا وەك لەبرێ چویەك بەپێلاوی دڕاوو ماندوی و عارەقاوی یەوە خۆم كرد بەژووردا خوشك و خوشكەزاكانم زۆر لەخۆ بونەوە خەریك بوو بانگی مەغریب دەبوو كەهاوسەرەكەی پیاوێك بوو بەتەمەن بەهۆی ئاژەڵ و شتەوە لە دەرەوە هاتەوە بەوحاڵەوە منی بینی لە ڕاستی دا زۆر پیاماهەڵشاخا چونكە بە بۆچونی ئەو ئەمە حاڵی تەلەبەیە كە مەكتەبەكەت بەجێ هێشت، دایكت بەجێ هێشت، ئائەوەش حاڵەكەتە بەپێی پەتی گەیشتویتە ئێرە، وابزانم كوردایەتی لەسەر تۆ پەكی كەوتووە.

لە ڕاستی دا وەڵامم نەدایەوە چونكە لەمن گەورەتر بوو وە بە دڵسۆزیش بۆ منی بوو ئیتر ئەو شەوە میواندارییان لێ كردم و جلەكانیان بۆ شتم و ڕیشم تاشی و جوتێ پێلاوی هەرەكۆنەیان بۆ پەیداكردم و بۆ بەیانی بەڕێی كردم بۆ گوندی كانی توكە نزیكەی سەعات و نیوێك لە وێوە دووربوو هەموویان ئامۆزاو كەس و كاری زاواكەمان بوون ڕایسپاردم بچمە ماڵی (محمودی حەمەعلی ئامۆزای).
ئەو گوندە دەكەوێتە بەری باكوری ڕۆژئاوای دەسپێكی چیای گەورە قەڵا كە بە ڕێگایەكی لاپاڵی نیوەبازنەیدا بە دۆڵەكەدا بەرەو خوار دەبێتەوە دەچێت بۆ دۆڵێكی بەری ڕۆژهەڵاتی دەسپێكی گەورە قەڵا كە گوندی (بێدەن) ە و كەلە دواوە باسی دەكەین.

بچینەوە سەرباسەکەمان لەماڵی کاك محمودی حەمەعلی میوانداری نیوەڕۆیان پێ کردم و پێم ووت کە گوازراومەتەوە (نقل) کراوم وەك پێشمەرگەیەك بۆ بنکەی بێدەنی لقی وارماوا، لەوەڵامدا ووتی بەرپرسەکانیان هەموو خزم و ناسیاون دوایی تۆیان پێ دەناسێنم، هەرواش بوو، دواتر ووتم دەمەوێ بچم بۆ ڕوکاری ئەو دیوی بەری قەرەداغ بۆ گوندەکانی (دوکان و دوکەڕۆ)، چونکە لەوێ کارێکی تایبەتی ڕاسپاردەی ڕێکخستنەکانی ئەوێم هەیە، ڕووی ئەودیوی شارەزام بەڵام لەم دیوەوە ڕێگا نابەڵەدم، کاك محمود پرسی باشە تۆ بۆ ئەم هەموو ڕێگەیەت بڕیوە لە قەرەداغەوە بۆ زڕگوێز و لەوێشەوە بۆ ئێرە و لێرەوە بگەڕێیتەوە بۆ دوکان، کەڕاست لە قەرەداغەوە بۆ تۆ زۆر ئاسانتر بوو ؟ لەوەڵامدا پێم ووت ئاخردەبوایە بچمە لیژنەی ناوچەی سلێمانی لە زڕگوێز بۆیە ئەم هەموو ڕێگەیەم بڕی ئیتر تێگەیشت و خستمیە سەر ڕێگاکە بە چیادا هەڵگەڕام بەرەو ڕۆژئاوا بۆ بەری قەرەداغ بۆگوندی دوکان، کە داخزامە خوارەوە بۆ گوندەکە زۆرم پێنەچوو بوو ئیتر لەوێ دوو سێ ڕۆژێك مامەوە چونکە کۆمەڵێك لەکوڕان و کچانی شار لە ترسی داپڵۆسینەکانی زەعیم صدیق ڕوویان کردبووە ناوچە ڕزگارکراوەکان ئێمەش لەوانەی کەهاتبوونە ئەوێ لەگەڵ کوڕان و کچانی گوندەکانی دەوروبەردا ڕێکمان خستبوون، کوڕەکان بەسەرپەرشتی (محمود روستم) ناوێك و کچەکانیش بەسەرپەرشتی کچێك کەناسراوبوو بە (خەبات).

## چامەی ئەحمەد کوڕەجوتیار

## ( مێژوو خۆی خۆی دەخوێنێتەوە )

**ئەی کێوە بڵندەکە ...، وا تەمەنت عەقدێکی زەمەنی گوزەشت**

**تۆ هەر تۆیــت و تۆ هەر لوتکە بڵندەکــەی جارانی**

**تۆ درەختی بەرائەتی لاپانی بەرزی جـــــــــــــاویدانی**

**ئەوەتا ئەلبومی عومرت دەساڵی لەمەوبەری پێـــــــوەدیارە**

**فلاش باکی برەوەریەکان خوێندنەوەی لاپەڕەی یادگـــارە**

**وەرز وەرزی تاسانەو**

**زەمەن زەمەنی بزاوتی ئازادی نیشتیمـــانە**

**شوێن گوندێکی قـــــەشەنگ و دلۆڤـــــانـــە**

**ناو باخە هەنجیرێکی لاپـــــاڵی پشتی ماڵانە**

**تۆ سەرگەرمی خوێندنەوەی پەڕتوکێکـــــی**

**کە مێژووی خەباتی قارەمانـــــــــــــانە**

**بەناخی خوێندنەوەکەدا چووبوویتە خــوار**

**بووبوویتە مەلەوانی دەریایەکی بی پایان**

**ناکاو ووشەی ڕۆژباشێکــی ناسك سەری پێ هەڵبڕیت**

**لەو خەیاڵەی دابڕیـــت**

**وەلێ تۆ سەرەتا نەتویســت هیچ شتێکی بــۆ دەربڕیت**

**بەلام ئەو پەشێوەو ووتەیەکی تۆی بەسە**

**تۆش پەرتوکەکەت لامەبەستـــــــــــــــــە**

**لەوێدا بووین کە (جیڤارا) پەرتوکەکانی بەکۆڵدا دابوو**

**بۆ ڕزگاری (بۆلیڤیا) بە چیادا هەڵزنا بوو**

تفەنگەکەی لەسەردەستی و بەرەولوتکەی هیوا ملی نابوو
کاتەکان لەسەرەخۆ دەڕۆیشتن
سەراپا ئاوێزەی سۆزوو هەست بوون
ڕێگاکان دیمەنەکان شانۆیەکی پڕجوانی بوون
دار هەنجیرەکان پڕلە جریوەی مەل و دلۆڤانی بوون
ئەی کێوەکان ئێوەشاهیدبن ئەگەر ژین بواری دا
ئەوا بڕیارەکان بەهار دێنن
ئەگەر مەرگیش بواری نەدا ئەوا لە عالەمی بالاوە مەبەستەکان
دەنەخشێنن
دوو ڕۆحی پاك وەك دوو باڵندەی عاشق لەسەرداری گوێ ڕووبارێ
هێلانەیەك دانێن بۆ ژینی نوێ لەکەنارێ
ئەو بەدەم لەرەی لێوەوە ڕووی وەرگێڕا بەرەو کۆچی کاروانی شار
تۆیش بوویتە ڕێبوارێ بۆ بزاوتی سەنگەرەکانی بن بنار
دوو نیگای گەرم و باقەیەك هەنسکی شاراوە
لە دوو لێوی لەرزۆکەوە خۆیان هێنایە ئاراوە
بزەیەکی زۆرەمـــــــــلێ بەدەم هەناسەی ساردەوە
دڵدانەوەی دڵی ڕێژبوو، گریانەکەی دەخواردەوە
دوو ڕێگای دژوار بەیەك
یەکێ بەرەو کاروانی شار
یەکێ بەرەو ڕێبوارانی ئەستێرە کۆچەرەکانی بەر کەنار
پەڕتوکەکەم دابەکۆڵداو تفەنگەکەم بەشانەوە
مـــــــــلی ڕێم گرت بەدەم ئازارو ژانەوە
کەوتمەڕێ بە بنارا

وەك ئەوەی میرات گربم بۆمەبەستەکەی جیڤارا

لەگەڵ بەیان لەئەشکەوتەکەی (بێدەن) بویتە میوان

ئەوکاتانەی کە تۆ بەرانکو چۆغەیەکی شڕو

جوتـــێ پێڵاوی لاستیکەوە

سەرت بەقەد ئەشکەوتەکەی (بێدەن) بەرزبوو

ئەشکەوتەکەی (بێدەن) سەری لە کەشکەشان بوو

تۆ هاواری گیانبازێکی ئەم وڵات و نەتەوەبووی

ئەو دەنگدانەوەی بانگەوازی سەرخۆبوونی نیشتمان بوو

ئەی پیرە ئەشکەوتە ڕێدین سپی یەکەی بێدەن تۆ چیت دیوە؟

چەند پاڵەوانی دێرینە لەلات بوونە میوان بۆمی باس کە ئارامی گیان؟

ئەشکەوتەکەی بێدەن لەوەڵامدا:

ئەوەتی ئەم گێتییە و ئەم چیا هەنە ئەمنیش هەم

زۆرم دیوە چەرمەسەری و کاروانی غەم

زۆرم دیوە شادمانی و هەناسەی ساف

زۆرم دیوە عاشقانی زولف تەناف

قارەمانان گەلێك لێرە لام میوان بوون

هەموو قەشەنگ دلۆڤان بوون

جەنگ و بەربەرەکانێم زۆر دیوە

تیشکی هەتاوی کەش کەشانم زۆر چنیوە

چاخێك ئەم دەڤەرە وڵاتێك بوو پڕپیت و بەرەکەت

پاشایانی بەدەسەڵات و هەیبەت

**(گۆتی و لۆلۆ) باپیرانی ئەم دەڤەرە**

**لەم وولاّتە سەرانسەرە فەرمانڕەوا بۆ شارەزوور ملّکی زاموا**

**دەستیان دەڕۆی بۆ هەر چوارلا**

**ناکاو کوندە پەپوی شوم (ئەکەدی یەکان) بوون داباران**

**خوێن لاشەی برد بۆ کەناران**

**(نارام سین) و (شارکالّ) ی کوڕی بەسەر ئەم وولاّتەیاندا داخوڕی**

**زۆری نەبرد پاش چەند سالّیّ**

**ڕۆلّەکانی گۆتی و لۆلۆ بەکەمالّیّ**

**بەسەرکردەی (ئانۆبانین) لوتیان شکاندن و دایان مالّین**

**پاش بەینێ تر (ئاشور) هات و جارێکی تر جەنگ بەرپابوو**

**وولاّت سوتاو بوو بە سووتوو**

**هۆزەکانی (گۆتی) و (لۆلۆ) یەکیان گرت و دەولّتی مادیان بەرپاکرد**

**قەلّەم ڕەویان ئەم وولاّتەی گشت گرتەوەو ئاشوریشیان تارومار کرد**

**هەتا دواتر (هەخامەنش)، (ئەسکەندەر) و (ئەشکان )**

**هەموو هاتن هەتا بوو بەسەرەی (ساسان)**

**وەك گورگ دەمیان،**

**لە جەستەمان ژەنی، ژەنی**

**ئەم وولاتە کەوتە ژێرپێی داگیرکاران**

**تارو مار بوون دۆست و یاران**

**هەتا شمشێرە کولەکان گەیشتنە جێ**

**چاخی ئەنفال دەستی پێکرد**

**ئەوەی هەبوو لە سەرو مالّ هەموویان برد**

**گورگە بۆرەکانی عوسمانیەکانیش دەمیان ژەندە گەرووی گەرمم**

بزن ڕیشەکانی سەفەویش قۆچیان وەشان لە جەشتەی نازی پڕشەرمم
ئـەم چـاخانەی کـەپێم ووتـی هـەموو لـەبن ئـەم ئەشـکەوتە پاڵـەوانان سەنگەریان گرت
بۆ بەرگری ئەم وولاتە گیانی خۆیانیان بەخت کرد
گۆڕەکانی گەورەو قەڵاو سەرلوتکەی پیرداود و لە شارەزور تاڵ عەرەوان
شاهیدی ئەو حاڵەتە دەکەن عەیان
ئەوە لەوێش باسی چرپەی گەورە قەڵاو چرچە قەڵا
پاڵەوانێك بوو هەرخۆی چرچە دوو تەختەبوو
کەچی وەك هێزێکی پۆڵا لەم دەڤەرە فراندرابوو
کوردێکی نەوەی زەردەشت نەردی مەردی دەبردەوە
هەتا ئێستاش ناوبانگی ئەو لەم ئەشکەوتە
لە بێدەنگی گەروی مندا دەنگی زوولاڵ ئەداتەوە
چرچە ڕۆیشت کێ بەجێما لەوکاتەوە هەتا ئێستا
من بندەستی زۆردارم و چەرخی زەمەن چەپۆکی بەسەرمدا ئەداتەوە
خۆشمان کەممان بەخۆ نەکرد خوێنی خۆمان بە هەدەربرد
ئێستا هەناسەیەکی فێنك هەڵدەکێشم پڕبە گەروم
کەلاوانی نیشتمانم لام میوانن واپێشمەرگە دڵنەوایم دەداتەوە
ئەی ئەشکەوتە پیرەساڵەکەی مێژوو دەبێ چی بکەین
بۆ ڕزگاربوون لەدەست جەوری ئەم زەمەنە؟

ئەشکەوتەکە لەوەڵامدا:

دەبێ دایە دەغدوویەکی ترو باوە سپی مەندانەیەکی

تر بێت سێوێکی تر نۆشی گیان کەن دەربازمان کەن لەم کەمەنە

کورپەیەکی تر بخوڵقێنن، بەشیری زەردۆشەن گۆشی بکەن

زەردەشتێکی تر بێتەوە ئاوێستایەك بنوسێت و

دینی مەگۆش بێنێتەوە

دەوڵەتێك بە ئاینێکی نوێ بۆ ئەم ووڵات ونەتەوە دامەزرێنێت



لەگەڵ ئەو کچە هەڤاڵ بەندی یەکی تۆکمەمان هەبوو، ماوەیەك بوو لەناوشار قوتابخانەکان کرابوونەوە و شاریش کەمێك هێور بووبۆوە بۆیە کچەکە داوای لێکردم کە بەڵگەنامەیەکی بۆ مۆربکەم هەتا پێشمەرگە دەست نەهێنێتە ڕێگای تا سنوری میری، جێ بەجێم کرد بەناچاری چونکە دابڕانێکی دڵ تەزێن بوو، ئالێرەوە چامە شعریەکەی کە لە سەرەوە دەیبینن نوسیمەوە.

ئیتر دوای بەجێهێنانی فرمانەکەم لەوێ بەهەمان ڕێگادا گەڕامەوە بۆ گوندەکانی ترو لەوێشەوە بە ڕێگا نیوەبازنەییەکەدا بۆ گوندی بێدەن کەبەروپشت بوون، گەیشتمە ناو دۆڵەکەی بێدەن توشم بوو بەلاوێکی مووزەردی تۆکمەوە کە زۆر پۆشتەوپەرداخ بوو کەوڵە مەڕێکی لە بەردا بوو دیاربوو پیشمەرگەبوو کاتباشیم لێکردوو ئەویش بەسەروسیمای ماندوو شڕوشێواوی مندا هەڵی ڕوانی و بەلاوازی جوابی دامەوە، ئیتر بەنیگەرانی یەوە بەجێم هێشت و گەیشتمە گوندی بێدەن، چوومە بارەگای لق لەخۆمەوە لە پێشمەرگەیەکم پرسی لاوێك لەم حاڵ و شێوەیە کێ یە؟ئەوەی کەبینیبووم لەوەڵامدا بە پێکەنینەوە ووتی ئەوە (سیروان جافە) و ڕابەری سیاسی ئێرەیە، دڵم داخورپا چونکە کارەکەی من پەیوەندی بەوەوە هەبوو، بەڵام پێشمەرگەکە وەك لەدڵم ئاگاداربێت ووتی نەقڵ بووە بۆ هەورامان و هەرئەم یەك دوو ڕۆژە لێرە دەبێت، ئیتر ئاهێکی خۆشیم پێهات کە تووشم نابێت بەو کەسێتیەوە.

دوای ئەم حەوانەوەم ووتم بۆ جێگاوڕێگا ئێستا چیبکەم، ووتیان: بچۆ هەڤاڵ (مام صالح) ناسراوبە (سالەپیرە) با ناونوست

بکات بۆ ئازوخەو نوێن و بەرەو بەڵکو پێڵاویشت بداتێ چونکە پێڵاوەکانت بێکەڵکن، کە چوومە لای ناوبراو کۆمەڵێك پێڵاو هەڵدرابۆوە ووتی پێڵاوەکانی خۆت لەوێ دانێ و جووتێك هەڵبژێرە بەڵام بە پێکەنینەوە دوای نیوسەعات گەڕان جووتێکی چل و یەك و یەك شێوە بۆدی کەهەرتاکەی هی یەکێك بوو تاڕادەیەك لەیەك دەچوون کە دووتاکی جیاوازبوون بەناچاری لەپێم کرد، لێفەیەکیش کە ئاسمانی لێوەدیاربوو لەگەڵ بەتانیەکی هەڵوەشاوی عەسکەری دامێ و ناویشی نووسیم بۆ ئازوخە، کە هەڵم ڕوانی بە لێفەکەداو پێکەنیم ووتی بەوە قایل بە وادیارە تۆ (بێ مووت دەوێ)، ووتم ئەی سەرین پێکەنی و دووبارە ووتی نالێم؟ ئیتر جێگیربووم، سەرەتا ژیانەکەم تۆزێ کولەمەرگی بوو هەتا خۆش بەختانە نەقڵیان کردم بۆ بنکەی (بەردی گلان) و هەر لەو ناوچەکەدا لە گوندی (کانی کەوە) وەك بەرپرسێکی ئەو دەڤەرە مامەوە کەلەدوایدا باسی ئەو دەڤەرەم کردووە لە گەشتەکەی وارماوادا.

ئیتر بەشداری جەولەو چالاکیەکانی بۆ سەر ڕەبایە چوونم لەگەڵ پێشمەرگەکانی ئێرەدا ئەنجام دەدا بە لێپرسراوێتی یەوە هەتا چەند ساڵ جێگەی داخە ئەو ناوچە ڕزگارکراوە لە میری گۆڕا بە شتێکی تر، دووبەرەکی (انشقاق) کەوتە نێوان باڵەکانی سیاسی و عەسکەری و شەڕی براکوژی لێکەوتەوە، منیش ئەوەم پێ قایل نەبوو کە پشتگیری هیچ لایەك بکەم وەك پێشمەرگەیەك یان پێشمەرگە بکوژم یان پێشمەرگە بمکوژێت، چونکە زیاتر من بیروباوەڕی نەتەوەیم هەبوو، بۆیە خۆشبەختانە هەلی لێبوردنە گشتیەکەی میریم

قۆستەوە و ئێوارەی نەورۆزی (٩٦٤) بوو کەبۆ ڕێوڕەسمی نەورۆز خۆمان ئامادە کردبوو لەسەر لوتکەی بێدەن هاتبە خەیاڵمدا بەرەو جادەی دەربەندیخان بۆ ڕۆژهەڵات شۆڕبوومەوە، لەگەڵ سەیارەیەك سواربووم تا ڕێگەی (باریکە - بێستان سوور) نزیکەی عیشا بوو خۆم گەیاندەوە ماڵی خۆمان لەگوندی بێستان سوور، کارەکەم تێ گەیاندن، لەپاش دوو ڕۆژ چووم بۆ عەربەت، لەگەڵ موختاری گوند و پسولی لێبوردنم وەرگرت لەبەر پرسانی میری و دواتر چووم بۆ سلێمانی بۆ قوتابخانەکەم، قوتابیان و مامۆستایان زۆر ڕێزیان لێگرتم بەڵام جێی داخە ووتیان تازە دەبێت ساڵێکی تر بێیتەوە بۆ دەوام...

هەڵبەت ئەم ڕێپێوان و پێشمەرگایەتیە سەرەتایەکی هەبوو، یەکیەتی قوتابیانی کوردستان زۆرچالاك بوون شان بەشانی پێشمەرگەی داخلی بۆ گەیاندنی شاروشاخ بەیەك.

قوتابخانەکەی ئامادەی کشتوکاڵی ئێمەش لەوبوارەدا بەهرەوەر بوو، میری بە تێخزاندنی قوتابی سیخور کەلەملاولاوە هێنابووی ڕیزەکانمان کەشف بوون، ئاگاداریان کردین کەفریای خۆمان بکەوین، هەڵبەت ئەوکاتە خێوەتگەی ڕاهێنانی سەرکێڵگە کشتوکاڵیەکانمان هەبوو کە هاوین بوو، کە پەلاماریان داین یەکێکمان شەهیدکراو سیانیشمان گیرا ئەوانی تریشمان کەناومان هەبوو دەرباز بووین، من بەش بەحاڵی خۆم لەدۆڵەکانی دامێنی خێوەتگاکە لە بەکرەجۆ خۆم گەیاندە تانجەرۆ و لەوێشەوە بۆ گوندی (باباعلی)، هەڵبەت ئەوەمان لەبیرنەچێت بەدرێژایی ڕووباری تانجەرۆ لە قلیاسانەوە تا گۆلی دەربەندیخان بەشی ڕۆژئاوای هەمووی ڕزگار کرابوو هیچ مەترسیەکی

تێدانـــەبوو، تـــەنها ســـەر لوتکـــەی دەربەنـــدیخان بەهەمیـــشەیی و سـەرپردەکەی (قـەرەگۆل. تانجـەرۆ) بـەکاتی ڕەبایەیـەك هـەبوو، بۆیـە کـەڵکم لـەو ناوچـە ڕزگـار کـراوە وەرگـرت لـەڕێگای سـواری وولاخ و تراکتـۆرو پیـادەو ئەوانـە خـۆم گەیانـدە گونـدی (شـەمە) کەلەسـەرەوە باسمان کردووە، چونکە خەڵکی گوندەکەمان (بێستان سوور) بەهۆی داپڵۆسینەکانی زەعیم صـدیقەوە کـە کێڵگـە کشتوکاڵیەکان هـەمووی سـووتابوو، گوندەکـەش درابـووە بـەر تـۆپ و ڕەشـاش، بۆیـە ڕەویـان کردبوو بۆ گوندی شەمە منیش ئەوەم زانی بوو بۆیە چووم بۆ ئـەوێ لـــەپاش چـــەند ڕۆژ حەوانـــەوە لەگـــەڵ کەســـێکی ناســـیاوی خەڵکـــی گوندەکـەمان بـەناوی (کـاك حمـە سـعید وەسمـان) لـەئاوایی حەمـەی کەرەم بوو بەسواری ماین لەگەڵ خۆی بردمـی بـۆ ئـەوێ هـەر ئـەوڕۆژە کەسـێك لـە گونـدی خۆمـان کۆچـی دوایـی کـرد بـەناوی مـام فتـاح لەئاوایی سەرەتا لەگوندی (فەقیرە) کەخزمی ئەوی تیابوو لـە دۆڵێکـی سەرچیای بەرانان لەبەری قەرەداغ لاماندواو دواتـر بـۆ شـەو گەیـشتینە ئـاوایی حەمـەی کـەرەم، شـەو لـە مـاڵی زڕبراکـەی ئـەو ماینـەوە و بـۆ بەیانی من خواحافیزیم کرد لەگەڵ کەسێکی شارەزا لەچەمی دێوانـە پەڕینەوە بەرەو ڕۆژهەلات بۆ شارۆچکەی قـەرەداغ کـە بارەگـای هێـزی پێـشمەرگەبوو کـە گەیـشتم لای یـەك دوو ڕۆژ تـەیارە قەسـفی بنکـەو بارەگاکانیـان کـرد لەبـەردەم شـوێنی کۆنـە خەسـتەخانەکە کـەبارەگای بڵێـین ئێمـە بـوو ناپـاڵمێکی دابـوو بـە زەویـدا ئـاوی دەرهێنـابوو، کەبۆردومان تەواوبوو بەڕێز ئامرهێز کە عەقید (نوری مەلا مارف) بوو ناسـراو بـە (نـوری کەڵەشـێر) بـانگی کـردین و تێـی پێـچاین ئەگەرچـی

بۆردومانەکە هیچ زیانی گیانی لە پێشمەرگە نەدابوو، بەڵام لەهەندێ گوندی دەوروبەر زیانی گیانی دابوو، بۆیە لێی هەڵپێچاین ووتی هەبێ و نەبێ ئێوە جاسوستان تیایە و خەبەرتان داوە بۆیە تەیارە هاتە سەرمان، ئێمە لە سوێند خواردنداوووین ئەویش لە توڕیدابوو، ناکاو مامۆستا (عزیزی خەفاف) لەگەڵ مامۆستا (حسن حسین) پەیدا بوون و زۆر بەدڵ گەرمی و ڕێزەوە هاتن بۆ لامان چونکە ئەوان لێپسراوێتی یەکیەتی قوتابیانی سلێمانی بوون هەرلەبەر هەمان هۆی سەرەوە هەڵهاتبوون، لەوێ لێپرسراوبوون کەئەویان ناسی بە هەڤاڵ عەقید نوری یان ووت ئەمانە چالاکترین و دڵسۆزترین کەسانی یەکیەتی قوتابیان بوون لەبەر گرتن هەڵاتوون مامۆستا عزیز ڕەیکردە من و ووتی بەتایبەت ئەم لاوە گەنم ڕەنگە خوێن گەرمە هەڤاڵ (بازووبەندە) ەکەی لەمەڕخۆمانە، ئیتر عەقید نوری ساردبۆوەو داوای لێبوردنی لێ کردین، مەڕیان لە جاشەکان سەندوو وەك دەعوەت مەڕێکیان سەربڕی و کردمان بە سەیران، ئەگەرچی خواردنەکەی دوێنێمان لە لە نشێویەکدا بەجێهێشتبوو لەبەر بۆردمان من خزابوومە ژێرداره مێوێك لەبرساندا ئەوەندەم بەرسیلە خواردبوو ناوی خۆم لەبیرچووبوو، چونکە ترێ تازە ئاڵ و بۆڵ دەبوو، بەڵام ئەم دەعوەتەی ئەمڕۆ دوێنێی لەبیر بردینەوە.

ماوەیەك لەوێ مامەوە دوایی ناردمیان بۆ بنکەی (نەوتی) کەلەسەرەوە باسمان کردووە لەوێ بوومە بەرپرسی پێشمەرگەو لاوەکانی ئەو ناوە لە ئاوای (حەمەی کەرەم و نەوتی) بووم هەتا نقڵ بوونەوەکەم بۆ ناوچەی وارماوا کەلەسەرەوە باسمان کردووە وەك

ووتومـه ئەمـە دەگەڕێتـەوە بـۆ پێـش نزیکـەی دە سـاڵ لەمەوبـەر لـە شۆڕشی ئەیلولدا سەرەتای شەستەکان پێش ئەم گەشتە کە سەرەتای حەفتاکانە لەسەدەی بیستەم.

**دێی باخچە**

**نزرگەی کەلەپوری کوردییە**

باخـچە گونـدێکی بـچوکی سـەربە ناوچـەی (تانجـەرۆ.عربـت) ە ناوەکەشی لە جوانی و خۆشـی هەڵکـەوتنی شـوێن و شـاخ و دارسـتان و ئـاو و هەواکەیـەوە هـاتووە، (باخـچە) دەکەوێتـە بـەردەم زنجـیرە چیاکانی بـەری ڕۆژهـەڵاتی (بـەرانان)ەوە، ئـەم زنجیرە چیایە لـە هـەر ئاستێکدا ناوێکی تایبـەتی هەیـە....بەگشتی پێـی ئـەوترێ (بەرانان)، لەبەرامبـەر سلێمانی بـە هـەزارمێرد و لـەلای گڵـەزەردەو ژگوێـزەوە بـە (چـــیای گڵـــەزەردە) وە (دەربەنـــدی زرگوێـــز) و لەدەوروبـــەری ئاوەکەڵەشـــەوە بـــە (دەربەنـــد فـــەقرە) بەناوبانگـــەو لای ســـۆڵە و دەربەندیخانەوە بە (گەورەقەڵا) ناوئـەبرێ جگەلـەوەش لەهەنـدێ جێدا (پاشـارێ) و هەنـدێ شـوێن (هـەرۆژاوی) و زۆرنـاوی تـریش. ..لێـرەدا مەبەسـتمان شـوێنی دێی باخـچەیە کەنزیکـەی (٢کـم) لـەڕۆژ هەڵاتـی (هەرۆژاوێ) دایە.

ئەم گوندە وەك دەماودەم گێراویانەتەوە لە سەردەمی پیر خدری شاهۆوە (خوا لێی خۆش بێت) دروست کراوە یان ئاوەدان کراوەتەوە، چونکە بنەماڵەکانی خەڵکی ئەم گوندە ئەڵێن ئێمە بە بنەچە ئەچینەوە سـەرئەو زاتـە، هەرچـەندە ئەشـڵێن کـە ئـەو بنەماڵەیـە ئەچنەوە سـەر

مەولانا خالید (خوا لێی خۆش بێت) ئەمەم لە کاك شێخ برهان قەرەداغی بیست کەئەیوت ئێمە لە خاڵوانی ئەو بنەماڵەیەی باخچەین، بەڵام زۆر بۆچون هەیە کەلە وەچەی پیرخدری شاهۆیین ڕەگەزنامەی بنەماڵەکە لای (خاڵە شێخ عارف) ی ڕیش سپی دێبوو کەلە لولە قامیشێکدا پارێزرابوو... خوا لێخۆش بوو پیاوێکی سوور و سپی چوارشانەی پڕگۆشت بووە زۆر قسە خۆش و موسوڵمان و لەسەرخۆ بووە لە سلکی پۆلیسدا کاری دەکرد، سوارچاکێك و ڕاوچیەکی فۆلکلۆری بەناوبانگ بوو، تەمەنی لە(٩٠) ساڵ تێپەڕیبوو مامە (سەی علی) کەبە (سەی علی باخچە) ناسراو بوو تەمەنی لە (١٠٠) ساڵ تێپەڕی کردبوو لەسەرخۆ و خێرۆمەند بوو، بەکاری کشتیاری یەوە خەریك بوو باوکی معاون سید ئەوڕەحمانی باخچەبوو، (خاتوو زینەی خێزانی مام سید علی ) ئافرەتێکی شاژنی ناوچەکەبوو، پورە خاتونی خوشکیشیان کەناسراو بوو بە حاجی خاتون ئافرەتێکی دەست ڕەنگین و خێرخوا بوو، خێزانی (مامە حەمە) بوو، کەبە (پیرە) ناسرابوو، کشتیارێکی لێهاتووبوو، لە هۆرەی جافیشدا خاوەنی دەنگ و ئاوازبوو، دێکە زۆر کەسایەتی تریشی تیابوو، بەڵام لێرەدا بۆ ناسنامەی بنەماڵە سەرەکیەکان ئەو ناوانەم هێناوە، خەڵکی ئەم ئاوای یە شێخن هەرچەندە بەهۆی ژن و ژن خوازی یەوە خەڵکی تر لەناویاندا هەبوون، باخچە ماڵی کەم تیابوو هیچ کاتێك لە ٢٠ماڵ تێ نەپەڕیوە...ئەم گوندە بەر ڕاگوێزانە شومەکەی بەعس کەوت و لەئازادیدا دوبارە ئاوەدان کراوەتەوە،

دێیەکــە پــشتی داوە بــە ڕیــزە گردۆلکەیــەکی ڕوتەنــەوە و بەردەمیــشی نیمــچە دۆڵێکــی ڕەقەنــە، کۆتــای زنجــیرە گردۆلکەکــە گۆڕسـتانێکی کۆنینەیـەو بەشـی خـوارەوەش تـا ئێـستاش بـەردەوام بەکارئــەبرێ بــۆ ناشــتنی مردووەکانیــان، لەســەر لوتکــەی کۆتایــی گردەکە لە پشتی گۆڕستانەکە، دارە گەورەیە.

کەلەپور و ئاسەوارەکان

١. (دارە گەورە) دار بەڕوویەکی کۆنە ساڵە و تەمەنی ئەوەندەیە پشتاوپشت باسکراوە، وە ئەگێڕنەوە کە نزرگای (پیر خدری شاهۆ) بووە، چونکە چەندین جار لەژێریدا دانیشتوە و حەواوەتەوە، بەرزی ئەم دارە لە زەوی یەوە هەتا قەلاپۆپە نزیکەی (٢٥م) ئەبێ، پەلوپۆی وەکو تۆپ خڕەو تیرەکەی (٧٥م) ئەبێ، بەرزی قەدەکەی (٣م) ئەبێ و ئەسـتوری تـیرەی قەدەکـەی لـە (٣م) زیـاترە، ئـەم دارە بـێ بـەرە و سـەروهەیکەلێکی زۆر دڵگیرو جوانـی هەیـە و بەشێکە لـە کەلـەپوری (دێی باخچە) لەگەڵ گۆرستانە کۆنینەکەی.

٢. (کانی چێوێ) واتە کانی یە ساردەکە: ئەم کانی یە کارێزێکە بە پلیکانە نزیکەی (٢م) ئەچێتە خوارەوە، ئاوەکە لە لەغەمێکی ژێر زەمینـی یـەوە دێتـە کانیەکەو ئاوێکی ڕوون و شیرین و ساردی هەیە نزیکەی سەرێك ئاوی هەیە (بەشی ئاودێرانی دۆنمێك زەوی)، بۆیە زەویەکـەی بـەردەمی کەلـە دۆنمێـك کـەمترنی یـەو هـەموو سـاڵێك بـە (کالەك - خەیار. توتن)، دائەچێنرێ.

٣. (كارێزی دراوی دێ)(ناودێ): لەناو دێ یەكەدایەو كەوتۆتە بەردەم مزگەوتەكە، نزیكەی سەرێك ئاوی هەیە كەبۆ كاروباری پێویستی ئاوایی وەك خواردنەوە و شتن و ئاژەڵ ئاودان بەكاردێ هەندێجار لەكاروباری قوڕەكاری و دیواركردندا ئەبرێ، چونكە شوێنەكەی واهەڵكەوتووە كە زەوی و زاری لەبەردا نی یە.. ئەم كارێزە بە (٧بیر) لەبەردەم (قەدەغەی بەرداوێ) كەلە ڕۆژئاوای ئاواییەوە بە لەغەمی ژێرزەمینی بیر بە بیر بەیەك گەیەنراون، ئاوەكەی لەناو دێكەوە دەرئەچێ، ئاوێكی شیرین و سارد و ڕونە.. لەغەمەكە بە تاشەبەردی درێژ و پان و ساف هەڵچنراوە كە (٧٠سم) پانەو نزیكەی (١,٥م) بەرزە ئەملا و ئەولای لەغەمەكە و بنمیچی سەرەوەشی بەو بەردە تاتانە هەڵبەستراون، ئاوەكەشی بە جۆگەیەكی زیخاوی گەشو سپیدا نەرم نەرم بەرەو خوار ئەبێتەوە، لە درزی تاتە بەردەكانی بنمیچەكەیەوە چلورە شۆڕبۆتەوە كەهەردانەی نیومەتر درێژە و بەقەد مەچەكێكیش ئەستورە، ئەگەر ساڵەكەی سارد بێ ئەوا ساڵ و ساڵ ئەمێنێتەوە، لە (١٠٠مەتری دا) هەوایەكی ساردو بۆندار بە ڕووتدا دێ بەلام لەوە بەولاوە هەواكەی قورس ئەبێ و تاریك و قوڵترئەبێ و ئەكەوێتە مەترسی، بۆیە كارێزكەنی شارەزا نەبێ ناتوانێ لەوە زیاتر بچێتە ژورەوە، بەندە تا سەد مەتر چوومە ژوورەوە.

٤. كانی گەورە و ئەستێڵی كانی گەورە: ئەم كانی یە لەژێر بەردێكی گەورەدایە كەبە قەوارەی هۆدەیەك خانوی(٢بە٣م) ئەبێ، لەژێر بەردەكەدا حەوزێكە چواردەوری بەردی سروشتی یە زیاد لە یەك مەتر قوڵە، ئاوەكەی سەوزباوەو بۆگەنێكی ناخۆشی لێوەدێ زۆر

کەمە پڕبەپڕی لولە قامیشێکە ئەڕژێتە حەوزەکەوە کە لە چاڵێکدایە کە پڕبوو، ئەچێتە ئەستێڵێك[٣٢] بە درێژایی ساڵ ئەو ئاوە لە ئەستێڵەکەدا کۆئەبێتەوە و لەبەردەمیدا نزیکەی (پێنج دۆنم زەوی هەیە) کەهی بنەماڵەی خاڵە شێخ عارفەو بە خەیار - کاهو - کاڵەك و تەماتە دائەچێنرێ بە ئاوی (بەربەندەکە) ئاو ئەدرێ، هەر ئاوی ئەستێڵەکەش بە گردەکەی پشتی ئاوایی دا هەڵئەزنیٚ و لەوێوە شۆڕئەبێتەوە بۆ خشت بڕین و قوڕکاری و پێویستی تر، هەڵزنانەکەشی بە گردەکەدا دیارە لەسەر ئاستی بەرزی ڕووی سەرچاوەی ئاوەکەیە چونکە بەردەمی ئاوەکەو دێکە دۆڵ و خڕە، توانای پەڕینەوەی ئەو ئاوەی نیەو ڕێگای پردیش نی یە، بۆیە بە گردەکەدا هەڵی ئەزنێنن.

٥. (تلە قوچ) واتە بەردە درێژ: ئەم بەردە لە شێوەی قوچەکدایە لە زەوی چەقیوە لە شێوەیەکی سێگۆشەیی کەمێك ناڕێکدا بە بەرزی نزیکەی (٢٥م) وەك منارە چووە بە ئاسماندا، سەرەتا یەك دوو مەتری لەسەر زەوی یە وە کەمێك باریکترە و لەوەودوا ئەستور ئەبێ نزیکەی بیست مەتر بە ئەستوری بەرز ئەبێتەوە بە شێوەیەکی سێگۆشەیی ناڕێك، لەوە بەدواوە (٣م) یٚکی باریك و تیژ ئەبێتەوە ئەم بەردە شێوە قوچەکە بەتەنیشتەکانی درزی تیایە لە بەهاردا گیای بەرەزا کەلەشویت ئەچێ و ڕوەکێکی پزیشکی یە پیا شۆڕئەبێتەوە وەك پرچ و شێوەیەکی دڵگیری هەیە، ئەم ئەم بەردە ئەکەوێتە ناو(قەدەغە) (پاوان) بەرداوێوە.

٦. (بــەردەپان): ئــەم بــەردەش بــەردێکی پــان و گــەورەو چوارگۆشـەیە سیان لـە گۆشـەکانی یـەکی نزیکـەی (٥م) ئـەبێ کەمێك ناڕێکـە و گۆشـەکانی یـەکی نزیکـەی پێنـج مـەتر بـەرزە و پێنـج مەتـر پانە، بەڵام لای چوارەمی نزیکـەی (٢م) بـەرزە و (٥م) یـش پانـە شێوە پلیکانەیـەکی ناڕیکـە و بـە ئاسـانی ئـەتوانی بچیتە سـەری، ڕووبـەری سەرەوەی پان و تەخت و ڕێکە (٥,٥م) ئەبێ لە گۆشەیەکی دا درزێکی تیایـە کـە دەوەنێکـی قـەزوان و بـەڕووی تیـا ڕواوە دیمـەنێکی نـازدار و ســـەر ســـوڕهێنەرە، لاپاڵەکانیـــشی بـــەلاڵۆك و هــــەنجیری پیـــا شۆڕبۆتەوە ... ئەم بەردە ئەکەوێتە ناو قەدەغەی قارەمانەوە.

٧. (هـەڕۆژاوێ) واتـە داڕوخـاو: لـە ئـەنجامی بـەفر و بـاران و سـەرما و سـۆڵەیەکی زۆردا کـە ڕەنگـە بومەلەزەیـشی لەگەڵـدا بووبـێ، شاخەکەی ڕۆژئاوای باخچە هەرەسـی هێنـاوە و داڕوخاوەتـە خـوارەوە بە بەرزی چیاکە لەزەوی یەوە تا لوتکـەی چیاکە نزیکـەی (٥٠٠٠پـێ) بـەرزە وە لاپاڵەکەشـی بـە درێـژایی زیـا لـە (١,٥کـم) ە هـەروەك چـۆن شۆفلێك لە لاپاڵێك چەند کێلەیەك خۆڵ لابات کەلی ئەکات، ئاوەها ئـەو چـیایەش کـەل بـووە، هەرچـی گابـەرد و شـاخی زەردە و کاوەکانـە داڕوخاونەتـە پـێ دەشتەکەی بەردەمی، بەتێپـەڕینی زەمانـە ڕووبـەری ئەو چیایە بەدرەخت داپۆشراوەتەوە بەڵام بەهۆی هـەرەس هێنانیـەوە ڕێگـای هاتوچـۆ بـۆ هـەڕۆژاوێ کـەمێك نالـەبارە تـەنها ڕێگەیـەك بـە پێـچاوپێچ بـە پـشتی هەڕۆژاوێـدا تێپەڕئـەبێ، لـە لوتکـەوە ڕێگاکـە ئەکەوێتە پشتی هەڕۆژاوە و لەوێشەوە بەرەو دۆڵی قەرەداغ ئەڕوات و بە سەرچاوەی (تلە زەیت) دا تێ ئەپەڕێ، بۆ هاتوچۆی ئەم دیو و ئەو

دیو و بۆ هێنانی دار و مازو و بنێشت و گەلا و ڕوەك و بەروبومی دارستان و پێویستی یەکانی تری جووت بەکار دەهێنرێ...جارێك لەسەر کەوتنمدا بۆ سەرەوە پێم هەڵخلیسکا دەستم گرت بە دەوەنێکەوە و قاچم لە بەردێك گیرکرد باشبوو دەستم بە دەوەنەکەوە بوو چونکە بەردەکە لە ژێرپێم ترازا و بەناڵەناڵ تلۆر بووەوە تا لە چاو بڕا، دوای هەر ناڵەی ئەهات و شاخەکە دەنگی ئەدایەوە.

وتیان جارێك ولاخ بە بارە گەڵاوە کەوتووەتە خوارەوە لەو هەزار بە هەزارە لەت و پەت بووە...گزگل و مازو و بنێشتی ئەو دارە ڕەسەنانەی هەڕۆژاوێ زۆر باش و بە کەڵکن (بەنەتەق) (بەنەمشك) کەجۆرێکە لە فەریکە قەزوان زۆر خۆش و بەتامە لە وێدا زۆرە. ...لەبەشی باکوری ڕۆژئاوایەوە سێ گردۆلکە لە تەوقی سەری چیاکەن. .(بەسێ کلکان) یان (سێ کلکە) یان (سێ کوچکە) ناسراون.ئەوەی ناوەراستیان قوچەکێکی ئاسویی یە بۆ بەدی کردنی مانگی یەك شەوە.

٨. قەدەغەی بەرداوێ) (پاوانی بەرداوێ): ئەم قەدەغەیە هی بنەماڵەی (خاڵە شێخ عارفە) ڕووبەرەکەی زیاد لە (٥٠) دۆنم ئەبێت، پڕە لە دەوەنی تازە پێگەیشتوو (بەڕوو، گۆیژ، بەلاڵۆك، هەنجیر، چواڵە، زریسك کە بۆ پەرژین باشە ...) ئەم قەدەغەیە پڕە لە گابەردی زل زل، وەك وتمان شاخەکە داڕوخاوە و هەموو بەردەکانی کەوتونەتە ئەو زەوی یە، هەر بۆیەشە ئەم قەدەغەیە کەمێك کۆڕپەیەو، کاتی خۆشی بەر سوتانێکی سەرتاسەری کەوتووە دەڵێن گوایە لەکاتی شۆڕشی شێخی نەمردا (شێخ محمود) ئەوناوە بەهۆی بۆردمانی

تـەیارەوە، کـە فتیلـەی نـەوتی فڕێداوەتـە ئـەو دارسـتانە، پاوەنـەکان سوتاون، وەك دەماودەم وتراوە ئەگونجێ (ئەشکەوتی شەممە) بنکەی شۆڕشـگێڕان بووبـێ سـوارە شۆڕشـگێڕەکان لـەناو ئـەو قەدەغانـەدا بـووبن، هەرچـەندە ئـەم دەنـگ و باسـە زۆر ڕوون نـی یـە، مـن خـۆم گـاڵۆنێکی قورسـم بیـنی کـەوەکو ئاسـن وابـوو شـێوەی جلیکانـەی نـایلۆنی ئێستای هـەبوو بـە شـێوە و قـەبارە، (پـیرە) ووتـی ئەمـە لـەو فتیلـە نەوتیانەیـە کـە (تـەیارەی ئینگلـیز) ئەیخـستە خـوارەوە بـۆ سـوتاندن، ئـەم قەدەغەیـە و بەشـێکی زەویـەکانی بـەردەمی و ئەستێڵەکەی و کانی گەورە هی بنەماڵەی خاڵە شێخ عارفن هەرچەندە بەخشراون بۆ کاروباری گشتی خەڵکی دێ.

٩. (قەدەغـەی قارەمـان): ئـەم قەدەغەیـە ئەکەوێتـە بـاکوری ڕۆژئاوای ئاوایی یەوە و کەوتۆتە سەروی بەرداوێ و لەسەر سنووری یـەکن، ڕووبـەری ئـەم قەدەغەیـە (٧٥دۆنم) ئـەبێ و لەقەدەغـەکانی تـر زەوی کشتوکاڵی زیاتر تیایە و تەختانی ترە، دارستانی ئەم قەدەغەیە زۆر چڕ و پـڕە کەبریتیـە لـە (بـەڕوو، گۆیـژ، بـەڵاڵوك، هـەنجیر، چـواڵە لوسـەو بـادام و گـەڵێ دەوەنـی تـر) بـەڕوی ئـەم زەوی یـە بەناوبانگـە بـە سـوورە بـەڕوو جەوتەکـەی بـە جەوتـە خڕنوکـە ناسـراوە و باشـترین جەوت و بەڕووە دارەکەشی باشترین داری دارە ڕاوو عاسەڵای جووت و بەرەیـە، بـەردەپان کـە باسمـان کـردووە ئەکەوێتـە نـاو ئـەم قەدەغەیە...ئەم قەدەغەیە بۆچی بە قارەمان ناوبراوە؟!... چونکە وەك لەسـەرەوە وتمـان سـوارە شۆڕشـگێڕەکان لـەو دارسـتانەدا بـوون و بۆردومان کراوە و ئەم ناوەی وەرگرتووە. .. بەڵام ڕای باشتریش هەیە

بۆ ئەم نازناوە چونکە لەوەئەچێ لەو مێژووە کۆنتربێ، لە (م.شێخ برهان) قەرەداغیم بیست کە خۆیی و بنەماڵەکەی بە خاڵوانی بنەماڵەکانی باخچەیی ئەزانێ، ووتی لە زەمانی شێخی نەمردا، بەڵێ بۆردمانی ئەو ناوە کراوە بەڵام شەڕی تێنەکەوتووە، هەرچی نازناوی قارەمانیشە لەڕووی ئەم دیوو ئەو دیوو واتە بە ڕووی قەرەداغ و شارەزووردا، ئەگەڕێتەوە بۆ سەر (یۆنا) کوڕی (ماری) کە منداڵێکی جوولەکەی لێقەوماوبووە لە ماڵی زەردی بەگی قەرەداغدا گەورە بووە و ناوی ناوە (قارەمان)، ئەم قارەمانە گەڵێ کاری کوردانەو قارەمانانەی کردووە (وەچە دوای وەچە) موسڵمان بوون (قارەمانی یەکەم و دووەم و. ..هتد)، جاهەرچی ناوێکی قارەمانی پێوەیە لەو ناوچانەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو قارەمانەو ئەم قەدەغەیەش لەوەوە نزیکە بۆ ئەم نازناوە بگەڕێتەوە، ئەم قەدەغەیە هی بنەماڵەی (مامە سەی علی باخچەیە)، لە ڕۆژئاوادایە و ئەکەوێتە سەر سنوری دارە ڕەش و کەمالان.

١٠. (قەدەغەی خروکاوی) یان (بەلەکای) یان بە (کەڵەکاوی ناسراوە): ئەم قەدەغەیە ئەکەوێتە بەردەم (ئەشکەوتی شەممە) لە ڕۆژئاواوە دەکەوێتە سەر سنووری دێی شەممە، کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای دێی باخچە...هەروەك قەدەغەکانی تر پڕە لە داری بەڕوو، گۆیژ، بەڵاڵوك، هەنجیر، چواڵە، بەلك، زریسك. .. قەدەغە بچکۆلەیەکی شاخ و داخ و ڕەقەن هەیە، دارستانەکەی پڕە لە ڕووەکی خڕنوك کە ڕووەکێکی سروشتی کێویلەیە، بەرەکەی بۆ صابون باشە ... جا بۆیە ناوی خڕنوکاویشی پێ ووتراوە، سوتانەکەی قەدەغەی بەرداوێ

ئەڵێن گوایە لە بۆردمانی تەیارەی ئینگلیز بە خستنەخوارەوەی ئەو گاڵۆنە فتیلانە کە نەوت بوون ڕوی داوە.

١١. (ئەشکەوتی شەممە و کاوەکان): ئەم ئەشکەوتە ناسراوە بە ئەشکەوتەکەی (شەمە و وێلەکە) هەرچەند لە باخچەشەوە بەقەد شەمە نزیکە، ئەشکەوتەکە کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای باخچە و ڕۆژئاوای شەممەوە، لەناو قەدەغەکانی بەلەکاویەوە بەرەو بنار نزیکەی نیو کیلۆمەتر ئەڕۆیت کەگەیشتیتە بنار نزیکەی (٥٠٠ م) بەلاپاڵێکی دارستان و کەمێك لا لێژدا سەرئەکەوی ئەگەیتە ئەشکەوتەکە و کاوەکان، ئەشکەوتەکە ئەشکەوتێکی سروشتیە ئاسەواری دەستکاری پێوە دیارنیە ئەوەندە هەیە گەورە و قوڵە و لەچەند سەردەمدا وەك باسکراوە بنکەی چەند شۆڕشێکی کورد بووە، ئەو ئەشکەوتە جێگای شەواژوی ئاژەڵی دێکانە لە کۆتایی زستاندا، کە شەوانە ڕانە مەڕ ئەبەن بۆ شەو لەوەڕ لە شاخ و داخ گەر بیکاتە تەرزە و باران ئەوا شوان ڕانەکە ئەکەنە ئەشکەوتەکە...بە تەنیشت ئەشکەوتەکەوە زەردە و دیوارێکی هەزار بە هەزاری بەردینی زۆر پانە کە زیاد لە (٥٠٠م) پانە و نزیکەی (١٥٠م) بەرزە.کون و درزی زۆریان تیایە کەلەو کونانەوە دەوەن شۆڕبۆتەوە کەزۆر دڵگیر و جوانن.

١٢. (زۆنگەکانی ئاودێری و نێرگزەجارەکان): لەسەر سنووری دێی گورگەچیا لە ڕۆژئاواوە و لە ڕۆژهەڵاتی دێی باخچەوە زۆنگ و نێرگزە جاڕێکی زۆر جوان و دڵگیر و پڕ لە گژوگیای بۆنخۆش و کەنێرە و نێرگز هەیە، زۆنگەکە بە هاوین ئەکرێتە گۆل بۆ ئاودانی ئاژەڵی ئاوایی (کە پاراویشی پێ ئەووترێ).

١٣. دانەوێڵـە و گـژوگیا و ئـاژەڵ و باڵنـدەی مـاڵی و کێڵگـەیی و کێویەکان:

دانەوێڵـەو بـەروبوم و سـەوزەواتە کێویـەکان: گـەنم، جـۆ، تـوتن، کاهو، کاڵـەك، خـەیار،. .. هەرچی ڕووەکە کێویەکانیشە گرنگـەکانی: گنـۆر، کـاردو، کنگـر، پیـشۆك، هەڵـەکۆك، مالیونجـە، کەئەمانـە گیـای خواردن و پزیشکین.

ئاژەڵــە مــاڵی و کێویــەکان: ئەســپ، گوێدرێــژ، مانگــا و گــا، مەڕوبزن، سەگ، کێویەکانیش: وەك کەرویشك، ژیژك، چالەکە، ڕێـوی، گـورگ، خـشۆکیش هـەموو جۆرەکـانی مـار ئێجگـار زۆرن و بـزن مـژە (قۆڕی) ی گەورە زۆرن. .

باڵنـدە کێـوی و ماڵیـەکان: مریـشك و کەڵەشـێر، قـەل، کۆتـر و کــەو، کێویــەکانیش: کــەو، سوێــسك، بــازۆڕی، خومەکەوەلە،قوڵتــە چۆلەکەکان، کۆتر، (مێشە سی) چێرك، دووبراله[٣٣].

لـە مامـە (حەمـەی پـیرەم) بیـست کـە ئـەیووت: لـەم دارسـتان و شـاخەدا کـاتی خـۆی پڵنـگ و کـەمتیار هـەبووە، وە جـارێکیش کـوڕە شوانێك لە نزیك مەکۆی دزەکانەوە شمشاڵی لێداوە لەناکاو (وێـز) ێك نوساوە بە ملی یەوە تا خوێـنی نـە نەچنیوە بـەری نـەداوە، ئیتر کـوڕە شـوانەکە مردووە، پرسیم (وێـز) چۆنە ووتـی سـەری لـە مـار ئەچێ و لاشـەی لـە کـەو ئەچێ و بـاڵی هەیـە.پێـی دەڵێـن کـەومار ،چەشـنێك لـە پڵینگیش وێزەی پێ دەڵێن.

١٤. (ســــنوری دێــــی باخــــچە): لــــە ڕۆژهەڵاتــــەوە دێی (گورگەچیا)...لە ڕۆژئاواوە ئەو چیایەی کە باسمان کردووە (بەرانان)

بەشــی هــەرۆژاویٚ... لــە بــاکورەوە دیٚی کــەمالاٚن و لــە باشوریــشەوە دیٚی شــەممە. .. قەدەغــەو دارســتانەکانی باخــچە ئەکەونــە ڕۆژئــاواو زەوی یە کشتوکاڵیەکانیش ئەکەونە رۆژهەلاٚت و مەگەر هەندیٚ پارچە زەوی زۆر کەم و بچوك کەلە نزیك ئاوایی و نــاو قەدەغەکانــدان. .. مــەڕ بــەخیٚوکردن گــرنگترین کــاری خــەڵکی دیٚی باخــچەیە بەدوایــدا کــاری کشتوکاڵی کیٚڵگەی. ..

تیٚبینی:

شــەجەرەی نەســەبی بنەماڵــەکانی (باخــچە) بــە دەســتی (مــەولود تاوگۆزی) نوسراوە، ئەم بنەماڵەیە ئەچنەوە ســەر ســەیدی تــاوگۆزی و لەویٚشەوە بۆ سەر (پیرخدری شاهۆ) دوایش بۆسەر (فاتیمەی زەهرا)

جگــە لــەو ئاســەوارانەی کــە باســمــان کــردون ئەمانــەی خــوارەوەش بەشیٚکی ترن لە ئاسەوارەکانی باخچە:

- گردەکەی بەرامبەری ئاوایی لــە خواروی رۆژهەلاٚتــەوە لەســەر ریٚگای (شەمە و شارەزور) کــە دوو داری کۆنــە ساڵە بــە دارەکــەی (پــیر محمود) ناسراوە.

- گردەکەی پشتی ئاوایی بە (پشت ملە) ناسراوە.

- زەوی گەورە کە پارچە زەویەکە لە ناو زەویە کشتوکاڵیەکاندا کە باسمان کردون.

- قەدەغەی (قارەمان) م بە هی مــام سید علــی، (کــانی گــەورە) م بەهی خاڵە شیٚخ عارف ناوبردوە چونکە وام بیستون.

- بــەردە کونــاوی و کەللــە ســەرە بەردینــە زەبەلاحەکــەی نزیــك تلــەقوچ، هــەروەها گولەکــەو مــەکۆی دارەکــە هــەروەها کانیەکــەی

(سیاسەر) لە نزیك بەرکەل و ئەشکەوتەکان سێ ئاسەواری ترن لە باخچەدا.

.٣

أ. قەدەغەکەی بەرامبەر ئاوایی لە باشورەوە کە بەشێکە لە قەدەغەی کەڵەکاوی کە باسمان کردوە بە گردە بۆر ناسراوە.

ب. دارەکەی سەرکەل (داری میریاسی) کە باسمان کردوە بە دارەکەی (پیرداود) ناسراوە.

٤. زۆر سوپاسی کاك ( شێخ حسینی باخچە) و کوڕەکانی دەکەم کە هەندێ زانیاریان لەبارەی باخچە بۆ پەیدا کردم، ناوبراو لە بنەماڵەی سید نوری کاك ئەحمەدە کە باسمان کردوەکە لە بنەماڵە ناسراوەکانی ئەم گوندەن. شێخ سعیدی گەورە کە باپیرەی باخچەییەکان بوە پیاوێکی ئاینی و بەهێز و زانا بوە، لە شەڕێکی قارەمانانەدا بەسەر روسە غازییەکاندا سەرکەوتوە.

❊❊❊

پێشەکی گەشتەکەی وارماوا

وەك لـەلای هـەموان ڕون و ئاشـکرایە لـە دێرزەمانـەوە، هەرلـە سەردەمی عەرەب ئیسلامەوە بگرە هەتا عوسمانیەکان و فارسـەکان و داگیرکاری یـەکانی ئینگلیز و ڕژێمـە یـەك لەدوایەکـەکانی عیراق هەتا ئـەمڕۆ متمانـەیان لـەلای خـەڵکی گونـدەکانی کوردسـتان نەهێـشتووە چونکە ئەوەندەیان بینیوە لە ژێر ناوی هەندێ ئاوەدانی و سـەرژمێری و ئـەو شـتانەدا ئاکـامی خراپـی لەدواکەوتۆتـەوە بۆیـە تەنانـەت متمانەیان بە گەڕیدەیـەکی خۆماڵیش نـی یـە کـە ئەگـەر لێیـان بپرسـی سەرژمێری و شتەکانی وەك خۆی پێ بڵێن.

هەڵبـەت منیـش لـەم کـارەدا بـۆ پرسـیارەکانم لـەو ڕووەوە زیاتـر پەنام دەبردە بەر نزیك بونەوەیەك لە شتەکان، بۆیـە لـە هەرگونـدێك لـە شێوەیەکی نزیك بوونـەوەدا وەك خـوارەوە ژمـارەی ماڵـەکان و ژمـارەی دانیـشتوانم تۆمـارکردون، بونـی شـتەکانی تـریش هەڵبـەت بـە بینینـی خۆم وەك لەباسەکەدا دیارە و لە پرسیار لـەو کەسـانەی نـاوم هێننـاون لە باسەکەدا وەرگرتووە.

ئـەم گەشـتەم لەسـەرەتای حەفتاکانـەوە دەسـتی پێکـردو لـە کۆتایی حەفتاوسێ کۆتایی هات ئەگەرچی کەمێك لە گەشتەکە کەوتە بەهاری حەفتاوپێنج هەندێ بیرەوەری سەرەتای شەستەکانیشم بـەیاد هێناوەتەوە، وە بۆ ئەم گەشتەش تەنها پشتم بە کاڵە و پێتاوی خۆم و قەڵەم و دەفتەرێك بەستووە بۆیە ڕەنگە لاوازێتی پێوە دیاربێت.

ئەم کارەشم بۆیە ئەنجامدا چونکە وەك دەیزانین مێژوو زۆرجار دوبارە دەبێتەوە لەبەرامبەر گوند و شوێنەکاندا، کەزۆرجار بەر کاولکاری دەکەوێت و زۆرجاریش بەر گەشە و پێشکەوتن دەکەوێت، منیش کەلەم مێژووەدا ئەم گەشتەم کرد بەم ناوچەیەدا کەباسم کردووە بۆ مەبەستی ئەوەیە گە ئایا لە دوا ڕۆژی نەوەیەکی تردا چ ئالۆگۆڕێکی بەسەردا دێت؟ بەچاك یا خراپ؟ ئایا وەك ئێستا دەمێنێتەوە؟ ئایا کاول دەبێت ؟ ئایا گەشەدەکات؟ ئەمەیان دەدەینەوە دەست قەدەر.

وا لەخوارەوە نزیك بونەوەیەك لەژمارەی ماڵەکان و دانیشتوانی ماڵەکانی ئەم ناوچەیە تۆمار دەکەم:

- گوندی میرەدێ: ٤٠ ماڵ.
- قلـــــیجە: ٣٠ ماڵ
- کانی بەردینە (کانی کوێر): ٧ ماڵ
- ئــــــالان: ٧ ماڵ
- حـــــاسڵ: ٧٥ ماڵ
- کانی کەوەی کۆن: ٣٠ ماڵ
- کانی کەوەی چوخ: ٣٥ ماڵ
- ئاوایی شێخ حسین: ٢٠ ماڵ
- محمودخانی سەرو: ١٦ ماڵ
- محمودخانی خوارو: ١٤ ماڵ
- ئاوایی حمە عزیز: ١٢ ماڵ

- مالوانی برایم: ٩ ماڵ
- مالوانی حمەڕەشید: ١٠ ماڵ
- تەپەکەل: ٥ ماڵ
- داری قەلان: ١٢ ماڵ
- یەخشی حاجی دارا: ٩ ماڵ
- یەخشی حمەی عەول قایر: ٢٧ ماڵ
- زەڕایـــــــەن : ١٥٠ ماڵ
- کانی مـــــیل: ٨ ماڵ
- بێــــــــدەن: ١١ ماڵ

کۆی گشتی: ٢٠ گوند ٢٩٠ ماڵ

ژمارەی دانیشتوان ٢٩٠ ١٤٥٠ = ٥ X

- وەك لەســـــەرەوە ووتومانـــە ئەمـــە مامناوەنـــدی نزیـــك بونەوەکەیە[٣٤]

ناوچەی واماوا ناوچەیەکە دەکەوتە سەر قەڵەم ڕەوی قەزای دەربەندیخان لە سەردەمی گەشتەکەمدا سەنتەری ناوچەکەش گوندی چنارەبوو، لەکاتی خۆیدا سەر بە قەزای هەڵەبجە بووە، وارماوا دابەش دەبێت بە سێ بەشی سەرەکی یەوە، یەکەمیان دەکەوێتە ڕۆژئاوای شارۆچکەی دەربەندیخان یاخود ڕوباری سیروان، لە سیروان و دەربەندیخانەوە دەست پێدەکات بە ناوچەیەکی نیمچە سێ گۆشەدا هەتا دەگاتە گوندی شێخەدێی سوڵە، ئەو بەشە دەکەوێتە نێوان لە باشوورەوە چەمی دێوانە و لە باکورەوە چیای دەربەندیخان لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕوباری سیروان، گوندەکانی ئەم بەشە بە شارۆچکەی دەربەندیخانەوە ئەمانەن (بانی خێڵان، دێوانە، حەسەنە کاڕێ، باوە خۆشێن، چرچە قەڵا، سوڵە، فەقێ جنە، کانی سارد) بەشی دووەم دەکەوێتە ناوەندی ناوچەکەوە کە ئەویش شێوەی شێ گۆشەییە لە تونێلی دەربەندیخانەوە بەرەو کوردەوان تا گوندی سیارە، لە چیای دەبەندیخانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات تا گوندی بێسەڵمێن و گۆڵی دەربەندیخان، گوندەکانی ئەم بەشە ئەمانەن (بیلکێ، سیارە، قاشتی [٣٥]، وازۆڵ، ئەحمەد بڕنە، عازەبان، دەق و قەڵبەزە، بێسەڵمێن ، تۆو قوت، نێرگزەجاڕ) ئەم بە شەش دەکەوێتە سێ گۆشەی نێوان لە ڕۆژئاواوە چیای دەربەندیخان، لە ڕۆژهەڵاتەوە گۆڵی دەربەندیخان باکوریشی چیای بەردی گلانە.

بەشی سێهەمیش بەشی شارەزوور و ئەو ناوچەیەیە کە تەوەری باسەکەمانە، لە گوندی میرەدێ وە دەیت پێدەکات لە باشوورەوە بەرەو باکوور هەتا شێخەدێی ئاوایی شێخ حسین، لە ڕۆژئاواشەوە لە

جادەی (عەربەت / دەربەندیخان) شۆڕدەبێتەوە بەرەو ڕۆژهەڵات هەتا گوندی تەپەکەل و ئەویش لە نەخشەیەکی سێ گۆشەییدا، ئەم بەشەش دەکەوێتە نێوان جادەی دەربەندیخان لە ڕۆژئاواوە ڕوبارۆچکەی تانجەرۆ لە باکورو ڕۆژهەڵاتەوە چیای بەردی گلان لە باشوورەوە، بە بۆچون و دەماودەم (وارماوا) لەوەوە هاتوە کە دەورمان ئاوە، چونکە باشوری دەکەوێتە چەمی دێوانەوە باشوری ڕۆژهەڵاتیشی ڕوباری سیروانە، ڕۆژهەڵات و باکوریشی گۆلی دەربەندیخان و ڕوبارۆچکەی تانجەرۆیە، (دەورمان ئاوە) بۆتە (وەرمان ئاوە) یان (بارام ئاوە) کە لەسەر شێوە ئاخاوتنی ناوچەکە بارام دەبیتە وارام، بۆیە ووتویانە (وارام ئاوە) لە کۆتایدا بۆتە (وارماوا) پێدەچێت ئەو ناوچەیە لەلایەن بارام ناوێکەوە بۆ یەکەم جار ئاوەدان کرابێتەوە، ئەمەشیان بۆچونی دەماودەمە.

ئێستاش گەشتەکەمان لە شارەزوور بەری بەشی وارماوادا کە بەشی سێهەمی ناوچەکەیە کە باسمان کردووە، هەڵبەتە گەشتیش ماندوبونی زۆری دەوێت، ئەو گوندانەی کە دەتوانرێت بە ماتۆڕ یاخود جار بە جار بە ئۆتۆمبیل پیایدا گوزەر بکەیت پشویەك دەدات بە ماندوبونەکەت، ئەگەر چی لەو سروشتە بەهاریەدا سود لە جوانی سروشت و ئاسەوار و کەلتور نابینی بە پیادە نەبێ، ماندو بونیش بە فیڕۆ ناڕوات، مەبەستی سەرەکیم لەم گەشتە لە بەهاری سەرەتای حەفتاکاندا زانینی ناوی گوندەکان و ناوەکانیان لە چیەوە هاتون و سەرچاوەی ئاویان و سەرچاوەی ژیانیان و هۆز و تیرەیان و کەلتور و ئاسەوارە سەرەکیەکان، زۆر بە هەژاری ئەم گەشتەم ئەنجامدا، نە

هۆكـاری وێنـه گـرتن و نـه سەرچـاوه و نـه پـشتگیریەكی بـاش هەتـا گەشتەكەم بە وردتر ئەنجام بدەم، دەست لە دەست و قوەت لـه خـوا و توانای هێز و هزرم بەم شێوەیەی خوارەوە دەستم پێكرد، ئەوەمان بیر نەچێت تاكە گونـدێك كـه دەكەوێتـه پـشتی جادەی دەربەنـد لـه بنـاری گەوره قەلا كـه گونـدی (بێدەن)ە جگـه لـەم گونـده سـەرجەم گوندەكان دەكەونه رۆژهەلاتی جادەكەوه.

سـەرەتای گەشـتەكه لـه گونـدی (مـیرەدێ) لـه باشـوری ناوچـەكەدایه و كەوتۆتـه سـەر جـادەی دەربەنـدیخان نیـوان چـیای بـەردی گـلان بەشـێوەیەك كـه پـاڵی داوه بـه كۆتـایی بەشـی ڕۆژئـاوای چیای بەردی گلان، ئەو گونده لەسەر جادەیه و حەوزو كانی یـەكی تـا ڕادەیەك ئاودارو سەرچاوەی ئاوی ئەو گوندەیه، چەند دۆنمێك زەوی لەبەر ئاوەكەدایه دەكرێته كشتوكاڵ زۆرجار دەكرێته توتن، ئاژەڵداری و كـشتوكاڵی دێمـه كـار سەرچـاوەی سـەرەكی ئـابوری گوندەكەیـه، دانیشتوانی ئەو گونده لـه هـۆزی (میران بـەگین) كـه هۆزێكـی نـاوداری كوردایـەتین، لەگـەڵ دانیـشتوانی گونـدی قلیجـه لەیـەك بـەرەبابن، دانیشتوانی ئەو گونـده بـه شـێوه ئاخـاوتنی (وارمـاوایی) قسه دەكەن كـه شـێوەیەكی تایبـەتی یـه، بـۆ نمونـه: ئەگـەر بڵێـن لـەوێ دەڵێـن (لـه وێنه) ... هتد، ئەم گونده ناوی خۆی بـه خۆیـەتی (میرەدێ) لـه میران بـەگی هـاتووه، دوای تـەواو كردنـی ویستەكەم، ئیتر بـه نیـازی بـەردی گلان بەڕێ كەوتم بۆ گوندی (قلیجه) بـه بنـارێكی بـەردەلان و هەڵـەت و بەرز و نزمیدا كـەمێكیش دوره، لەبەر ئـەوه دەبـێ بـه ناچـاری وره بـەر نەدەیت بەهێزەوه ڕێگا ببڕیت، بەلام جوانی سروشتی بەهاری شاخ و

داخ و ســەوزایی و گــوڵو دەوەنــە تــازە پێگەیــشتوەکان و دەنگــی جۆراوجــۆری باڵنــدەکانی قــەدپاڵ و پێدەشــت هیلاکیەکــەت بــیر دەچــێتەوە، کــە ســەوزاییەکان بــەدەم شــنەی شــەماڵەوە کەروێــشکە دەکـەن و لەلایـەکی تـر دەوەنـە تـازە پێگەیـشتوەکان بـەدەم کزەبـاوە دەشنێنەوە فێنکیەك دەدەن بە دەرونت، کە سەرێکیش هەڵدەبڕی لـە باعـەی ڕانـە مـەڕێك لـەو نزیکانـە کاکـەی شـوانیش بەشمـشاڵ دەیـان لاوێنـێ، منیـش بـە بیـانوی ئـاو خواردنـەوە بـەرەو لای ڕۆیـشتم، خـوا قوەتـت بـات کاکـەی شـوان، ئـەویش ووتـی خـۆت بـە خێربێـیت کاکـی ڕێبوارفەرموو، من دەمویست فـەرموم لێ بکـات بۆیـە یەکسەر ڕۆیـشتم. مەڕمان تازە زاوە ئەبێت پارویەك فرۆم لەگەڵ بخۆیت (فرۆ شیر یـاخود ژەکی مەڕی تازە زاوە کە دەیخۆیت وەك پەنیر وایە زۆر خۆشە) منیش زۆرم پێخۆش بوو، چونکە هەرلە منداڵییەوە حەزم لە فرۆ بوو.

کەسەیرێکی پەنای گاشە بەردەکەم کرد چەند کـارو بەرخێکـی تـازە لـە دایـك بـوو لـە نـاو دەفرێکدا بـوو، لـە پرسـیارێکمدا بۆ کاکـەی شــوان ســەبارەت بــەو کــارو بەرخانــە، ووتــی :ناردومــە بــەدوای خاوەنەکانیان، ووتم: بەچیا دەزانـی کامـە هـی کێیە؟پێکـەنی!! ووتـی: سەد کارو بەرخم بۆ تێکـەڵ بکـە هـەر یەکـەم جـاری زەحمەتـە کـە بزانم هی کـام مەڕەیـە، ووتـی: کوڕەکـەم نـاردووە کـە خاوەنەکانیان ئاولەمـە بدەن پێی وەك مژدانـە (ئاولەمـە هەرشتێك کـە لەدەسـتیان بێـت بیـدەن بەو کەسەی کە مژدانەکە دەگەیەنێت)

دوای ئـەوەی کـە کاکـەی شـوانم بەجێهێـشت، بـەڕێگا لاپـاڵ و باریـك و بەردەڵانەکــەدا بــەناو دیمەنــە سەرســوڕهێنەرەکاندا ڕێگــام

**دەکرد بەرەو گوندی (قلیجە) سروشتە جوانەکە ڕایکێشام بەلای شعرێکدا، هەربەدەم ڕێوە بەشعرێك تابلۆیەکی دیمەنەکەم کێشا:**

**لەلاپاڵی ڕەنگین و جوانەوە بۆنی سوێسنە و هەلاڵەیە**
**لە ڕێدا چاوشارکێی چاوی جوانی گولاڵەیە**
**بەدەم شنەی باوە کسپەی دەوەنە دێ**
**کەروێشکەی سەوزە گیایە لەملاشەوە بەدەم کزەی شەماڵەوە**
**قاسپەی کەوە لەبناری یاڵەوە**
**لەپێدەشتەوە چریکەو ئاوازە لە پۆڕی لاڵەوە**
**باعەی ڕانە مەڕە بەدەم لەوەڕەوە**
**کاکەی شوان دەیلاوێنێ بەدەم نەرمە نەغمەی شمشاڵەوە**



– لەم کاتەدا دەنگی کەڵەشێرێك لە شعرەکەی دابڕیم و سەری پێ هەڵبڕیم بینیم لە گوندەکە نزیك بومەتەوە.

لە ڕۆخی گوندەکەدا مێرد منداڵێك لەوناوەدا گیای دەکرد بۆ کارژۆلەکانی هەلێکی باش بوو بۆ من، ڕووم تێکردوو ووتم کاکی بچکۆل نەبادا سەگێك پیامدا هەڵوەڕێ و ماڵی کاك (سعید بەگ) نازانم دەتوانی لەگەڵم بێیت ؟ لەوەڵامدا ووتی وەی بەسەرچاو، کەگەیشتینە بەرماڵ کاك سعید بەگ لەدەرگامانددا کەسێك هات بەدەممەوە کە زاوای ماڵی کاك سعید بوو وە خەڵکی گوندی کانی کەوەی (چوخ) بوو ناوی (کاکە حەمە) بوو ناسیاوێکی زۆرنزیکی خۆم بوو زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، چونکە کاك سعید بەگ لە ماڵ نەبوو ئەو میوانداریيەکی چاکی لێکردم لەدوای حەوانەوە و نان خواردن کاتی نوێژی نیوەڕۆهات پێکەوە چوین بۆ مزگەوت، مزگەوتەکە لە شوێنێکی بەرزایدابوو حەوز و ئاوێکی جوان و فراوانی هەبوو کەهەر ئەو ئاوە سەرچاوەی ئاودێری کشتوکاڵە بەراوی یەکانیان بوو کە کشتوکاڵی دێمەکاریشیان ئێجگار زۆربوو، وە بەبەخێوکردنی ئاژەڵیشەوە خەریك بوون، خەڵکی ئەم گوندە لەهۆزی میران بەگین وەك لەسەرەوە ووتمان، بێینەوە سەر مزگەوتەکە، کە دەست نوێژمان گرت بۆ نوێژکردن چوینە مزگەوت سەرم هەڵبڕی لەناو هەیوانی مزگەوتەکەدا بەسەر دەرگا سەرەکیەکەوە تابلۆیەك نوسرابوو (بنیاتینا میران بەگی باپیرمان – ڕوخا نەما تاق و هەیوان – جارێکیتر والی باپیرمان بنیاتی نایەوە – بەم شێوەیەی ئێستا هەڵیسانەوە) ئەو تابلۆ دێرینە کاریگەریەکی گەورەی لام پەیدا کرد

بۆیە پرسیارم کرد، کاك شێخ عبداللە ناسراو بە عبداللە کوڵ کەناسیاوێکی خۆم بوو لەوەڵامدا ووتی: ئەمە لە مێژودا ئەم مزگەوتە زۆر قەشەنگ بووە و میران بەگ بنیاتی ناوە دوایی لەسەردەمی تورکەکاندا کە گوندەکە بەر وێرانکاری دەکەوێ جارێکی تر ئاوەدان دەکرێتەوە، والی بەگ جارێکی تر بنیاتی دەنێتەوە، مەلا ڕەسوڵ ناوێك کەمەلای مزگەوتەکە بووە لەهەمان بنەماڵە بووە لە دایانیشمانەوە بە باپیری ئێمە دەژمێردرێت ئەو شیعرەی نوسیوە، خەڵکی ئەم گوندە هەرلەدێر زەمانەوە پلەو پایەی شارستانی و ئیداریان هەبووە لەدام و دەزگاکانی میردا. ئەم گوندە کە پێی دەووترێ (قلیجە) لەچەند ووتەیەکی دەماودەمدا وتراوە کە وشەی قلیجە وشەیەکی تورکیە، بەڵام قلیجە لەتورکەکان کۆنترە بۆیە پێی ووتراوە قلیجە، چونکە کەوتۆتە شوێنێکی چەپەك و پاڵی داوە بە چیاکەوە، ووشەی قلیج لەکوردەواریدا واتە خێل یان چەپەك دوورە دەست هاتووە کە ئەم واتایەیان زۆر ڕاستە بۆ ئەم گوندە.

دوای ماڵئاوای لە کاکەحەمە بەڕێگاپیادەکەدا بەرەو باکور ملمان نا سەرەتا یەك ڕێگا بوو هەتا گەیشتە دۆڵی ژاڵەکان لەوێوە بوبە دوڕیانە، ڕێگایەکیان دەچوو بۆ کانی کەوەی چوخ یەکێکیشیان دەچوو بۆ گوندی کانی کوێر، کاکە حەمە زۆر خولقی کردم کە لەگەڵی بچم بۆ کانی کەوە، بەڵام من لەبەر پێویستی گەشتەکەم داوای لێبوردنم لێکرد، دۆڵە ژاڵەکە هەرچەندە جوان بوو دەتووت چەپکێك گوڵەو لە ئینجانەیەکدا دانراوە بە گوڵەژاڵە ڕازاوەتەوە ئەگەرچی دەمزانی گوڵەژاڵە ژەهراوییە بەڵام گوڵێکی جوان هەستی ڕاکێشام،

لێی نزیك بومەوە و کاکەحەمە زۆربەتوندی هاواری کرد بکشێ دواوە، وامزانی بۆ ژەهراویەکە دەڵێت، بەڵام سەیرم کرد بەردێکی تیژی ١٠ کیلۆیی بەرزکردۆتەوە هەتا هێزی تیابوو کێشای بە نزیکی شوێن پێکەی مندا سەیرم کرد ماربوو کە سێیەم جار بوو لەژیانمدا ماری واگەورەو توکن ببینم، خۆشبەختانە هێشتا مار هەر سڕبوو سەرەتایی بەهاربوو بۆیە نەیگەستم و خۆی دابوو بەر بەخۆرەکە ئیتر مارەکەمان کوشت و لێك جیا بوینەوە، ئەو بۆ کانی کەوە و من بۆ گوندی کانی کوێر، بەڵام بەدەم ڕێگاوە لەدڵی خۆمدا بەترسەوە دەمووت خەریك بوو خەیاڵی ئەم گەشتەم سەرم بخوات، ئیتر لەگوندەکە، گوندی کانی بەردینە کە چوارپێیج ماڵ بوون دانیشتوانی لەهۆزی گەلاڵی بوون لەهەرەگوندە کۆنەکانی ناوچەکەیە، ئاخاوتنیان بەزمانی گەلاڵەییانەبوو بۆنمونە ئەگەر بڵێین: بۆ کوێ دەچی؟ (ئەڕای کۆرا ئەچی؟)، ئەم گوندە بە کشتوکاڵی دێمەکارەوە خەریکن لەگەڵ ئاژەڵداریدا، سەرچاوەی ئاویان کانیەکی بچکۆلە کەناوی گوندەکە خۆی بە خۆیەوەیەتی پێی دەڵێن کانی کوێر، دوای هێنانەدی مەبەستەکەم لە گوندی کانی کوێر، بەڕێگایەکی سەرەوخوار دا داکشامە خوارەوە بەرەو ڕۆژهەلات بە پیادە ڕێیەکی تەسکدا کەدەچوو بۆ گوندی (ئالان) ڕێگاکە زیاد لە دووکیلۆمەتر دەبوو، کە گەیشتمە گوندەکە، گوندێکی گەورە لەناو نیمچە دۆڵێکدا هەڵکەوتبوو، کانی و ئاوێکی تاڕادەیەك بەرفراوانی هەبوو، خەڵکی ئەم گوندە ئاوەدانە بە کشتوکاڵێکی دێمەکارو بەراوێکی بەش بەحاڵی خۆی زۆرەوە خەریك بوون، تا بڵێی ئاژەڵداریش بوون، خەڵکی ئەم

گونده لەهۆزی بەگزادەی گەلاڵی بوون، لەماڵی ناسیاوێکم لامدا بۆ حەوانەوەو وەرگرتنی هەندێ زانیاری کە ناوی محمودی حمە ئاغا بوو، بۆم دەرکەوت ئەمانە زۆردەمێك نابێت لێرەدا نیشتەجێن پێیدەچێ لەدوای نیشتەجێ بوونی کۆچەرییەوە لەدۆڵی گەلاڵەو ئالانەوە کەوتونەتە ئەم دەڤەرە.

ئەمانە لەبەرە بابی (ئینجا ئاغای گەلاڵین) کە شاعیرێکی گەورە و ناوداری ئەو هۆزە بووە، ناوی گوندەکە کەناوی (ئالانە) لەناوی دۆڵی ئالانەوە وەرگیراوە، ئەم گوندە ئەکەوێتە نزیکەی دووکیلۆمەتری گۆلی دەربەندیخانەوە کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی گوندەکە بۆیە هەندێك لەخەڵکەکەی بەڕاوە ماسی یەوە خەریکن، لەگەڵ ناسیاوەکەمدا چوین بۆ سەربەحرەکە و کەمێك سواری بەلەم بوین و ریافەتێکی ماسیشمان خوارد کە گەڕاینەوە گوند ئیتر من دوای ئامانجی مەبەستەکەم دەبێ بچم بۆ گوندی (حاسڵ) کە دەکەوێتە نزیکەی دووکیلۆمەتری ئالانەوە بەرەو باکور، گوندی حاسڵیش دەکەوێتە نیمچە دۆڵێکی بەرفراوان و گوندێکی ئاوەدان و گەورە پڕکانی و ئاوێکی تاڕادەیەك ناوداری باشی هەبوو، چواردەوری ئاوەکە بەداری بی چێنرابوو، خەڵکی ئەم گوندە سەربەهەمان هۆزی گوندی ئالانن، وەهەر لە هەمان زەمەندا لێرە نیشتەجێ بوون ناوی گوندەکەش کە حاسڵە لەدوو واتا پێکهاتووە یەکەمیان (کە نیشتەجێ بوون ووتویانە مەراممان حاسڵ بوو) دوهەمیشیان (بەڕاستی شوێنی بەروبومێکی زۆری دێمەکارو بەراوە و ئاژەڵدارییە) کە ئەمەیش لە کوردەوایدا حاسلاتی پێ ئەڵێن واتە بەروبومی زۆر.

ئەم گوندەش وەك گوندی ئالان و کانی کوێر بەشێوە ئاخاوتنی گەلاڵی زمانی ڕەسەنی باپیرانیان ئاخاوتن دەکەن، ئەم گوندە مزگەوت و بنکەی تەندروستی و قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو،

دوایی تەواو بونی مەبەستەکەم لەم گوندەیش دەبێ بەرەو باکور بەڕێگایەکی کە هاتوچۆی سەیارەیشی تێدایە بڕۆم بۆ گوندی (کانی کەوەی کۆن) کەنزیکەی (٥ کم) لێرەوە دوورە.

هەڵبەت گەشتەکە بە پیادە زیاد سود لە سروشتەکە دەبینرێت، بەلاّم هیلاکیش وات لێدەکات کە ئەگەر ئامێری هاتوچۆ دەست کەوێ جارجار بەوە گەشتەکەت تەواوکەیت بۆ کەمێك دەرچونی هیلاکیت، بۆیە پیکابێك لە گوندەکەدا بوو بەو پیکابە چووم بۆ کانی کەوەی کۆن، کە گەیشتم ڕاستەوخۆ چومە ماڵی ناسیاوێکی زۆرنزیکم کەپیاوێکی بەدین و مریدێکی بەتەمەن بوو ناوی (سۆفی کەریم) بوو، کەلە دەرگامدا خۆیی و کوڕەکەی زۆر بەسنگ فراوانیەوە پێشوازیان لێکردم کەچوومە بەرەوە هاوڕێیەکم لەوێ بوو دوای بەخێرهاتن، لەبەرئەوەی ماڵەکە ئافرەتیان نەبوو کوڕەکەی مام سۆفی قەیسی و ڕۆنێکی بۆ کردین دوای خواردنی سەرم کەوتە ئازار بە هاوەڵەکەی خۆمم وت کەئەویش ناوی (احمد) بوو، دەنکێك قەیسی لە مێشکمدا گیری خواردووە کاك احمدیش هەربەو قسەیە پێکەنی هەتا مام سۆفی ووتی دەبێ پێم بڵێن هۆی پێکەنینەکەتان چی یە؟ ئێمەش پێمان ووت و ووتمان ئەمە هەربۆگاڵتەیە ئەگینا هەر خواردنێکی ئێوە موفەڕکە مام سۆفیش ووتی دوعایەکتان بۆ دەکەم کە دەنکە قەیسی یەکە بێتە دەرەوە ئیتر بەدەم پێکەنین و خۆشی یەوە چامان خواردو

ئازارەکەی سەرم چاك بوو، مام سۆفیش ووتی دوعاکەم گیرابوو؟ کتێبێکی (بەهار و گوڵزاری) م.عبدالکریم مودەڕیسی پێشکەش کردم چونکە دەیزانی من لە خۆزیاری خوێندنەوەو دوور لەو کردارانەم کە سۆفی پێی ناخۆشە، ئەم گوندە دانیشتوانی لە هۆزی گەڵاڵین و کۆنترین گوندی ناوچەکەیە، کەوتۆتە ناو دۆڵێك کە پاڵی داوە بە پاڵی کانی کەوەوە، سەرەتا ئەم گوندە هۆزێکی تریان لەگەڵدا ژیاوە کە تەرخانی بوون، دوایی ئەوان جیابونەتەوە گواستویانەتەوە ئەودیوی پاڵەکە ئەوان بوون بە کانی کەوەی (چوخ)، ئەمانیش بوون بە کانی کەوەی (کۆن).

وشەی کانی کەوەی کۆن لەوەوە هاتووە تەنیا حەوزێکی بچوکی نیمچە شین کە لە کوردەواریدا کەوەی پێدەڵێن سەرچاوەی ئاوی گوندەکەیە، گوندەکە بەوەوە ناو نراوە، هۆکاری ژیانی ئەم گوندە بەروبومی دێمەکارو بەروبومێکی زۆری بەراوە لەگەڵ ئاژەڵداری ئیتر دوای ماڵئاوای بە بناری پاڵەکەدا بەرەو کانی کەوەی چوخ کەوتمەڕێ لەگەڵ هاوەڵەکەم کەئەم دوو گوندە ئەمدیوەودیون.

دوایی ئەوەی کەلەماڵی سۆفی کەریمی ئاشنام لەگەڵ کاك ئەحمەدی هاوەڵمدا وەك لەسەرەوە باسمان کردووە لە (کانی کەوەی کۆن) ەوە بەبن گردە سروشتی یە بەرزەکەی کە گوندەکە پاڵی پێوەدابوو بەڕێگا نیوەگۆ بەردەلآنیەکەدا بەرەو (کانی کەوەی چوخ) کەنزیکەی کیلۆمەترێك لەوێوە دووربوو بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێ کەوتین، سەرەتا گەیشتینە ناو نشێویەکەی کە کانیەکەی دراوی دێ، کانیەکی بەرپان و گەرماو و زەلکاو بوو کە جێگای پێویستی ئافرەتانی کانی

کەوەی چوخ بوو، لە نشێوی کانیەکە سەرکەوتین هەتا ناو کەلاوە کۆنەکان کەپێشتر ئەوێ گوندی کانی کەوەی چوخ بووە، بەلأم لەبەرئەوەی بەسەر کانی دراوی دێدا ڕوانیویەتی بۆیە گوندەکەیان گواستۆتەوە بۆ نشێویەکەی (٢٠٠م)ێك ئەولاتر کەپاڵیداوە بەگردێکی پان و پۆڕی نیمچە بەرز کەهەندێ کەس پێیان وایە کە ئەو گردە سروشتی یەو هەندێکیشیان پێیان وایە ئاسەوارییە، کە گەیشتینە ناو ئاوایی ڕومان کردە ماڵی کاك (حەمە سەعیدی حاجی فرج) کەئاشنایەکی خۆشەویستم بوو لەوێوە کاك ئەحمەدی هاوەڵم بەرەو گوندی خۆیان خواحافیزی لێکردم و منیش چومە ماڵی کاك حمەسعید زۆر بەڕێزەوە میوانداریان لێکردم و پاش کەمێك حەوانەوە بەرەو مزگەوتە پەڕپوتەکەی گوند کە کەوتبووە لاپاڵی بەری ڕۆژئاوای گردەکە سەیرم کرد ئاوێك بۆ مزگەوتەکە ڕاکێشراوە، دوای پێویستی مزگەوت ئەو ئاوە بەبەرزی لاپاڵی گردەکەدا بەرەو بەرجۆگەیەك بۆ ئاودێری ئەوێ ڕکێشرابوو[١] بۆ کشتە بەراویەکانی زەویەکانی کانی کەوە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو کەلە چەم و نشێویەکی زیاد لە بیست مەتر خواروتر لەوێ ئەو جۆگەیەی لێ ڕاکێشرا بوو، چەم و نشێویەکەش ناسراوە بە (چەمی چوخ) کە ئەو چەماوە لە گەورە قەڵاوە سەرچاوە دەگرێ و پێی دەووترێ زستانە چەم، چونکە هەرلە سەرپەڵەوە هەتاکو کۆتای بەختەباران ئەمە ئاوێکی زۆر بەخوڕو فراوانی پێدا تێدەپەڕێت کە هەندێجار ئەوەندە زۆرە کە بوارنادا، ئەم چەمە کەپێی دەوترێ چوخ هەندێ کەس ڕایان وایە کەناوێکی تورکیە و لە داگیرکاری عوسمانیەکاندا ئەمناوەی بەسەردا براوە، بەڵام ئەوەی

که ڕاستی یه ناوی ئه‌م چه‌مه زۆر له‌پێش داگیرکاری عوسمانیه‌کانیشه‌وه هه‌ر ئه‌و ناوه‌ی هه‌بووه و ناوێکی کوردی ڕه‌سه‌نه، چونکه له کورده‌واریدا ئاوێك بکه‌وێته کۆتایی یان ووشکهاتن پێی ده‌وترێ چۆقه‌ی لێبڕاوه، ئه‌م چه‌مه‌یش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌هاویندا ئه‌که‌وێته چۆڕه‌چۆڕ بۆیه به‌تێپه‌ڕینی ده‌وران بووه به چوخ، هه‌رله‌هه‌مان ناوچه‌ی سلێمانیدا شوێنی ترمان هه‌یه که‌ناوی وایان وه‌رگرتووه چونکه زستانه چه‌من و له هاویندا ده‌که‌ونه چۆڕه وه‌ك (چه‌می چه‌قان له سیدسادق) و (چه‌قچه‌ق له سه‌رچنار) دا که ئه‌مانیش هه‌ر له چۆقه‌وه وه‌رگیراون.

که چوینه ماڵی کاك حه‌مه‌سعید خاتوو ته‌لیعه‌ی خێزانی خواردنی بۆ ئاماده‌کبووین و ده‌یووت واده‌زانم که تاقه براکه‌م هاتۆته سه‌ردانمان[1]، دانیشتبووین له‌سه‌ر بانیجه‌که به‌سه‌ر ده‌شته‌کانی ئه‌وبه‌ردا ده‌یڕوانی که ئه‌و ده‌شتانه به چالگه ناسراو بوون که‌سه‌یرم کرد، له کاك حه‌مه‌سعیدم پرسی ئه‌وانه خێڵه‌کین؟ له‌وه‌ڵامدا ووتی به‌ڵێ کۆچه‌ری ته‌رخانی قه‌ومی خۆمانن دوێنێ هاتونه‌ته ئه‌وهۆبه‌یه، من به‌نیازبووم پێش هاتنی ئێوه بچمه خێرهاتن و سه‌ردانیان، ووتم جا مردوو له‌مه پاکتر ده‌شۆرێ؟ من زۆربه‌ئاواته‌وه‌م که سه‌ردانێکی ئه‌و خێڵه‌کیانه بکه‌م تا له که‌لتورو داب و نه‌ریتیان شتێك وه‌رگرم، کاك حه‌مه‌سعید ووتی جاکه‌واته ئێستا ئێمه ده‌چین بۆهۆبه‌که هه‌تا دێینه‌وه ته‌لیعه نیوه‌ڕۆژه‌که‌مان بۆئاماده ده‌کات، هه‌ڵساین و ڕۆیشتین هه‌تا سه‌دمه‌ترێك له ڕه‌شماڵه‌کان نزیك بوینه‌وه سه‌گه‌کانیان ویستیان په‌لامارمان بده‌ن به‌ڵام خێرا زه‌لامێك پاشه‌ی لێکردن که ئه‌وه

ووشـەیەکە خێڵەکیـەکان لەگـەڵ بەسـەگەکانیان ووت (پـاش) یەکسەر لەسەر سنگ دەکەون و بە کلکە لەقەو نوزە نوز ئیتر پەلاماری کەس نـادەن چـونکە ئـەوە داب و نـەریتێکی ڕاهێـنراوە بـۆ سـەگەکانیان کـە واتـای هـاتنی دۆسـتێك دەگەیـەنێت، خـۆ ئەگـەر هـاتنی کەسـانی دژوارودوژمـن ڕویـان تێکـەن سـەگەکان یـەك (کـس) یـان بەسـە بـۆ پـەلاماری دژوارەکـان، کـە ووشـەی کـس واتـای پـەلامار بردنـی سەگەکانە، هەر لە سەرەتاوە ئەو کەلتورە ڕایکێشامە ناو کۆمەڵی داب و نـەریتی جوانـی کـوردەواری و خێڵـەکی تـر لەبـەر هەردەوارێکـدا سێپاو مەشکە هەڵدرابوو ئافرەتێك یـان دوان دەیـان ژەن ئـەوەی کـە یەك ئافرەت دەیژەن بە مەشکەکە دەوترا (بزنـەوەس) ئەوەشی کە بە دووکەس دەیانژەن گەورەبوو پێیان دەووت (گـاوەس) ماناکانیشیان دیـارە ئـەویان پێـستی بزنـەو ئـەویان پێـستی گایـە، لەتەنیـشتی دەوارەکانـەوە چـیخ لێـدرابوو کاروبـەرخی کۆرپـەوبزن و مـەڕی نەخۆشیان تێکرابوو باعەباعێکی خۆش لە ناویەوە دەهات بەوشوێنە دەوترا (کۆز)، لەنێوانی ڕەشماڵەکاندا کوڕوکچی ووردیلە بەزاق و زیق و جل و بەرگی خێڵەکیەوە یاری و چاوشارکێیان دەکرد.

کەچووینە بەرەوە دەوارێکی حەوت ستونی ماڵی سەرۆك خێڵ و ڕیـش سـپی هۆزبـوو فـەرمومان لێکـراو چـوینەژورەوە مـافور لەمبەروبەری دەوارەکەوە کە دەستکردی جافایـەتی خۆیـان بوو زۆر ڕەنگاڵە و جوان لبادی نەرم بەسەریاندا ڕاخرابوو بەیناوبەین سەرینی لەپـەڕ دروستکراو دانرابوو لای سـەرەوە (لالـۆ) دانیشتبوو بەرزەپـێ هەستایە سەرپێ و بە پۆشاکی کەواو سەڵتەو پشتوێنی قۆقۆی شاڵ

لەپـشتداو مێزەرێکـی مـشکی و جامانـە تێکـەڵ کـراو بەرسـەریەوە ڕیـشێکی سپی داناردانـاری جـوان و جووتـێ سمێڵـی بـادراوی جـوان لەپشتیەوە بڕنـەوێکی درێـژ هەڵواسـرابوو بـە سـتونی دەوارەکـەدا کـاك حەمەسعید یەکسەر پەلاماری دەستی داو ماچی کردو لالۆش دەستی ئەوی ماچکرد کەلەکوردەواریدا دەس ماچێنی پێدەڵێن، منیـش چاوم لە کاك حەمەسعید کردوو هەروامکرد، لالـۆ کاك حەمەسعید ناسی و بـۆ مـن لێـی پرسـی :ئـەم کـوڕە خاسـە قـەوم خۆمانـە؟ وەڵامـی دایـەوە شناسمانەو ئەویش عەشایەرە و فەرقی نی یە هەرقـەوم خۆمانـە، کـاك حمەسـەعی لای ئـەوان هـەر بـەئاخافتنی خێڵەکیانـە قـسەی دەکـرد منیش ئەوەی دەمتوانی هەروام دەکرد، لالۆ زۆر ڕێزی لێگـرتین هەرکـە دانیشتین خێرا ئادەی کوڕە دۆ بێـرن و دۆ پێنەگەیـشتبوو ماسـتاویان هێنا چی هێنانێك کاسـەیەکی دارینـەی گـەورەی سـپی شـەکری دیـوی دەرەوەی نەخـــشێنراو بـــە چـــاوە ماســـی و باڵنـــدەی جۆراوجـــۆر کەوچـکێکی دارینـەی کلـك پـان و درێـژ لەلکەلەلکـە کـراو کـە کۆتایـی بەسەهمێك هاتبوو ڕووەکەشی بەچاوە ماسی و ئاژەڵ نەخشێنرابوو بەدوایدا یەکسەر بانگی چای کرد چا لەسەر سینیەکی ناسکی زەردی ئـاڵتون ئـامێز، ڕیزێـك پیاڵـەی زەڕلـی و ژێرپیاڵـەی فنجـان دانرابـوو، قۆریـەکی شوشـەو سـەماوەرێکی وەرشـاوی زیـوی جـوان لەتەنیـشتی سینیەکەوەبوو، شەکردانێکی بەرز لەلکەلەلکەکراو کەبە چاوە ماسی و باڵنـدەی وورد نەخـشکرابوو، لەناوەڕاسـتی کاسـەی شـەکردانەکەدا گۆیەك هـەبوو کەسـەرەوەی پارچە ئاسنێکی پێوەبوو چەسپ کرابوو بـۆ ئـەوەی بـە شەکرشـکێن شـەکرەکەی لەسـەر بـشکێنرێت شـەکر

شکێنێکی زەردی جوان دەم تیژ و بەشی سەرەوەی دوو شاخی وەکو شاخی ئاسکی هەبوو کلکەکەشی وەك هەڵمات وابوو، دوای چا خواردن کاك حمەسعید ووتی ئێمە لە خزمەت مەرەخەس دەبین، خەریك بوو هەستین لالۆ سوێندی خوارد هەتا نیوەڕۆژە نەخۆین هەڵناسین، بەپەنجە ئامـاژەی بۆ دەرەوە کرد بەرخێکی سەربڕاو بە چڵی دەوارەکەوە هەڵواسرابوو لالۆ ووتی ئەم کوڕە خاسە هەموو ڕۆژێك لای من میوان ناوێ ئیتر چۆن ئیزنتان دەدەم، پاش کەمێك نانهات لەسەر سینیەکی قورسی گەورە و نەخشێنراو کەلە مس دروستکرابوو، ناوەڕاستی سینیەکە نانی پێدا ڕاخرابوو لەسەر نانەکەوە پلاو هەڵڕێژرابوو کەژێرەکەی پڕبوو لەنەرمە گۆشت، ڕیزێك قاپی مسی جوانیش بەشێوەی پاقلاوەیی دانرابوو گۆشت و گۆشتاوی تیابوو، هەریەك کەوچکێکی دارینی ناسکی تیابوو، هەموو شتەکان فۆلکلۆری و سەرنج ڕاکێش بوون، نان خورا، پاشان کەسێك دەست شۆرێکی هێنا کە سەرقاپێکی کونکونی لەسەربوو شوێنی سابونی لێ دروست کرابوو لەمس، مەسینەیەکی مسی گەورەش کە ئافتاوەیان پێدەوت پڕبوو لەئاو، کەسەکەش خاولیەکی پێبوو دەستی پێڕادەگرتین لەسەر دەست شۆرەکە بۆ شتن، پاش کەمێك چامان خواردوو پاشان هەستاین بەشێوازی ڕەوەندەکان دەست ماچێنیمان کرد و خواحافیزیمان کرد، ئەوەی شایەنی باسە ڕوم نەهات بپرسم لالۆی ریش سپی خێڵ ناوی چی بوو، ئیتر بە کاك حمەسعیدم ووت با بچین بۆ گردی مالوان.

**لەوبـــــــــــەر ڕاچین بەچین ڕەش دەوار هەڵدراوە**

**ڕیش سپی خێڵ لەولاوە بەبڕنەوێکی درێژەوە وەستاوە**

**زاق و زریقی منـــــاڵانە لەسەر گۆڕەپانی هۆبە**

**قەلا قەلای کوڕ و کیژە یەك بەیەك نۆبە بەنۆبە**

**گەورە کچی جافە لەبەرماڵان گاوەسیان هەڵداوە**

**شڵـــــــقەی مەشکەیە هەڵواسراوە بە بەرسێپاوە**

**قەیرە ژنـــی خێڵـــــــــە تەونی هەڵـــــــواسیوە بەدارەوە**

**باعـــــەی ڕانە مەڕە بەدەم شمشاڵی شـــــوانی دڵدارەوە**

**باعە باعی کـــــــــــــارژۆڵەو بەرخە کۆرپەیە لە نێو کۆزەوە**

**گەردەتوانی لێرەدا کەلتوری ڕەسەنی خـــۆت بدۆزەرەوە**

لەگـەڵ کـاك حەمەسـعید بـەرەو ڕۆژهـەلات ڕۆیـشتین نزیکـەی کیلۆمـەترێك هـەتا گەییـشتینە سـەر گـردی مـالوان کـە گردێکـی ئاسەواری کۆنە کە پێدەچێت بنەماکەی هی گۆتی و لۆلۆییەکان بێت، گردێکـی قـوت و بـەرزبوو گـەورەو بەشـی سـەرەوەی کـەمێك پـان بـوو کەچوینە سەرەوە هەموو دەڤەرەکەمان لێوە دەرکەوت چواردەوری ئەو گـردە بـە بەربەسـتێکی خـۆڵین دەورە دراوە کـە کـاتی خـۆی ئـاوی تێکراوە بۆ پارێزگاری لە دوژمن.

زۆر دیمـەنی ئاسـەواری کۆنمـان لـەوێ بینـی وەك قوڵتـە گـۆزە و شتی وا، کە گەڕاینەوە ماڵـەوە خـاتوو تەلیعـە بـە پێکەنینـەوە دەیـووت زیافەتەکـەتان پێـدەژمێرم ئێـوە خواردنتـان بـە مـن کـرد و لەماڵـی جافـەکان نیوەڕۆژەتـان خـوارد، ئێمـەش هەربـە پێکەنیەنـەوە ووتمـان

نەچووە بچێت ئێوارە دەیخۆین کەواتە ئەو ڕۆژە لەوێ ماینەوە، خەڵکی ئەم گوندە لەهۆزی (تەرخانی) ین ژێواری خەڵکی ئەم گوندە کشتوکاڵی دێمەکاری بەرفراوان، کشتوکاڵی بەراوی بەرفراوان و ئاژەڵداریە، ئاسەوارەکانمان لەسەرەوە باسکردووە، دوای تەواوبوونی کە کارەکەم لە گوندی کانی کەوەی چوخ کۆتایهات ماڵئاوایم لەماڵی کاك حەمەسعید کردوو لە بەرئەوەی کە لێرەوە دەتوانیت لە هەندێ گونددا بەماتۆڕ هاتوچۆ بکەیت منیش ماتۆڕێکم لەوناوە دانابوو پێی ڕۆیشتم، ئیتر ئەوەبوو بەجادە خۆڵینەکەی گوێ جۆگاوی مالواندا بەرەو باکور بۆ ئاوایی شێخ حسین کەنزیکەی سێ کیلۆمەتر دەبوو ڕۆیشتم و گەیشتمە گوندی ناوبراو کەگوندێکی مامناوەندییە دانیشتوانەکەی وەك بە ناوی خۆیەوە دەڵێن ئاوایی شێخ حسین چونکە ئاوایی یەکە شێخە دێیە.

ئەم ئاواییە کەوتۆتە سێگۆشەی بەری سەروی دەڤەری وارماوای شارەزوور لەسەر ڕۆخی کەندی تانجەرۆ لەسەر جۆگای مالوان سەرچاوەی ئاوی بەکارهێنانیشیان چ بۆ کاروباری ماڵ و چ بۆ کشتوکاڵ چ بۆ ئاژەڵداری ئەگەرچی هەندێکیان بیریشیان هەیە پشت بەجۆگەی مالوان و چۆمی تانجەرۆ دەبەستن.

سەرچاوەی ژیانی ئەم گوندە ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێمەکاری بەرفراوانە بەر جۆگەشیان هەیە هەرچی بوونی ئاسەواریشە تەنها ئەوەیە کە ئەگەر بەرەو باکور نزیکەی کیلۆمەترێك بڕۆیت لەو شوێنەی کەجۆگەی مالوان لە تانجەرۆ هەلگیراوە بۆ بەرجۆگە هەرە بەرفراوانەکەی مالوان کەلە کوردەواریدا واباوە دەڵێن ئەڵێی (دەلێن و

مـالوان)ه لـه سێگۆشـەی تانجـەرۆ و جۆگـەی مالوانـدا ئاسـەواری گونـدێکی زۆر کـۆن بـەدی دەکـرا کەخـەڵکی ئـەو گونـدە کـاتی خـۆی لوڕەکانی پشت کۆ کەلە دەست ستەمی سەفەویەکان پەرتـەوازەبوون هەنـدێکیان هاتونەتـە ئێـرە بۆیـە بەوگونـدە ووتـراوە مـالوان کەئەمـە ووشەیەکی دەماودەمە کەلە ووشەی مەلەوانانـەوە وەرگیراوە، چونکە خـەڵکی ئـەو گونـدە هـەمویان مەلـەوان بـوون و لـەکاتی پێویـستدا خـەڵکیان پەرانۆتـەوە لـەزۆری ئـاوی ئـەو سـەردەمەی تانجـەرۆدا ئەمـە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە ووتراوە (ماڵ لە ئاوان) چونکە گوندەکە کەوتۆتە سێگۆشەی تانجەرۆ و جۆگەی مالوانەوە.

نـاوی جۆگـەی مـالوان و دەشـتە بـەراوەکانی مـالوان لـەوناوەی سـەرەوە وەرگـیراوە، خـەڵکی ئـەو گونـدە بەبـەخێوکردنی مانگـای ڕەسەنەوە خەریك بوون کەهەتا ئێستاش لە کوردەواریدا واباوە کەهەر ڕەشـە وولاخێـك ڕەسـەن و چـاك بێـت ئـەڵێن: ئـەڵێی مانگـای مالوانـە لەکۆتایدا بە تێپەڕبوونی زەمەن ئەو هۆزە لەناو خەڵکی ناوچەکەدا تواونەتەوە و تا ئێستاش بنەمایان لە گوندەکانی (قەرەگۆل - خاك و خۆڵ - نیسکەجۆ - داری قەلان - ساردکەو سۆیلەمیش - کەڵوڕان. بەژن و ژن خوازی لە هەندێ گوندی شارەزووردا هەن) وەچەیان ماوەو پێیان دەڵێن کەلهوڕ.

لە گەشتەکەمدا لە ماڵی کاك شێخ جەبار لام دابوو دوای تـەواو بوونـی مەبەسـتەکەم ماڵئـاوایم لێکـردن و لـە ئـاوایی شـێخ حـسینەوە بـەرەو باشـور هەربـەماتۆڕ گەڕامـەوە نزیکـەی کیلۆمـەترێك هەتـا گەیشتمە (محمـود خـانی سـەرو محمودخـانی خـوارو) کـە دوو گونـدی

بچوکن کاتی خۆی محمودخان ناوێك دوای نیشتەجێبوونی ڕەوەندە جافەکان ئاوەدانی کردونەتەوە ئەم دووگوندە هەردوکیان کەوتونەتە ناو چەماوێك تەنها ڕێگای پیادە ڕێی هەیە لەم گوند بۆ ئەو گوند ئەگەرچی لەیەکەوە نزیکن و لە جادەی ئاوایی شێخ حسینیشەوە نزیکن سەرچاوەی ژێواری ئەم دووگوندە لەسەر زەوی و زارێکی بەراو دەژین کەبەجۆگەیەکی سەربەخۆ ئاودێر دەکرێت بەناوی (جۆگەو بەراوی محمودخانی) سەرچاوەی بەکارهێنانی ئاویشیان هەرئەو جۆگەیەیە.

هیچ ئاسەوارێك لێرەدا بەدی ناکرێت ئەگەرچی گوندەکان کۆنیشن، محمودخانی سەرو ناسراوە بە هەلاجەکان و لە هۆزی ڕۆخزایین، هەرچی محمودخانی خواروشە ناسراوە بە گردی عەول، دانیشتوانی لە هۆزی تەرخانی و ڕۆخزایین، ئەم دوو ناوە هەلاجەکان لە پیشەی هەلاجییەوە هاتووە و گردی عەولیش لەسەر بەرزییەك عەول ناوێك یەکەم جار خانووی دروست کردووە بۆ ئەوەی ڕون بێت لەلای خەڵك ئەمانە وەچەی محمودخانییەکانی سەرەوەن کە باسمان کردووە.

ژێواری ئەم دوو گوندە لەسەر زەویە بەراوەکانی محمودخانی یە کە ئێستا بە موڵکیی بەشێکی گرێبەستی کشتوکاڵیەو بەشێکی هی بنەماڵەی حەمە نەجیمە کەلە سلێمانی دادەنیشن و بە ئیجار داویانە بە خەڵکی ئەم دوو گوندە، پێدەچێ بنەماڵەی حەمەنەجیم لە بنەماڵەی محمودخانییەکانی قەدیم بن.

ئیشەکەشم لەوێ تەواو بوو گەڕامەوە سەر ڕێگاکەو ماتۆڕەکەم

کەلەوێ بوو سواری بووم و بەرەو باشور بۆ (ئاوایی حەمە عەزیز) کەوتمە ڕێ لە ماڵی خەلیفە حەمە حسن لامدا کە ئاشنام بوو، خەڵکی ئەم گوندە لەهۆزی باوەیس ناسراون گوندەکە کەوتۆتە سەر جۆگەی مالوان هەموو پێویستیەکی ژیان و ژێواریان بۆئاو لەسەر جۆگای مالوانە، ئەگەرچی لە هەندێ ماڵیشدا بیر لێدراوە، سەرچاوەی ژیانیان ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێمەکاری و بەراوە ئەم گوندە گوندێکی تازەیە، فەرمانگەی کشتوکاڵ کە (بەناوی دوجەیلەکە دەناسرێت) لەم گوندەدایە و گوندەکە کەوتۆتە شوێنێکی تەختایی.

ئاسەوارێك لەم گوندەدا بەدی دەکرێت کەپێی دەووترێ (کۆردەرەی گەورە قەلا) کەبە زستان ئاوی پێدا دەڕوات بەتایبەت ڕۆژانی لافاو بەلام لە کەشە ووشکەکاندا یان هەرئاوی تێدانی یە یان یەکجار کەمە.

کۆردەرە بەواتای دەرەوەی گوند کە کوێراوە[1] کەلەوێش کارەکەم تەواو بوو ماڵئاوایم کرد و هەرلەوێش سەرمدا لە ماڵی کاك ئەحمەدی هاوەڵم کەلەسەرەوە باسمان کردووە لەماڵی ئەوان ڕیش سپی گوندی مالوان میوانیان بوو کەناوی ئەحمەد ڕەشیدی ڕەمەزان بوو ئیتر سێ ئەحمەد کەوتینە یەکو بەرەو مالوانی برایم کەریم و ڕەشید ڕەمەزان بەناو ڕێگا باریك و شەغەڵ و قوڕ و قوڕاوەکەدا کە بە پێنج کیلۆمەتر مەزەندە دەکرێ کەوتینە ڕێگا، هەڵبەت ماتۆڕەکەم لە دائیرەی زراعە بەجێهێشت، کەکەبەڕێگادا دەڕۆیشتین توشمان بوو بە مارێکەوە کاك ئەحمەدی هاوەڵم ووتی ئێمە چوار ئەحمەدین[2] بزانین کاممان دەتوانین ئەوماره بگرین، دیارە مارەکە ئەجەلی هاتبوو من

کردم بە کورتەناموسی و لەپڕدا وەك هەڵۆ پڕم دایە ناوقەدی مارەکە و پێش ئەوەی بیەڵم بجوڵێتەوە هەڵمدا بە ئاسماندا کە مارەکە کەوت یەکسەر مرداربووەوە بەپێکەنینەوە ووتم من لە هەرچوارمان ئازاتربووم، ئیتر ڕۆیشتین تا گەیشتینە گوندەکان سەرەتا چووینە ماڵی لالۆ برایمی کەریم قوباد کەپیش سپی مالوانی سەرووە دواتر چوینە ماڵی ئەو کاك ئەحمەدەی کەلەگەڵمانبوو (واتە ماڵی کاك ئەحمەدی ڕەشیدی ڕەمەزان ڕیش سپیی مالوانی خواروو) ئەم دوو گوندە تا ڕادەیەك تێکەڵ بەیەکن، دانیشتووەکانی لە هۆزی (گەلاڵی) ین کەسەرەوە پێیان دەووترێ گەلاڵی قوبادیەکان، خوارەوەش پێیان دەووترێ گەلاڵی پشدەریەکان.

ئەم دوو گوندە تازەن دەکەونە سەر لێواری شوێنێکی تەختایی ڕوباری تانجەرۆ، هیچ ئاسەوارێك لێرە بەدی ناکرێت، سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و ئاژەڵ و بەکارهێنانیان ڕوباری تانجەرۆیە هۆکاری ژێواریان بەشێکی بەرفراوانی زەویە بەراوەکانی مالوانە[٣] لە کوردەواریدا باوە هەچ شوێنێك بەپیت و بەرەکەت بێت دەڵێن ئەڵێی مالوانە کە دەیکەنە کشتوکاڵی بەراوی وەك (مەرەزە و لۆکە و گوڵە بەڕۆژە و توتن و کەمێکیش دانەوێڵە) هەروەها بە بەخێوکردنی ڕەشە ووڵاخەوە خەریکن کەهەمووی مانگای ڕەسەن و چاکە (مانگای مالوان) ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام دایکی کاك ئەحمەد تەونێکی بەدارەوە بوو (دایە ڕەعنا) ئافرەتێکی بەسالاچوو نەخوێنەواربوو کەچی مافورەکانی کەدەیچنین تەیرو تەواڵ و تەنانەت ناوی کوڕو شتەکانی کەبۆیان دەنوسی لەسەر تەونەکە دەیچنی، تا ڕادەیەك

یـەكێك لـە مـافورە نایابـە دەسـكردەكانی بـرا بـۆ پێـشانگای كـارە دەسكردەكان لە بەغداد لەلایـەن بەرپرسێكی زەراعـەوە كـەناوی فازیـل علـی بـوو بـە كەفالـەتی مـن مافورەكـەیان دایـە بـۆ پێشانگاكە بـردی و هێنایـەوە، دواتـر سـەرمدا لـە ماڵی ناسـیاوێكم كـە خێزانەكـەی خزمـی دایكم بوو ناسیاوەكەم ناوی حـاجی حەسـەن بـوو[٤]، كەلـەم گوندانـەش كارەكـەم تـەواو بـوو بـەرەو ڕۆژهـەڵات بـە چـەم و ڕێگـای زەبەنـد و قوڕوقوڕاودا نزیكـەی سـێ كیلۆمـەتر بـەرەو ئـاوایی تەپەكـەل ڕۆیـشتم ڕێگاكە زۆر نارەحەت بوو قوڕ و قوڕاو چەم و دڕوەڵان بـوو لێرەولـەوێ چەقەڵم دەبینی كە لەملاولامەوە ڕایان دەكرد.

كـە گەیـشتمە لێـواری گۆمێكـی تانجـەرۆ كـە قامیـشەڵان بـوو (باڵنـدەی قەڕەمیلـە) كەباڵندەیـەكی بۆربـاوە بـە قیرەقـیڕ دەخـوێنن، لەقەوارەی ڕیشۆڵەدان، لە نێوانی پەلە قەڕەمەكاندا هێلانـەیان كـردووە و هەرلـەناو قەڕەمەكانـدا مێروەكـان دەگـرن و دەیخـۆن و دەیـدەن بـە بەچـكەكانیان هەربۆیەشــە پێیــان دەووتــرێ قەڕەمیلــە، لــەناو گــۆم وقامیـشەڵانەكەدا زۆر پـارێزراون چـونكە نەدەسـتی منـاڵ نـە دەمـی چـەقەڵ و مـار و ئەوانـەیان پێـدەگات، كـەمێك ڕۆیـشتم تـا گەیـشتمە گوندەكە، چومە لای حاجی علی گـەلاڵی كـە ڕیـش سـپی گوندەكـەبوو، گوندەكە شەش حەوت ماڵ بوو كەهـەموو بـراو مـام و ئـامۆزا و كەسـی یەك بوون.

گوندەكــە كــەوتبوە نــاو دەروەڵانێــك لەســەر گردێكــی مــات كەلایـەكی كـەمێك كـەلبوو بۆیـە گوندەكـە بـە نـاوی تەپەكـەل نـاودەبرا، پێدەچێت گردەكە ئاسەواری بێت.

خەڵكی ئەم گوندە لەهۆزی گەلاڵین، جۆگەو بەرئاوی تایبەتی خۆیان هەیە كە دەیكەنە مەرەزە و لۆكە كە ئاو و زەویەكان بونەتە سەرچاوەی پێویستی ژیان و ژێواریان، بە بەخێوكردنی ڕانە مەڕیشەوە خەریكن لەو گوێ چەمەدا.

ئەم گوندە خۆی لە خۆیدا بەر گوڵی دەربەندیخان دەكەوێت لە نەخشەدا، بەڵام تا ئێستا گۆلەكە نەیگرتۆتەوە ئیتر نازانرێ داهاتوی چی دەبێت، لەوێش كارەكەم تەواوبوو بەهیلاكی و كولەمەرگی گەڕامەوە بەرەو ڕۆژئاوا بۆ ئاوایی حەمەعزیز كەلەسەرەوە باسمانكردووە.

ئەوەمان لەیاد نەچێت كە ئاوایی حەمەعزیز گوندێكی تازەیەو لەلایەن پیاوێكەوە (حەمەعزیز) ی هۆزی تەرخانی باوەیس لەسەر لێواری تەخاتاییەكی جۆگەی مالواندا دایمەزراندووە[٣٦].

ئیتر لێرەوە بەرو ڕۆژئاوا بەماتۆڕ بەرەو گوندەكانی یەخشی و داری قەلان كەوتمەڕێ، كەبەمەزەندەی كیلۆمەترونیوێك لەوێوە دووره، سەرەتا لوتت دەتەقێت بە نشێوییەكدا كەناو نشێویەكە حەوز و ئاو و زەلكاوێكە دەوری بە كۆمەڵێك دارە ڕەشی كۆنەساڵ دەورە دراوە كە مێژوویان ئەوەندە دوورە دەمەاودەم و پشتاوپشت دەیگێڕنەوە كە هەرهەبوون وەلەسەر ئەو دارانە هێلانەی قەلەڕەشكە و داڵ هەیە كەئەوانیش پشتاوپشت هەرهەبوون بۆیە بەم كانی و ئاوە و گوندەكە دەووترێ داری قەلان، ئەم ئاوە سەرچاوەی بەكارهێنانی خواردنەوە و ئیشی ماڵانی ئافرەتانی گوندی داری قەلان و یەخشی حاجی دارایە، هەندێك لەو نشێوی ئاوە سەردەكەوێتە سەر بەرزییەك

و دادەکشێت بە نشێویەکی تردا کە گوندی داری قەلانی گرتۆتە باوەش، لە ناوەڕاستی ئەم گوندەدا حەوز و ئاوێك کە پیاوان وەك شوێنی نوێژ بەکاری دەهێنن.

خەڵکی ئەم گوندە بەزۆری لە هۆزی تەرخانین ژێواری خەڵکی ئەم گوندە لەسەر ئاژەڵداری و بەروبوومە کشتوکاڵی یە دێمەکانی دەشتی باشووری گوندەکەیە چەند جوتیارێکیشیان لەبەر جۆگەی مالوان و یەخشی حاجی دارادا کشتوکاڵی بەراویشیان هەیە، ئەم گوندە یەکێکە لەهەرە گوندە کۆنەکانی ناوچەکە، ئەوەی ئاسەوارە تەنها کانی و دارەکانە کەباسمان کردووە، لەماڵی کاك شێخ صالح لامدابوو بۆ مەبەستەکەم دوای تەواوبوونی کارەکەم چوومە ئەوبەری جۆگەی یەخشی یەوە کەچەند سەد مەترێك لەوێوە دوورە و چوومە گوندی یەخشی حاجی دارا و چوومە ماڵی حسین حاجی سعید کە ناسیاوێکم بوو.

ئەم گوندە گوندێکی تازەیە و بە ناوی جۆگەی یەخشی یەوە ناونراوە، بنیادنەرەکەیشی حاجی دارا بووە بۆیە بۆتە یەخشی حاجی دارا، زەویە بەراو دێمەکانی بەگزایەی جافیان کڕیوە و لەسەری نیشتەجێ بوون کشتوکاڵی بەراو و دێمەکار و ئاژەڵداری هۆکاری ژێواری ئەم گوندەیە، ئاوی بەکارهێنانیان بۆماڵان لەکانی و زەلکاوی داری قەلانە کە باسمان کردووە، خەڵکی ئەم گوندە لەهۆزی تەرخانین، هیچ ئاسەوارێك لەم گوندە تازەیەدا نی یە، چەمی یەخشی کە ئاوێکی مامناوەندی یە لە گوندی یەخشی حەمەی ئەوڵقادرەوە کەلە دوو کیلۆمەتری ڕۆژئاواوە بەچەم و دۆڵێکدا یەتەخوارەوە و

زەویــە بــەراوەکانی یەخــشی حــاجی دارا ئاودێردەکــات، کەلــەویٚ کارەکـەم تـەواو بـوو پەڕیمـەوە بـۆ داری قـەلان و بەماتۆڕەکـەم بـەرەو یەخشی حەمەی ئەوڵقادر کەلە ڕۆژئاواوە دووکیلۆمەتر لەوێوە دوورە.



## گوندی یەخشی

ئـەم گونـدە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ زۆرکـۆن کـە حمـەی ئـەوڵقادر ناوێك شـان بەشـانی گونـدی زەڕایـەن ئـاوەدانی کردۆتـەوە، دانیـشتوانی ئـەم گونـدە لـە هـۆزی ڕۆخـزایین، بۆیـە پێـی دەووتـریٚ یەخشی چونکە چەم و ئاوەکەی لە دۆڵێکەوە سەرچاوە دەگریٚ کە بەزسـتان ئاوەکـەی ئێجگـار سـاردە، یـەخ (بـەواتای سـاردی و سـەهۆڵ بەندانە شیوەکەش کە لێوەی سەرچاوە دەگرێت بۆیـە ووتـراوە شـیوی

یەخ ئیتر بووە بە یەخشیو پاشان یەخشی ئەم گوندانەش بەو ناوەوە ناو نراون یەخشی)، سەرچاوەی ئاوی ئەم گوندە ئەو ساردداوەیە کەباسمان کرد سەرچاوەی ژێواری دانیشتوانەکەی لەسەر کێڵگە ووشکە دانەکانی زەڕایەن و یەخشی کە دەیکەنە دانەوێڵەو لەسەر لەوەڕگاکانیشی ئاژەڵداری دەکەن، ئەم گوندە پاڵی داوە بە بەری باشووری ئەو گردە سروشتیانەوە کە بەری باکوری دۆڵی زەڕایەنە لەم گوندەدا چاڵاوی پاکژکردنی ئاژەڵ بۆ لەناوبردنی مێروە زیان بەخشەکان بە ئاژەڵ هەیە کەپێی دەووترێت (حەوزی دەرماناو)، بۆ گەشتەکەم بۆ ئەم گوندە لە ماڵی کاك ئەحمەدی ئەمین لامدابوو کەکەسێکە لە وەچەی حمەی ئەوڵقایر.

ئاسەوار لەم گوندەدا ساردداوەکە کە بە کەلتورێك دەژمێرێت و قەبرسانە کۆنەکەی تەنشت قەبرسانە نوێیەکەی یەخشیش هەر کەلتورێکی ترە، ئاسەواری هەرە دیاریش لەم گوندەدا گردی یەخشی یە کەدەکەوێتە ڕۆژهەلاتی گوندەکە گردێکی بەرز و پانە هاوشێوەی گردی مالوانە کەلەسەرەوە باسمان کردووە تەنانەت دیاردەکانیشی هەمان دیاردەن، کەویستم بچم بۆسەر ئەو گردە لوتم تەقی بەلوتی جەباری حەمەی حاجی قادردا کە مامۆستایەك بوو خەڵکی گوندی کانی کەوە بوو، پێکەوە چوین بۆسەر گردەکە، لەسەر گردەکە بەشێك لە پانتایی شارەزوور دەردەکەوت، ئاسەواری قولفە گۆزە و پارچە گۆزە بەدی دەکرا کە هەڵبەت ئەم گردە لە بنەرەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گۆتییەکان، ئیتر لەگەڵ مامۆستا جەبار لێك بڕاین و ئەو بۆ گوندی خۆیان و منیش بەماتۆڕ بەرەو گوندی زەڕایەن ڕۆیشتم.

ئــەم گونـــدە گونـــدێکی زۆر گەورەیـــە یەکێکـــە لـــە گونـــدە هەرەکۆنـەکانی دەڤەرەکـە کەوتۆتـە دۆڵێـك لەبـەری بـاکوری گـردی یەخشی کەباسمان کردووە، بەناوەڕاستی ئەم گوندەدا جادەی عربت دەربەندیخان تێدەپەڕێت، لە دۆڵەکەدا بەری ڕۆژئاوای گوندەکە پاڵی داوە بە بەرزاییەکانی پیرمحمەدەوە بەری ڕۆژهەلاتیشی پاڵی داوە بە گردی یەخشی و گردی زەڕایەنەوە کە پێدەچێت ئاسەواریی بێت، لەم گونـدەدا دوکـان و چـایخانە و مزگـەوت و بنکـەی تەندروسـتی و فەرمانگـەی کـشتوکاڵی و قوتابخانـە هەیـە، دانیـشتوانی ئـەم گونـدە ئەگەرچی تێکەلاون بەلام بەگشتی لەهۆزی ڕۆخزاین، هۆی ژێواری ئەم گونـدە کـشتوکاڵی بـەرفراوانی دێمـەکار و بـەراوە کـە بـەزۆری گـەنم و توتنـە، هەندێکیشیان بە ئاژەڵداریـەوە خـەریکن، نـاوی ئـەم گوندە لـە زەڕئاینەوە هاتووە واتە پارە خۆشەویست، ئیتر بووە بـە زەڕایـەن، لـەم گونـــدەدا ئاســـەواری پیرمحمـــد کـــەکانی و کـــوڕە دارو مـــەزار و گۆڕستانێکی زۆر کۆنینەیـە کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی داگیرکاری عـەرەب کەدەکەوێتـە بەرزاییـەکانی ڕۆژئـاوای گوندەکـە، سەرچـاوەی ئـاوی ئـەم گونـدە کـانی و زەلکـاوێکی نێـوان بەرزاییـەکانی یەخـشی و گردی زەڕایەنە، هەروەها کانی و زەلکاوە گەرماوەکەی باکوری گـردی زەڕایەنــە کەئەمــەیان بــۆ کــشتوکاڵی بــەراو ســوودی لێــدەبینرێت، بۆســـەردانەکەم لـــە چـــایخانەی عمـــر لامـــدابوو دوای تـــەواو بوونـــی ویستەکەم سەردانی ماڵی هاوەڵێکم کرد بەناوی کاك ئەحمـەد ناسـراو بە (ئەحەی نەجە) ئەو شەوە لە ماڵی ئەوان مامەوە پاشان بە ماتۆڕ بە جادە قیرەکەدا بەرەو باکور نزیکی کیلۆمەترێك ڕۆیشتم بـەرەو گونـدی

کانی میل کە گوندێکی مامناوەندییە پاڵی داوە بە بەرزاییەکانی بەری باکوری زەڕایەنەوە، دانیشتوانی ئەم گوندە بەگشتی لە هۆزی ڕۆخزاین، کاروپیشەی دانیشتوانەکەی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێمەکارە لە زەویەکانی دسکەرەدا، سەرچاوەی ئاوی ئەم گوندە کانی و حەوزێکە لە دراوی دێ کە ناسراوە بە کانی میل ناوی گوندەکەش هەر لەوەوە هاتووە، لەسەر ئەم کانیە میلێکی منارە ئاسا هەبووە کە بەرزییەکەی نزیکەی ٢م بووە ئەستوریەکەشی نزیکەی ١م بووە کە پێدەچێت لە سەردەمی داگیرکاری عرب ئەو شوێنە وەك مزگەوت بەکار هاتبێت چونکە کەرەستەی ئەو میلە و شێوازەکەی وەك بە دەماودەم دەڵێن لەشێوەی منارەکەی خورماڵ بووە، بەدەماودەم دەڵێن ئاسەواری ئەم میلە کەمێك مابووە، پاشان سەردانی ماڵی بنەماڵەی ناسیاوێکی دێرینم کرد بەناوی کاك (حمە ئەمینی ئەحمەدی شاسوار) لە گەڕانەوەمدا مریشکێك کە لەگەڵ جوجەڵەکانیدا بوو لە ترسی ماتۆڕەکە بەڕومدا هەڵفڕی خەریك بوو وەربگەڕێم، ئافرەتێك بەڕومدا هەڵگشا بەڵام کوڕێك مەردانە ئەوەی ووت کە من هیچ خەتام نەبووە پاشان بە بڕێك پارە قایلمان کرد، ئیتر پێش ئەوەی خۆم ئامادە بکەم بەرەو گوندی بێدەن کەلە بناری گەورە قەڵایە دەبێت لەباشووری زەڕایەنەوە بە پیادەڕێ ڕەقەنەکەدا بۆی سەرکەوی بەرەو نزیکەی(٦ تا ٧)کم ئیتر گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

دوای ئەوەی کە دوو ڕۆژێك لە سلێمانی حەوامەوە دوایی بەنەقڵیاتی دەربەندیخان گەڕامەوە لەسەر ڕێگاکەی گوندی بێدەن دابەزیم کەدەکەوێتە نزیکەی دوو کیلۆمەتری باشووری گوندی

زەڕایەن لەسەر جادەی گشتی لەوێوە بەرەو ڕۆژئاوا بەپیادە ڕێگا ڕەقەنەکەی گوندی بێدەندا بەرەو ڕۆژئاوا کەوتمە ڕێ کە نزیکەی( ٥کم) ە، کاتەکەی بەهار کەمێك پیر بووبوو گوڵ و گژوگیای دەوروبەری ڕێگا گەورە بووبوو بنچکە کنگرەکان پەل و پۆیان کردبوو گەڵا دڕکاویەکانی و گۆپیتە دندانۆکەکانی بە دڕك داپۆشرابوون، سەری پەل و پۆکانیان گرتبوون، سەد مەترێك لەدووری ڕێگا باڵندە زەردیوەڵی یەکان کەلەقەوارەی پاساریەکدان باوکانەکانیان زەردەو دایکانەکانیان بۆرن، باوکانەکانیان بە دەنگێکی خۆش لەسەر تۆبزە کەرتەشیەکان دەخوێنن و دایکانەکانیش کوللەو مێرویان بە دەنوکەوەیە و دەیبەن بۆ بێچوەکانیان کە لەنێوانی پەلە کنگرەکانا هێلانەیەکی سەبەتە ئاسایە کەلە پوش و پەلاش دروست کرابوو زەڕنەقوتە لغاوە زەردەکانیان بەرەو ئاسمان بە زیکە زیك بەرز کربۆوە چاوەڕوانی خواردنیان دەکرد لە دایکیان.

کەمێك بەرەو ژوورتر بومەوە باڵندە شوان خەڵەتێنەکان کە ڕەنگیان بۆرە و لە قەوارەی (کۆترە باریکە) دان، ناوی خۆیان بە خۆیانەوەیە کەلە هێلانەکانیان نزیك دەبیتەوە دەتخەڵەتێنن و خۆیان دەکەن بە باڵشکاو لێرەو لەوێ پێشت دەکەون بۆئەوەی تۆ بە دوایدا بڕۆیت و هێلانەکەی بەجێبهێڵی بەو چەشنە بێچوەکانیان کەلە بنچکەکاندا لە هێلانەدان لە مەترسی ڕزگار دەکەن نهێنی ئەم سروشتە لەوەش گەورەتر بەدی دەکرێت کە ئەمە سووننەتی حەیاتی گیانەوەرانە، دوو قۆلانچە بەدی دەکەی کە بەقەد پانی دینارێکی ئاسن ڕیخی ئاژەڵیان پان کردۆتەوە و دایکانەکە کەمێك گەورە ترە لە

باوکانەکـە، هێلکـەکان دەکاتــە ســەر ڕیخەکـە دوایــی پــان کراوەکـە خردەکەن و لەبەر هەتاوەکە لە ڕەشی دا بریسکەیان دێت پاڵ بە ڕیخە خڕکراوەکەوە دەنێن تا ڕەق دەبێ و لە بنەخڕنوکێکدا دەیخەنە چاڵ و بەجێی دێڵن، هەڵبەت پاش بەینێك گەراکان دەتروکێن و ووردە ووردە ڕیخـە خڕکراوەکـە بـە ئیفرازاتەکانیـەوە نـەرم دەکەنـەوە و دەیخـۆن تـا گـەورە دەبـن و دێنـە دەرەوە و ئـەوانیش دەچـنە سروشـتی ڕابـردووی خۆیـان کـەمێکی تـر دەڕۆی لەمبەروبـەری ڕێگاکـەوە شـارە مێرولـەکان پانتاییەکیان تـەخت کـردووە و وەك خەرمانـە شـارەکەیان لـە ژێریدایـە بە چواردەوریدا چەند ڕێگەیەکی پانی دوو سانتی مـەتری دەبینـی کـە بەرەو کێڵگەکان دەڕۆن بە دووسایتدا گروپێك دەڕۆن بۆنـاو کێڵگـەکان و گـــروپێکیش دانەوێڵـــەیان بەشـــانەوەیە و بـــەرەو شـــارەکەیان دەگەڕێنــەوە ئەگــەر ســەیری دەوروبــەری شــارەکە بکــەی پێــستی دانەوێڵـەو پێـستی گـەراو پاشـەڕۆ ووردوورد کـراوە و لـە چواردەوری شارەکە بەدیدەکرێ کەئەمە پیتێکی زۆر دەدات بە زەوی.

ڕێگاکـە دوورە و هەڵبەتـە کـەمێکیش دنیـا گەرمـە بـەلام مـرۆڤ ئەوەندە ئەم سروشتی کردگارە دەبینـێ هەست بـە هیلاکـی ناکـات کـە دەگەیتە گا بەردەکان کە لە زەویدا چەقیون باڵندەی بازۆڕییەکان کەلـە قـەوارەی پاسـاریدان نـاوی خۆیـان بـە خۆیانەوەیـە و بـازوون مانـای (ڕەش وسـپی) کونێـك لـە ژێـر گاشـە بەردەکاندایـە و هێلانـەکانیان لـە قولایی ئەو کونەدایە بێباکانە دێن و دەچن، چونکە دەستی هیچیان پێناگات، کەلە شاخ نزیك دەبیتەوە باڵندەکانی خوومەکەوەلا کە ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی و ڕەنگیـان شین و سـەوز دەنوێنـێ بە قیژە قیژ

دێـن و دەچـن قـەوارەیان بەقـەد کۆترێکـە و زۆر دەچـوێنە توتـی، کـە دەگەیتـە بنـار دۆڵکـەی ئەوبـەرت هێـشتا ئـاوی زسـتاناوی تیـا مـاوە بـەخوڕ بـەرەو پـێ دەشـتەکان دەڕوات کـە دیمـەنێکی زۆر جـوان و دەنگێکـی زۆر خـۆش تێکـەڵ بـە کـسپەی دەوەنـە کێویلـەکان دەبێـت بەمپێیـە ئـەو سروشـتە دڵ گیرە بەجێی هێشتم، یـان زیـاتر بڵێین من ئەوانم بەجێهێشت، گەیشتمە گوندەکە گوندێکی مامناوەندییە لەکەم و زۆریدا پاڵی داوە بە چیای گەورە قەڵاوە لەبەرزیـدا حـەوز و ئاوێکـی فراوانی سارد و سازگاری بەو بەرزییـەوە هەڵکەوتووە جیاکراوەتـەوە بەدوو بەش، بەشێکی بۆ کاروباری ژنـان و بەشێکیشی بۆ پیـاوان بۆ مزگەوتە پڕپوتەکەی گوند، دانیشتوانی ئەم گوندە لـەهۆزی ڕۆخـزاین، ژێـواری خـەڵکی ئـەم گونـدە بـەزۆری ئاژەڵدارییـەو لـە دێمـەکارە پێدەشتەکانیشدا دانەوێڵە دەکەن، ئاسەوار لـەم گونـدەدا دۆڵـی بێـدەن و پیرە ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی بێدەنـە کـە بـە دۆڵ و دەربەندەکـەدا بـەلاڕێ لاپاڵـە تەسـکەکەدا بـەرەو ڕۆژئـاوا چـەند سـەد مـەترێك بـەرەو ژوور دەبیتەوە دەگەیتە نزیکەی کۆتـایی دەربەندەکە لەوێـدا دەگەیتـە سـەر گۆڕەپـانێکی نزیکـەی پێنـج سـەد مـەتر دووجـا کـە دەکەوێتـە بـەردەمی ئەشـکەوتەکەوە لـەڕوی باشـوور، وە دەکەوێتـە سـەر ڕۆخـی دۆڵ و ئاوەکـە لـەڕووی بـاکورەوە ئـەو دۆڵـە سەرچـاوەی ئـەو ئـاوە زستانییەی کە پیشتر باسمـان کـردووە، سـەیری بەرامبـەرت بکـەی لـە تەنیـشتی ئەشـکەوتەکەوە تاوێرەکـانی بێـدەن نزیکـەی سـەد مەترێك لەزەوییەوە بەشاخەکەدا هـەڵزناون بـە پـانی دوو سـەد مـەترێك، لێرەو لـەوێ بـە تاوێرەکـەدا دەوەنـە قـەزوان و هـەنجیرە کێویلـە بـە درزەکانـدا

شۆڕبونەتەوە، کونی بچوك بچوك بەدی دەکرێت لەبەرزی کە پێدەچێت هێلانەی قاژووە کێویلەکانبن، هەڵبەت قاژوو ڕەنگیان ڕەشە بەڵام ئەم قاژووە کێویلانە بۆرن بە قاژەقاژ دێن و دەچن تاوێرەکان دەنگەکانیان بە زوڵاڵی دەنگ دەدەنەوە لە درزی دەوەنەکانیشەوە هێلانە قولتەکان کەلەخوری و بنێشتەتاڵ دروست کراون بەو بەرزیەوە قوڵتەقوڵت دەکەن ناوی ئەم باڵندیە لە دوو شتەوە هاتووە، یەکەمیان بە قوڵتەقوڵت دەخوێنن، دووەمیان کلکیان نیە کەلە کوردەواریدا پێی دەڵێن قوڵتە، ئەم باڵندەیە جۆرێکە لە باڵندە دار کونکەرەکان، خۆراکی ئەمانە مێرووی ناو دار و بنێشتەتاڵە زۆر بە خێرایی لە تاوێرەکانەوە خۆیان هەڵدەدەن و باڵیان دەنوقێنن ئەوەندەی یەك و دوو لەچەند کیلۆمەتری ئەوبەردا دەخوێنن، ئەمانە بۆرن و لەقەبارەدا لە ڕیشۆڵە گەورەترن، لەبن تاوێرەکانیشدا هێلانەی سوچەر و چالەکەکان بەدی دەکرێت کەلەبەر پاراستنی بێچوەکانیان دەرگای هێلانەکانیان گرتووە بەشەو دێنە دەرەوە، لە کەوەلەکانی لاپاڵی دۆڵەکاندا بنچکە گەوەن بەدی دەکەی کە گەڵا و دارەکەی بۆرە و کەمێك دڕکاوییە، ڕەنگەکانیان رایزومیە کە دەڵێن لە زودا بەکارهاتووە لەگەڵ بەرە خڕنوکەدا لەباتی صابون، ئەگەر بە دۆڵەکەدا سەرکەوین بەرەو لوتکەی چیا حەوز و گۆڕستانێکی کۆنینە و کۆرەدارێك بەدی دەکەین کەئەمە شوێنێك بووە وەك نیمچە قەڵایەك لەلایەن پیاوێکی زۆرلاوازەوە کە زۆر بەجەرگ بووە بەناوی پاشا (چرچە) کەهەتا ئێستاش گوندێك لە باشووری ئەو چیایەوە بەناوی چرچە قەڵاوە ناودەبرێت کە کاتی خۆی شوێنی نیشتەجێی چرچە

بووه، ئەو حەوزو کانیە ناوی حەوزی گەورە قەلاَ بوە، هەڵبەت لە ئەشکەوتی بێدەنیش کە ئەگەر بچینە سەربانی ئەشکەوتەکە شوێنێك بەدی دەکرێت وەك شوێنێکی سەربازی ناوچەکە بوبێت لەژێر قەڵەم ڕەوی پاشا چرچەدا، بەردەمی ئەشکەوتەکە وەك لە سەرەوە باسمان کردوە گۆڕەپانێکە کەئەوەی پێوەدیارە کە بەدەست تەخت کراوە بۆ شوێنی حەوانەوە و مەشقی سەربازی بە گوێرەی مێژوو نارامسینەکان لە دەربەند فەقرە و دەربەندی بێدەنەوە هاتونەتە شارەزوور کە دەربەندی فەقرە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای بێدەنەوە نزیکەی بە پانزە کیلۆمەترێك لە هێرشەکانی گۆتییەکاندا بۆسەر نارامسینەکان لە دەربەندی بێدەنەوە (شارکاڵی) کوڕی نارامسینیان ڕاوناوە لە مێژووی نوێشدا وەك دەڵێن ئیسلام عرب هەرلەهەمان ڕێچکەی نارامسینەکان هاتونەتە شارەزوور و ئەم سەردەمە پاشای چرچە کە لەسەر ئاییني زەردەشت بووە تێکشکاوە لەپاش بەرگریەکی زۆر. لەهەردوو دەربەندی ناوبراودا گۆڕستانە کۆنینەکان و کۆڕەدارەکانی گەورە قەلاَ لە بێدەن و پیرداود لە دەربەند فەقرە گەواهی ئەو بەرگریە دەدەن.

بێینەوە ئەشکەوتی بێدەن کە ئەم ئەشکەوتە پانی دەرگاکەی نزیکەی دە مەتر دەبێت، بەرزییەکەی نزیکەی پانزە مەتر دەبێت، قوڵی یەکەی لە پەنجا مەتر زیاترە لە دەرگاکەوە تا دەچینە بنی ئەشکەوتەکە وورده وورده ئەشکەوتەکە باریك دەبێتەوە و ناوەکەی تا بەرەو قولایی بڕوات بەرەبەرە بەرزتر دەبێتەوە لە بنی بنەوە لەشوێنێکدا لەلای ڕاستی بدەی تەپەی دێت بەلاّم لەلای چەپی

زرنگەی دێت، کە بە دەماودەم دەڵێن ئەم ئەشکەوتە بەلای چەپیدا زۆر قوڵتر دەڕوات بۆ ناو شاخەکە، بەڵام پێدەچێت ئەو تاوێرە خزابێتە بەردەم دەرگاکەی ئەوبەر و ناو ئەشکەوتەکە پێدەچێت کە ئەو دوژمنانەی کە لەسەرەوە ناویان هاتووە پڕیان کردبێتەوە، چونکە خۆڵەکەی ناوی زۆر شی یە و ئەو بەردانەی کە تیایەتی جێگیرنین.

ڕاستە مێژوو خول دەخواتەوە ئەم ئەشکەوتە لەشەستەکانی سەدەی بیست بارەگاو بنکەی لقی بێدەن و ئیدارەی ڕێخستنەکانی وارماوابوو هەرچۆن لە مێژوودا بارەگا بووە وەك لەسەرەوە باسمان کردووە، بەندە وەك پێشمەرگەیەکی بەشی ڕێکخستن لەگەڵ پێشمەرگەیەك بەناوی عەریف برایم مامۆستای مەشقی پێشمەرگەکان بوو، داوامان لەسەروی خۆمان کرد کە ئەو پێشمەرگانەی لەپشوودان و بە هاریکاری لاوانی گوندەکان ناو ئەشکەوتەکە تەخت و ڕێك کەینەوە، ئەوەبوو داواکەمان وەرگیراو دەست بەکار بووین ناو ئەشکەوتەکەمان کرد بە سێ بەشەوە وەك پلیکانە یان وەك تەلان سێ ژورمان لێ دروست کرد و ئیتر شوێنی حەوانەوەی زۆر خۆش و ئاسان بوو، ئەوەی شایەنی باسە هەر تەلانەی بە چەند پلیکانەیەك بۆی سەردەکەوتی زیاد لە مەترێك، ئەمە یادەوەریەکی لەمەو پێشی پێشمەرگایەتیمە کەلەم گەشتەدا لەم چەند دێڕەدا بەسەرم کردەوە تا نوسینی ئەم چەند دێڕەش ئاسەواری ئەو چاککردن و ڕێکخستنەی پێوە دیارە وەك یادگارێکی ئەوکاتەی پێشمەرگایەتیم .ئیتر بزانین قەدەر چی بەسەر ئەم ئەشکەوتەو ئەم بارودۆخە بەچاك یان خراپ دێنێت، ئەوە ماوە بڵێین ناوی بێدەن لە چی یەوە هاتووە، بێدەن واتە

بێدەنگ، چونکە هەموو تاوێرو ئەشکەوتەکان بە دەنگێك زۆر دەنگ دەدەنەوە بەڵام ئێرە دەنگ دانەوەی کەمە، هەروەها ئەم گوندە کەوتۆتە شوێنێکی بێدەنگ و چەپەوە بۆیە بە بێدەن ناودەبرێت،

تێبینی: لە گەشتەکەمدا ئەم دابونەریتانەی لای خوارەوەم لە چەند گوندێکدا بەدی کرد:

١. لە گوندی کانی کەوەی کۆن، رۆژێك شایی و زەماوەندێکی زۆر قەشەنگم بینی کە بە شمشاڵ و گۆرانی و رەش بەڵەك، سێ چێن دەست گیرابوو، کچ و کوڕی گوندەکەو گوندەکانی دەوروبەر بە جل و بەرگی ئاڵ و واڵاو هەندێك کەمەرەو هەیاسەو نەریتی کوردەواری بە کچەکانەوە دەبینرا، کورەکانیش جل و بەرگی کوردی رەسەن و هەندێکیان خەنجەر و دەمانچەو بە قەدیانەوە دەبینرا، پیاو ماقوڵانی گوند و ئافرەتە سەرەکان خەریکی خزمەت گوزاری بوون، سێ ڕیزە دەوار هەڵدرابوو، لەناو دەوارەکاندا راخەرو سەرین دانرابوو میوانی گوندەکانی دەوروبەر بەریز دانیشتبون، لە یاڵەکەی بەرامبەردا نیشانەیان نابۆوە، لەبەر ماڵی زاوادا مەنجەڵی گەورە گەورە شلەو پلاو و گۆشت لەسەر ئاگر بوو، لەو کاتەی بوکیان دەهێنا لە گوندێکی ترەوە بە سواری ئەسپ لەدوای کەژاوەی بوکەکەوە غارغارێن و تەقە دەکرا. پیاوێك جڵەوی ئەسپەکەی بوکی رادەکێشا پێیان دەوت برا زاوا، ژنێکی بە ئەزمون بە سواری ئەسپێکەوە لە تەنیشتی بوکەوە دەرۆیشت و کولیچەی دابەش دەکرد بەسەر سوارەکاندا، جل و بەرگێکی قەشەنگی لەبەردابوو، پوشینێکی ئاوریشمی گەورەی

بەسەرەوە بوو پێیان دەوت پیَ خەسوو، ئا لەو کاتەدا یەکێك لە سوارەکان بە کلاشینکۆفێکەوە تەقەی دەکرد تفەنگەکەی بەرەو خوار بۆوە خەریك بوو بەر سەری ئەسپەکەی بکەویَ و خەریك بوو ریزێکیش بەناو خەڵکەکەدا بکات بەلاَم ئەژنۆی ئەسپەکەی کەوتە زەوی و کۆنترۆڵی خۆی کردوو هەموو گوللەکانی نا بە زەوی بەردەمی خۆیەوەبەلاَم زەرد هەڵگەڕاو بیَ تاقەت بوو لە شەرما و لە ترسی ئەوەی کەسێکی پێکابیَ، بۆیە دایان گرت و دڵخۆشیان دایەوە، شایی و زەماوەندەکە گەرم بۆوە، بوك گەیشتەوە بەر ماڵی زاوا، زاوا لەسەر بەرزیەکەوە بە قامیشێك دەیکێشا بە سەری بوکەکەدا بە هێواشی کەسوکاریان نوقلَ و پارەی وردەیان هەڵدەدا بەسەریاندا بۆ منداڵاَن، شاییەکی زۆر قەشەنگ بوو لە ژیانمدا یەك جاری تر بە منداڵی شاییەکی تری وا قەشەنگم بینی بوو لە گوندی بێستانسور کە (عومەری فەقیَ علی) کچە شێخێکی ووجاخ زادەی خواستبوو.

٢. لە گوندی کانی کەوەی چووخ رۆژێك لەویَ بووم ئافرەتێکی وجاخ زادە کۆچی دوایی کردبوو، خەڵکی گوندەکەو دەوروبەریش لە ناسیاو و خزمان کۆبوبونەوە، پیاوان بانگیان هەڵدەدا بە گریانەوە، ئافرەتانیش بەدەم لاواندنەوەوە قوڕیان دابوو بەسەرو مێزەرەکانیانەوە، کاروباری جەنازەکەیان ڕێکدەخست بە دابونەریتێکی کوردەواریانە کە گەیشتە ئەوەی بیبەن بۆ سەر قەبران، پیاوی دەوروبەرو لەگەڵ هەندیَ ئافرەتی نزیك بە مردوەکە بە سواری ولاَخ بە پیادە جەنازەکەیان بەسەر شانەوە گرتبوو، هەڵیان گرت و بردیان، پرسیم: بۆ کویَ ی دەبەن؟ ووتیان: بۆ گوندی ئەحمەد بڕنە

که گوندێکه دەکەوێته دیوی باشوری چیای بەردی گلان کە باسمان کردوە، کانی کەوە لە روی باکورەوە بەرەو ئەویٚ زیاد لە ٢٥ کیلۆمەتر جگە لەوەی کە بە چیاکەدا ڕێگاکە هەڵدەزنا تا دەچویتە ئەودیو لەویٚ مەزارێکی لێبوو مەزاری ئیمام ئەحمەد مردووە ناودارەکانی گوندەکانی ئەو دەوروبەرە بۆ گۆڕستانی ئەو مەزارە دەبرا، منیش کە چوبوم لە گەڵیان لە ناو مەزارەکەدا سیٚ بەردم بینی کە بەبیٚ هیچ جیاوازیەك لە هەموو رویەکەوە سیٚ کاڵەك بوون، پرسیم ئەمە چی یە؟ لەوەلاٚمدا بیستم کە کاتی خۆی زیوانی ئەو مەزارە لە تەنیشتی گۆرستانەکەوەبێستانێکی کاڵکی هەبوە، شەوان بەجیٚ ی هێشتوە بە بیٚ باکی داویەتیە دەست مەزارەکە بە ووتەی ئەوانەی کە بیستم لێیان، شەو لە ناوێك کابرایەکی فەقیر حاڵ ووتویەتی فرسەتە ئەو بێستانە کەسی بە دیارەوە نیە دەچم بارێك کاڵەکی لیٚ دەبەم و دەیفرۆشم، کە لە کاڵەك رنین لێدەبێتەوە دەیەوێت لە گویٚ درێژەکەی بار بکات دەستی گویٚ درێژەکەی وشك دەبێت و قاچی خۆشی وشك دەبێت ئیتر پاڵ دەدات بە بارە کاڵەکەکەوە خۆی دەداتە دەست قەدەر، ئەو سیٚ کاڵەکەی کە دایناوە بە جیا بیباتەوە بۆ منداڵەکانی دەبێتە بەرد.بەیانی کە خاوەنی بێستان کارەساتەکە دەبینێت تێدەگات ئیتر کاڵەکە بەردینەکان دەخاتە مەزارەکەوە و دوو رکات نوێژ دەکات و لە خوا دەپارێتەوە کە کابرا و گویٚ درێژەکەی چاك ببنەوە و کاڵکەکەی بۆ بار دەکاو بەڕیٚ ی دەکات.

٣. رۆژێك لە گوندی ( محمود خانی) چومە ناو کۆڕی زیکرێکی دەروێشانی (تەریقەتی شێخی سۆڵە) کە دێوانە عەباس ناوێك

پیاوێکی دێوانەو شپرزە بوو، زۆر بە قولاّیی بە یەقیندا ڕۆچوبوو شمشێرێك و دەستەسرێکی سوری گەورەی لە ملدا بووئەم دێوانەیە لە کاروباری موریدەکاندا دەسەلاّتی شێخی هەبوو هەرچی بیویستایەدەیکردو دەیوت، لە ناو دەروێش و موریدەکانیدا، دەرۆیشەکان بە تەپلْ و دەف زکری جۆراوجۆریان دەکرد، دەروێشێکی گەنجباوم بینی بەردی بەقەدەر گوێزێکی قوت دەدابەڕوی دەروێشەکانی هاوڕێیدا دەیهاویشت و راوی دەنان، یەکێکی ترم بینی تەزبیحێکی قوت دەداو دەری دەهێنایەوە بە ساغی. دوو دەروێشم بینی ژن و پیاوێکی بە تەمەن بە دەم حالّچ لێهاتنەوە بە کوتەکە سورەکانی دەستیانەوە شەڕە شیریان دەکردو سەرنجی خەلْکیان ڕادەکێشا.مامۆستای گوندی حەمە عزیز لەویّ بوو پێکەوە کوڕەکەمان بەجیّ هێشت مامۆستاکە دەستی مۆسیقای هەبوو پێی ووتم کە ئەو تەپلْ و دەفە ئەوان زۆر بە هونەرێکی مۆیسقی دەیژەنن، لەسەر زانستی خۆی کە من هیچم لیّ نەدەزانی ئەو ووتی ئەوە بە نۆتەی موسیقیی لێیدەدەن.

٤. ڕۆژێك هەر لە کانی کەوەی کۆن لەگەلْ کوڕێکی گەنج هاوتەمەنی ئەو سەردەمەی خۆم دا کە خوێندەوار بوو، هاوڕێیەتیەکی کاتیمان پێك هێنا ئەویش ناوی ئەحمەد بوو پێی ووتم حەز دەکەم بچینە مالّی خۆمان لای باوکم کە پیاوێکی پیرە ناوی ( حاجی عزیز گەلاّلّی) چایەك دەخۆین، کە باسی پیرە باوکەکەی کرد زۆر حەزم کرد چونکە دەمزانی هەندێك زانیاری کۆن و فۆلکلۆری لیّ وەردەگرم، کە چومە خزمەتی بە شێوە زارەکی گەلاّلّەییانە دەئاخاوت وەك بلّێین

دەیوت ( لە کۆرە را تەشریفت هاورد)؟ کەوتمە پرسیار لە مام حاجی بۆ بیستنی هەر شتێك کە بیزانێت، لە وەلاّمدا بە شێوە زاری خۆی فەرمووی: من گەنج بوم کە باوکم چوو بوو بۆ حەج ناوی (حاجی ئەمین گەلاڵی) بوو ماوەیەکی زۆر دیار نەما چونکە ئەو کاتە خەڵك بۆ حەج بە کاروان دەچوو، لەوە بوو دەستی لێ بشۆین لەناکاو گەڕایەوە جوتێ سۆلی سوری ئەو عەرەبستانەی لە پێدابوو جبەو عەبایەکی عەرەبی بەشانەوە بوو پێی وتین کە لە حەج خەوی بینیوە کە دەبێتە (حەکیمێکی میلی) لە کارێکی دروستیشدا گیانی دەبەخشێت، بۆیە دەستی کرد بە گرتنەوەی هەموو شێوەکانی شکانی ئێسقان لەهەموو جەستەی مرۆڤ و ئاژەڵدا، بۆ نمونە جارێك ئافرەتێك لە پەیژە کەوتبوە خوارەوە سمتی دەرچووبوو کە ئەو کاتە زۆر عار بوو کەس بچێت بە دەوری ئافرەتدا، ئافرەتەکە پەکی کەوتبوو، کە حاجی بیستی وتی هەرچۆنێك بێت بیگەیەننە دەستم کە هێنایان وتی ئەسپێك سێ شەو و سێ رۆژ لەبەر هەتاو راگرن و بیبەستنەوە و چاوی ببەستن، ئەو کارەیان کرد، لەپاش سێ رۆژەکە هەرچۆنێك بوو ئافرەتەکەیان لە ئەسپە تینو برسیەکە سوار کرد، هەرچەند قاوقیژی کرد هەردوو قاچیان لەژێر سکی ئەسپەکەوە بەست بەیەکەوە، لە سەریشەوە قایم بە ئەسپەکەوە بەستیان، ئیتر ووتی دوو تەشتی زۆر گەورە یەکێکیان ئالف و یەکێکیان ئاو لە دوری گوریسێك لەبەردەم ئەسپەکەوە دابنێن و لەپڕ ئەسپەکە بەر بدەن و چاوی بکەنەوە، لەخۆشی ئاو و ئالیکەکە پەلامار دەدات، ئەوجا دەبینن چی رودەدات، کە ئەسپەکە هەموو ئاوەکەی هەڵ لوشی سکی بەر بوەوە ئینجا پەلاماری ئالیکەکەی دا

سمتی ژنەکە رەویەوە و بەقەد بەردێك بدەی بە بەردێکدا تەقەی بێت ئاوا سمتی تەقی ئیتر ووتی لێی گەڕێن تا تۆزێك ئارەق دەکاو بە هێواشی دایگرن با لێرە دوو رۆژ ئیسراحەت بکات دوایی بە پێی خۆی دەگەڕێتەوە، چۆنی ووتبوو وا دەرچوبوو.

جارێکیش ئەسپێکی زۆر رەسەنی کابرایەکی ناودار لە غاردا کەوتبوو سمتی دەرچوبوو کابراکە ئەسپەکەی زۆر خۆشدەویست بەلاّم نەیدەزانی چی لێبکا، حاجی ئەمین کە دەبیستێت ئەڵێ بیگەیەننە دەستم، کە دەیهێنن ئەڵێ پێ خوێیەك قوری گەورەم بە ماوەی شەو و رۆژێك بۆ بشێلن، کە ئەوە دەکەن دەڵێ ئەسپەکەم بۆ راگرن و چاوی ببەستن و قایم بۆم بگرن نەجولێت، بە بەرزی دوو باڵ و پانی دوو باڵ بە چوارگۆشەیی یان هەر چۆنێك بێت بە چواردەوری ئەسپەکە چین بنێن ئیتر دوو رۆژ ئالیك و ئاوی لێ بگرنەوە لەبەر هەتاو لەناو قورەکەدا، پاشان لە دوری سێ گوریس لەبەردەمی ئەسپەکەدا ئالیك و ئاو دابنێن و لە پڕ بەری بدەن و چاوی بکەنەوە، لە تونێتی و گەرماو برسێتیدا خۆی رادەپسکێنێت بچێت بۆ ئاوەکە بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە سمتی دەرچوە لەپڕ خۆی لە قورە خەستەکە رادەپسکێنێ پەلاماری ئالیك و ئاوەکە دەدات، بەم خۆراپسکانی سمتی بەقەد دوو بەردی گەورە بدەی بەیکدا تەقی و سمتی چۆیەوە شوێنی خۆی، دوای پێی وتین لەبەر سێبەرێك جاجمێکی گەورەی پیا بدەن بۆ ئەوەی مێش و مەگەز پێوەی نەنیشێت و قاچ بدات بە ئەرزدا. هەتا دوو رۆژ ئەسپەکە ئیسراحەتی کرد و بە پێی خۆی بردیانەوە. ئەمە نمونەیەك بوو لە چەندان نمونەی لەو جۆرە لە حەکیمیەوە،

لەروی کارە خێرەکەیشەوە، لە جەنگی جیهانی یەکەم روس هاتونەتە ناوچەی پێنجوین کاری زۆر قێزەونیان بەرامبەر بە خەڵکی بێ دەسەلآتی کورد ئەنجام دەدا، بۆیە خەڵکیش کەوتونەتە جەنگ لەگەڵیاندا کە پێیان ووتوە غەزای روس، حاجی ئەمین سەرکردەی هۆزەکەی خۆی کردوە، لەو جەنگەدا شەهید بوە، خەوەکانی هاتەدی، ئێستاش گۆڕەکەی لە ناوچەی شلێرو ناوخوان کە تا ئەم دواییەش ئەناسرایەوە.

❊❊❊

# بەستی نۆیەم

## ناوچەی تانجەرۆ لەڕووی مێژووییەوە

### لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی دەربارە بە شارەزوور و ناوچەی تانجەرۆ و عەربەت

پێشەکی:

لەبەر گرنگی ناوچەکە، لەڕووی مێژووی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی یەوە بە پێویستم زانی کورتەباسێکی لەسەر بنوسم، بۆئەم مەبەستەش گشت دێهات و شوێنەوار و ڕێگاکان و چەم و ئاوەکانی ناوچەکە گەڕام.

لەڕووی جوگرافی و داب و نەریت ..کەبۆ بابەتەکە بشێ کۆمکردەوە و داواشم لە کەسانی شارەزاکرد لەم بوارەدا چی دەزانن یاریدەم بدەن، وە لە پرسیار لە پیرەکان و شتەدەماودەمەکان زۆرم کۆکردەوە، دوایش کەوتمە پشکنینی نوسراوەکان کە لەسەر شارەزوور و ناوچەی تانجەرۆ بوون، چیم توانی وەرم گرت و کردمە سەرچاوە بۆ باسەکە.ناوچەی شارەزوور بەگشتی و ناوچەی تانجەرۆ بەتایبەتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا تیشکێکی دەخەمەسەر:

١. پێناسەی ناوچەکە لەڕووی مێژووییەوە: ناوچەی (عەربەت)، (تانجەرۆ) لەناوچەکانی دەڤەری شارەزوور سەربە قەزای مەرکەزە لەپارێزگای سلێمانی، ناوچەی (عەربەت) (ناحیە) بەناوچەی (تانجەرۆ) ناسراوە بەو سۆرخەوە کە روبارۆچکەی تانجەرۆ بەناوەڕاستی ناوچەکەدا کشاوە، ئەم ناوچانە لە دێرزەمانەوە جێگای دیاریان هەبووە لە ئاستی مێژوودا، لەڕووی شارستانیەوە لە دەڤەری شارەزووردا، وە شارەزوور بەگشتی هەر لەسەردەمی (لۆلۆ) یەکانەوە بگرە، نیشتەجێی فەرمانڕەوایی (زاموا) بووە هەتا دەگاتە ئەو سەردەمەی کە ناوچەی (نامرۆ) ناودەبرا، وەهەتا دامەزراندنی فەرمانڕەوایی شارەزوور و هەتا سەردەمی حکومڕانی ئیماراتەکانی

[٣٧] ئەم ناوچەیە هەردەم خاوەنی دەسەڵاتی خۆی بووە هەتا دوای شەڕی (چاڵدێران) و پەیمانی (سعد اباد). هەر بەسەربەستی و بوونی گیـانی سـەربەخۆیی پاراسـتووە، لـەوەش بـەدواوە ناوچـەکە بەسەربەرزی ژیاوە و مل کەچی قبوڵ نەکردووە.

٢. ناوچەی (شارەزوور) و (تانجەرۆ) لەڕوی مێژوویی یەوە:
کاتێک کە شارەزوور وەك دەوڵەتێك فەرمانڕەوا بووە لەسەردەمی گۆتی و لۆلۆییەکان دا بەناوی دەوڵەتی (زاموا) پایتەختی ئەم فەرمانڕەوایی یە لەوگردەدا نیشتەجێ بووە کە ئێستا پێی ئەڵێن (یاسین تەپە) یەکەم پاشای (زاموا) ناوی (ئەتیلا) بووە، ئەم گردە دەکەوێتە سەر ڕۆخی روبارۆچکەی تانجەرۆ لەلای گوندی (خاك و خۆڵ) ەوە کەلەباشوری گوندی (بێستان سوور) ەوەیە.

أ. پێدەچێ کاتی خۆی گردی یاسین تەپە ناوی (ساموا) بوبێ کە ناوێك بووە لە ناوەکانی شارەزووری کۆن، زۆرجار بەر هێرشی دوژمنان و داگیرکەران کەوتووە، دووجار (نارامسین) و کوڕەکەی کەناوی (شار گشتی شار) بوە و بەناوی کوردەوە ناوی نابوو واتە (پاشای پاشایان) ئەم ناوچەیان وێران کردووە (سندۆر) (سنۆفی) کەپاشای ناوچەکەبوو کوشتویانە، ئاشوریەکانیش چەندجار کاولیان کـردووە، هەروەهـا ئەسکەنـدەری گـەورە، تـورکە ئەتـابەگی (ئـۆزبەگی) یەکان، ئێرانیەکان، مەغۆلەکان،خەواریجەکان تورکە بیزەنتیەکان، قزڵباشی عوسمانیەکان چەندین جار پەلاماریان داوە و کاولیان کردووە، عوسمانیەکان ناوی ئەم گردەیان گۆڕیوە بۆ ئەم ناوەی ئێستای (یاسین تەپە) وەك بە دەماودەم بیستومە دەڵێن

ئەم گردە لەدوای ئەوەی کە ناوی (ساموا) بوە بە سۆرخی خوشك و برایەکەوە، کە ناویان (یاسین و تەمین) بووە لەم ناوچەیەدا فەرمانڕەوا بوون (یاسین) لە یاسین تەپە دانیشتووە، تەمین لە گردی (سەراکۆن) کە دەکەوێتە (گوندی بێستان سوور) کە عوسمانیەکان دەستیان گرتووە بەسەر ناوچەکەدا ناوەکەیان گۆڕیوە بۆ (یاسین تەپە) لەناوی (یاسین تەمین) ەوە [38].

ب. گردی (عەربەت) لە کاتێکا لەناوچەی شارەزووردا دوو هۆز ژیاون هۆزێکیان (بت) پەرستبووە و هۆزێك (ئاگر) پەرست، زۆرجار ئەم دوو هۆزە کێشەو ئاژاوەی ئاینی و کۆمەڵایەتی کەوتۆتە نێوانیان، بەڵام لەناوچەی (کارداخ) کە ناوچەی قەرەداخی ئێستاکە بووە، کە بەمانای وولاتی کوردان دێت، هۆزێك هەبووە لەسەر ئاینی مەسیح (د.خ) بوون، سەرۆکی ئەم هۆزە کەناوی (قەشە کەیباب/مار کەیباب) بووە پیاوێکی نیشتمانی و دڵسۆز بووە، هاتۆتە سەر گردی عەربەت پەیکەرە بتێکی دروست کردووە کەناوەکەی (کورە) بوە و ئاگری تێدا کردۆتەوە هەردوو هۆزی ئاگر پەرست و بت پەرستەکەی بانگ کردووە کە (تقوس) ە ئاینی کۆمەڵایەتی یەکانیان ئەنجام دەدەن و پێی وتون ئەوە (بت) ئەوەش (ئاگر) ئیتر واز لە شەڕو شۆڕ و کێشە بێنن و پێکەوە یادەکانتان بکەنەوە بەم شێوەیە گیروگرفتەکان چارەسەر بوون لەوڕۆژەوە ئەو گردە بووە بە گردی (ئاروبت) / (ئاگروبت) دواتر لەسەر زمان کورت کراوەتەوە بووە بە (ئەربت) ئەم شارۆچکەیەش هەرلەو سۆرخەوە ئەم ناوەی وەرگرتووە، کە ئێستا بووە بە عەربەت دوای هاتنی عەرەب / ئیسلام.

ج. روبارۆچـکەی تانجـەرۆ نـاوە کۆنەکـەی و ڕیـشەی ناوچـەی تانجەرۆ: ئەڵێن کاتێك ئەم نەهرە لەسەردەمی (لۆلۆ)ی یەکاندا بـەناوی (سـاموا) نـاوبراوە دواتـر بـە (نـامرو) بـەناوی ناوچـەی (نامـار) ەوە کەسـنوری ناوچـەی نامـار لـە بـاکورەوە زنجـیرە چـیاکانی ئـارارات لـە باشـوورەوە نزیـك سـنوری خانـەقینی ئێـستا لـەلای (شکـسیدان) واتـە شـەمیران و کێوەکـانی پـشکۆ، پـشت کـۆ، پـشتەی شـاخ واتـە بـەمۆی ئێـستا هـەتا سـنوری (عیـلام) خـواروی مەنـدەلی.. وە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە چیاکانی (ڕێزو) (ڕێژو) کە ناوچەی هەورامانە ئەو سنورە درێژبۆتـەوە تا (ئەکپاتان هەمەدان) ی ئێستا وە لـە ڕۆژئاوایشەوە زنجیرەچیاکانی (کەمەرزەنـد) یـان (زەردە کەمـەر) کـە چـیای بـەرانان و گڵـەزەردی ئێستایە هەندێ جار ئەم سنورە هەتا (ئەربەئیلۆ/ئەربیل) وە (ئارایـنا/ کـەرکوك) و چـیای (حـەزبین) کـە (حـەمرینی ئێـستایە) (نهـرۆ) (نـدرو) (نەوەر) کەبە مانای نەهر دێت بەناوەڕاستی ئەم ناوچەیە داکشاوە کـە تانجەرۆ و سیروانی ئێستایان پێکهێنـاوە. .. دەڵێـن شـەڕی (تـالوت و جالوت) کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پـێ دەکـات، لـەم ناوچـەیەدا بـووە، ئەم نەهرەش کەلە ئایەتەکەدا هاتووە (ندرو) تانجەرۆی ئێستا بووە.

ووشەی تانجەرۆ لە چی یەوە هاتووە:

١. پاشایەکی ئەو سەردەمە بۆ ڕاوشکار و گەشت لەگـەڵ دەسـت و پێوەندیـدا دەچـێتە سـەر روبارەکـە دەم و چـاوی بـشوات تاجەکـەی دەکەوێتە ئاوەکەوە و دەست و پێوەندەکەی چەند هـەوڵ دەدەن بۆیـان گل نادرێتەوە، ئیتر دەڵێن پاشا تاج ڕۆی، بۆیە لەو ڕۆژەوە (تـاج ڕۆی) ووردەووردە بووە بە (تانجەرۆ)[39].

٢. ئەڵێن کاتێ سلێمانی هێشتا نەبووەتە شار (سلێمان پاشای بابان) بۆ گەشت و ڕاو لەدەشتی (مەڵکەندی و کانی ئاسکان) لادەداتە ماڵی (مەڵکە) کە ئافرەتێکی دەم سپی ناوچەکەی ئەو سەردەمەی دەوروبەری سلێمانی ئێستا دەبێ، دوای حەوانەوە دەچنە ڕاو. کەروێشکێك هەڵدەسێنن بۆیان ناگیرێ هەتا سەرچەمی تانجەڕۆ، کە تانجی کەروێشکەکە دەگرێ یەکەم کەس دەگاتە سەری پاشا دەبێ، دادەنەوێتەوە بۆ سەربڕینی کەلە ڕۆخی ئاوەکەدا دەبێ تاجەکەی دەکەوێتە خوارەوە و ئاو دەیبات هەرچی دەیکات بۆی گل نادرێتەوە، کە دەست و پێوەندیش دەگەنە لای ئەوانیش هیچیان پێناکرێ و بەرێکەوت تانجیەکەشی ماندودەبێ دەچێتە سەر ئاوەکە ئاوبخوا ئەویش دەکەوێتە ئاوەکە و بەهەزار حاڵ بەمەلە دەپەڕێتەوە ئەوبەری ئاو، لەوێوە بە قۆزەقۆز ناوێرێ بێتەوە ئەمبەر، دەست و پێوەندیش ئەڵێن قوربان (تاج و تانجی) ڕۆی، ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەو نەهرە بووە بە (تاج ڕۆی) و وردە وردە لەسەر زمان بووە بە (تانجڕۆ) [٤٠].

ج. ڕیشەی ووشەی (قلیاسان)[٤١] یش لە (گڵی ئاسان)ەوە هاتووە، چونکە گڵی ئەو چەمە بۆ کاری گڵکار و خشت زۆر چاکە.

٣. (شارەزوور) و ڕیشەی ئەم ووشەیە و دامەزراندنی:

دەڵێن (قوبادی کوڕی فەیروزی ساسانی) دای مەزراندووە، دەشڵێن (زووری کوڕی زوحاك) دایمەزراندووە، شارەزوور لە مێژوودا زۆر ناوی هەبووە وەك: (شار/ زۆر)، (شهرزور)، (شەڕ/ زوور)، (شار/ گوڕ) و... هتد کە ئەم ناوانە لە نور و پیت و بەرەکەت و جوانی و هێز و تواناوە هاتووە، لە دوو بڕگە پێکهاتووە وەك: (شار/ زوور) (شهر/

زوور) و (شار / گۆڕ). .. هتد، وشەی (شەڕ / زوور) لە ئاوێستاوە وەرگیراوە بە مانای شار، پاشا، ملك، هاتووە ووشەی (شویتر) یش کە هەر لە ئاوێستاوە هاتووە بەمانای (مەلیك دار) یان (موڵك دار) یان نشێوی هەرێمەوە هاتووە. دەڤەری شارەزوور هەر لە سەرەتای پەیدابوونی کۆمەڵگای مرۆڤەوە هەتا ئێستاش شوێنی خۆی لە مێژوودا گرتووە و دەشتوانرێ بوترێ لانکی شارستانی بووە، لە کوردستان دا.

٤. شارەزوور لە ڕووی جوگرافییەوە

أ. ئەم دەڤەرە کەوتۆتە نشێویەکی شێوە بەلەمی و دەشتێکی پان و بەرینەوە، کەبە پانتایی شارەزوور ناو دەبرێ، جگە لە هەندێ بەرزایی زۆر کەم (کلکەی عەربەت، یاڵی مامەڕەحمان) لە گوندی بێستان سوور، وە بەشێکی (کلکەی چەناخچیان و خرابە) لە نزیك گوندی خەرابە و چەناخچیان، هەروەها (یاڵی سەراو، سەیدصادق، کلکەی موان و بەرزاییەکانی چایخانەی خەراجیان)، ئیتر ئەوە دوای ڕوبەری پانتاییەکە هەموو زەوی کشتوکاڵییە زەوی بەردەڵانیش هەیە کە ڕوبەری ئەم زەویانە بە گشتی نزیکەی (٧٥٠,٠٠٠ دۆنمە)، بەڵام زەویەکانی ناوچەی تانجەرۆ نزیکەی(١٥٠,٠٠٠ دۆنم دێم) و (٢٥,٠٠٠دۆنم بەراو) وە (٧٥,٠٠٠ دۆنمە بەردەڵان) کۆی هەمووی دەکاتە (٢٥,٠٠٠ دۆنم) کە نزیکەی سێ یەکی زەوی شارەزوورە.

ب. سنوری شارەزوور لە باکورەوە (بەشێك لە زنجیرە چیای گۆیژە شاری سلێمانی) یە لە باشوورەوە زنجیرە چیاکانی گەورە

قەڵای پشتی دەربەندیخان و چیای بالانبۆ، لە ڕۆژهەڵاتەوە زنجیرەچیاکانی هەورامانە، لە ڕۆژئاواوە زنجیرە چیاکانی بەرانان (گڵەزەردەیە)، لەناو ئەم سنورەدا سنوری ناوچەی (عەربەت / تانجەرۆ) لە باکورەوە شاری سلێمانی، لە باشوورەوە گۆلی دەربەندیخان و ناوچەی زەڕایەن و هەڵەبجەو مالوانە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ناوچەی شارەزوور (سیدسادق) و لە ڕۆژئاواوە زنجیرە چیاکانی گڵە زەردەیە.

ج. بەناوەڕاستی ڕووبەی شارەزووردا وەك لەسەرەوە ووتومانە روبارۆچکەی تانجڕۆ دەکشێ ئەم لقانەی دەچێتە سەر، سەرەتا چەمی خێوەتەی دەچێتە سەرو لە سەرچاوەی سەرچنار هەردوکیان دەڕژێنە چەمی قلیاسان لای گوندی بابە علی یەوە، قلیاسان لە خوارووی دۆڵەکانی گوندی عەواڵەوە دەڕژێتە تانجڕۆ. .. لە گوندی بێستان سووریش (چەمە گەورە / چەمەڕەش) شۆڕ دەبێتەوە و لە تەنیشت گوندی خاك و خۆڵ گردی یاسین تەپە دەڕژێتە تانجڕۆ.

د. چەمی (چغان) ئەمە لە کۆندا وای پێوتراوە و ئیستا پێی دەووترێ چەمی (چەقان)، دەبێ ڕیشەی ئەو ووشەیەش لەوەوە هاتبێ کە لەم چەمەدا ڕووەکی (نەیجە) و (تەرکە) زۆرە کە ئەمە دوو ڕووەکن چیغی کوردەواریان لێدروست دەکرێ، ئەم چەمە لە دۆڵەکانی (چەوتان)ەوە سەرچاوە دەگرێ و شۆڕدەبێتەوە بەناو شارۆچکەی (سیدسادق) سەنتەری ناوچەی (شارەزوور) دا تێدەپەڕێ و لە خواروی گوندی تەپەڕەشەوە دەڕژێتە تانجڕۆ.

پێدەچێ ئەم ناوچەیە بە (مزڵجە) ناسرابێ کە لە هەوارگەوە هاتووە چونکە هەر لە کۆنەوە خێڵە کۆچەرەکان لەم سەرچاوەدا لایان داوە. هەروەها ئەم چەم و دۆڵە لە سەردەمێکدا هێڵێکی نێوان ئێرانیەکان و عوسمانیەکان بووە دوای زاڵبونیان بەسەر ناوچەکەدا.

هـ. زەڵم لە (ئەحمەد ئاوا) کە بە سەرچاوەی زەڵم ناودەبرێت لە پیشتی خورماڵەوە سەرچاوە دەگرێ و لە (دووئاوان) لە نزیکی گوندی تەپەکەل دەڕژێتە تانجەرۆ لە (تووەقوت) تانجرۆش دەڕژێتە گۆلی دەربەندیخان.ئەم ناوچەیە بەهۆی ئەو ئاوە زۆرەوە زەویەکە زۆر ئاودێر دەکەن بەروبومێکی باشیان هەیە ،لەلایەکی تریش ئاوهەواو سروشتی ناوچەکەی جوان کردوە.

و. لەروی رێگاوبانەوە بەم رێگایانە بە یەکەوە بەستراوەتەوە: رێگای سلێمانی هەڵەبجە، رێگای عەربەت دەربەندیخان، تانجرۆ چەناخچیان، عەربەت دوکانیان، سلێمانی قەرەداغ، ئەمانە جادەی قیرن ، نێوان هەموو گوندەکانیش بە رێگای خۆڵ بەیەکەوە بەستراونەتەوە، دیارە ناوچەی عەربەت تانجرۆش هەر بەو رێگایانەوە بەستراوەتەوە.ئەم رێگایانە رادەی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سروشتی و شارستانی و سیاسی ناوچەکەیان زۆر بەهێز کردوە.

ناوچەی تانجرۆ لە رووی شوێنەوەرەوە

گردی یاسین تەپە: یەکێکە لە گردە هەرە بەرزو پانەکانی ناوچەکە ، کەوتۆتە شوێنێکی پارێزراو بەهۆی ئەو چەم و ئاوانەی کە دەوریان داوە بە حەشارگە ناوبراوە، سەردەمێك حەسنەویەکان دوای

ئەوەی کە فەرمانڕەوا بوون لە رۆژھەلاّت، لە یاسین تەپەش لە شارەزور فەرمانڕەوا بون دەڵێن ئەم حەستەویانە لە بنەچەدا کورد نەبون، هەروەها دەشڵێن خوارزمەکان دوای تێکشکانیان لە ناوچەکانی خۆیانەوە هاتونەتە ئەم ناوچەیە.

ئەمانە چەند قەبیلەیەکی (پزیشمار) بون کە لە بنەچەدا کورد نین ، هەتا تورکە (زەبکیەکان،ئەتابەگەکان،ئەربەیلۆ) لە سەردەمی (موزەفەر الدین کوکبی) دا بەسەر ناوچەکەدا سەرکەوتون هاتونەتە ناوچەکە.

گۆرستانێکی کۆنی ئەو سەردەمەی قەلاّکە هەیە لە بەشی سەرەوەی قەلاّکەوە ئەویش ئاسەوارییە.

– بە دوری چەند کیلۆمەترێك بەهەر چواردەوریدا چەند گردێك هەیە:

(گردی عەربەت، سەراکۆن، کاژاو، بێستانسور، گۆمەڕەش، گۆڕی گەوری) کە سەرجەمیان باس کراون لەم کتێبەدا ، لە باکوری گردی یاسین تەپەوەن نیشتەجێ و خاڵی پارێزگاری قەلاّکە بون لەبەشی باکورەوە.

– گردی مالوان کەوتۆتە ئەوبەری تانجرۆوە لە نزیك گوندی کانی کەوەی چوخ ، گردی دزکەرە هەر لەوبەری تانجەرۆیە لە گوندی دزکەرە ئەمان خاڵی پاراستنی ئەوبەری ئاو بون بۆ یاسین تەپە، هەرچی گردی( مارف)ە نزیك گوندی زێڕینجۆ لە باشوری یاسین تەپەوە بۆ پاراستنی بەشی باشوری قەلاّکە بوە.گردی خاکوخۆڵ و گردی قەڕاڵی و بەرزاییە سروشتیەکانی گورگە چیاو گردی گۆمە

ڕەش پاراستنی بەشی ڕۆژئاوای قەڵاکە بون. هەروەها گردی موان لە کانی پانکە ئەمیش لەگەڵ بەرزاییەکانی چەناخچیان پاراستنی ڕۆژهەڵاتی قەڵای یاسین تەپەبوون.

– ئاسەواری شوێنێك کە بە سەترەکە ناسراوە کەوتۆتە بەردەم گوندی بێستانسور ، بەربەندێك بوە کە بە لەغەم لەژێر زەوییەوە ئاوی لێوە ڕاکێشراوە بۆ دەوری گردی گۆمەڕەش، کە ئاسەواری گۆلەکەی دەوری گردەکە دیارە هەروەها بۆ ئاودێری زەوییەکانی دەوروبەری گردەکەش بون.



- گۆمەڕەش کە گۆمێکی گەورەیە کەوتۆتە بەردەم گردی گۆمەڕەش کاتی خۆی زۆر قوڵ بوەو ئاسەواری ماوە لەوە دەچێت دەستکرد بێت چونکە وا دیارە ئەو شوێنە هەڵکەنراوە زۆر قوڵ کراوە ئاوی لێ دەرچوەو بوە بە گۆم.

- گۆرستانی دارەڕەش ئاسەوارێکی ترە ، گۆرستانی (بەرامبەرەکەی) لە لاپاڵی سەراکۆن. ئەم گۆرستانە زۆر کۆنە هی سەردەمی گردەکانە.

- لە باشوری زەوییە دێمەکارەکانی گوندی بێستانسورەوە (دوو دۆڵە) هەیە کە دوو دۆڵی قوڵن. بە دەماودەم دەڵێن سەرچاوەی ئاوەکانی بێستانسور لە دوو دۆڵەوە سەرچاوەی گرتوە بەلاّم بەهۆی بومەلەرزەوە شوێنی خۆی گۆڕیوە بۆ ئەو جێگایەی ئێستای ، لەدەوروبەری بێستانسوردا خڕەبەرد هەیە کە بە (گۆ ئاسن) ناودەبرێت خۆم زۆرم دیوە دەڵێن گوایە ئاسەواری ئەو بومەلەرزەو نیمچە گرکانەیە کە لە بەرزاییەکانی کلکەی عەربەتو گردو قەڵبەزەکانی کە ناسراون بە گردی مامە ڕەحمان یان گردی کچان روی داوە.گۆری گەوریش گردێکی بچوکەو گۆرستانێکی زۆر کۆنی تیدایە لە بێستانسور.

- سێ ئاشە: ئەمە شوێنەواری کۆمەڵێك ئاشی ئاون کە بە بەرداش گەڕاون و مێژویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی قەلاّکان.

**٥. شارەزورو ناوچەی تانجرۆ لە روی ئابورییەوە**

لای هەوان رون و ئاشکرایە کە شارەزور خاوەنی زەوی و

زارێكی زۆر بە پیت و بەرەكەتە یەكێكە لە بە پیت ترین زەویەكانی جیهان، كە بۆتە مایەی بەروبومێكی زۆر بۆ هەموو كوردستانی باشور، ئەم زەویانە بەشی زۆری دەكەوێتە ناوچەی (عەربەت / تانجرۆ)كە سالأنە لە بەروبومی: گەنم، جۆ، نیسك، نۆك، پاقلە، ترۆزی و كالّكی دێمی، هەروەها چەڵتوك و لۆكەو كونجی و گوڵەبەرۆژە و پیاز،هەروەها داری بی و چنار و هەنار و هەنجیر و مێو.. هەروەها ئاژەڵ داریش بەشێكە لە بەروبومە ئابوریەكان وەك مەڕ، بزن، گاو مانگا، بەرزە ولأخ و باڵندەی مالّی وەك قەل و مریشك و مراوی و قاز.

٦.لەروی كۆمەلأیەتی و فەرهەنگییەوە:

خەڵكی ئەم ناوچەیە هەموو كوردن عەشایەری كوردەوارین، لە عەشیرەتەكانی(ئالّی بەگی،مكایەلّی، رۆخزایی، شێخ سمایلی، كەلهوڕ، بێسەری ...) جل و بەرگ و ئاخاوتن و كەلەپورو فۆلكلۆر یەك شێوەیە.خەڵكە ناوچەكە لە خۆشی و ناخۆشیدا بەدەم یەكەوە دەچن ئەگەر كێشە لە نێوان تیرەكانی ناوچەكەدا رۆی دابێت زوو چارەسەر كراوە، لە بۆنەو یادو جەژن و شین و شایدا هاوكاری یەك دەكەن، زۆربەیان بە كشتوكاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریكن كەمێكیش بە بازرگانی و دوكاندارییەوە خەریكن بە تایبەت لە عەربەت.

٧. لەروی شارستانییەوە

خەڵكی ناوچەكە هەموو خاوەنی خانوەنی خانون، هەموو گوندەكان مزگەوتی تیدایە، زۆربەیان كارەباین هەیە، قوتابخانە و بنكەی تەندروستی لە زۆربەی گوندەكان هەیە، لە زۆر شوێن دوكان و

بازاری تێدایە، دیوەخان و تەکیٚ و جێگای کۆڕو کۆبونەوە لە زۆربەی گوندەکان هەیە ، ئاین لە ناوچەکەدا زۆر بە پیرۆزی سەیر دەکرێت، ئەدیب و شاعیری تێدا هەڵکەوتوە، هەروەها گۆرانیبێژو شمشاڵ ژەن و هۆرە وێژ و هەڵپەرکیٚ زانی چاکی تێدا هەڵکەوتوە، حیکایەت خوان و پەند زان و سوار چاك و راوچی و سەنعات کاری زۆری تێدابوە، دەم سپی ئاواییەکان توانای بڕیاردانی هەبوە، حەکیمی میلی و کەش ناس هەبوە.

٨. لە رووی سیاسییەوە

لەسەرەتای مێژوەوە بگرە هەتا ئێستاش ئەم ناوچەیە لە ناو کێشەو ململانێی دوژمن و داگیرکەراندا بوە بەلاّم خۆڕاگرانە توانیویەتی خۆی بپارێزێت، داپڵۆسینی (٣٠٠) ساڵەی ئاشوریەکان ، دوو جار کاولکاری هەردوو سەردەمی (نارام سین) و (شارگشتی و شارگۆڕی) ، فارسەکانچ هەخامەنشی چ ساسانیەکان چ سەفەویەکان چەندین جار ئەم ناوچەیەیان کاول کردوە، ئەسکەندەری مەکەدۆنی (تەتەر و مەغۆلەکان) یەك لە دوای یەك کاولکاریان کردوە،بێزەنتیەکان و تورکە عوسمانیەکان لە تالاّن و سەرانە و سەفەر بەلك و داگیر کردنی ناوچەکە و گۆڕینی ناوی یاسین تەپە و ناوی زۆر گوند، ئەمانە جگە لە رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق هەر لە کۆمەڵ کوژی و راگوێزان و کیمیاباران کردنی پایتەختی شارەزور (هەڵەبجەی شەهید) بوو بەلاّم خەڵی خۆراگر بون بەرامبەر هەموو ئەو دوژمنکاریانە و پشتیوانی هەموو راپەرینەکانیان کردوە.

٩. له رووی ( ناوا) ەوە

کورد خاوەنی ناوی تایبەت بە خۆیەتی و یەکێکە لە پێناسەی هەر نەتەوەیەك، خەڵکی شارەزور هەر لە سەرەتای مێژووەوە ناوەنی ناوی رەسەنی خۆیان بون چ ناوی مرۆڤ چ ناوی ناوچە و هۆز ، ناوی ئاژەڵ و باڵندە..بۆ نمونە لە کۆندا ناو بەم شێوەیە بوە: زاموا، تاشور،مامی،سندۆر... کە ئەم ناوانە مۆرکی رەسەنایەتی کوردەواری سەردەمی خۆیان پێوە دیارە، دواتر ناو گۆڕاوە بە (خوسە،زاڵ،گیوو،زور،خاوەر،رۆستەم،خورشید....) هەتا ئێستاش وردە وردە ناوەکان گۆڕاون بە ناوی نوێ کە لەگەڵ رەسەنایەتی کوردەواریدا دەگونجێن.

١٠. گوندەکانی ناوچەی تانجرۆ

أ. گوندەکانی بەشی باکور: نێوان سلێمانی و عەربەت.

(چوارتاق، عەربەتی خواروو، باریکە، قڕاڵی، یەخیماڵی، گەڵبان، خراجیان، کۆزە ڕەقە، یەك ماڵە، دەمرکان، رازیانە، عارف ئاوا، فرج ئاوا، شێخ وەیس ئاوا، کۆڵەبی، ژاڵەی سەروو، ژاڵەی خواروو، هوانە، قرگە، سولەکان، هۆمەرەکوێر (گوندێکی مێژوییە)، وێڵەدەر.

ب. گوندەکانی بەشی باشور: نێوان و عەربەت و روبارۆچکەی تانجرۆ.

(خاکوخۆڵ، نیسکەجۆ، زێڕینجۆی سەروو، زێڕینجۆی خواروو، زێڕینجۆی ئاشەکە، قازاو، کاژاو، بێستانسوری گەورە، بێستانسوری بچوك.

ج. گوندەکانی بەشی ڕۆژهەلأت: نێوان عەربەت و شاربازێڕ.

(پوشێن، خرابە، بادارە، دێ کوێر، چەناخچیان، هەنجیرە.

د. گونـدەکانی ڕۆژئـاوا: نێـوان عەربـەت و چـیای گڵـەزەردە (بەرانان)

(نـاوگردان، چـەقەڵ ئـاوا، بەردەکـەڕ، شـێخ ئـەولأ، سـەماوات، سەدوبیـست، زڕگوێـز، زڕگوێزەڵـە، کـانی شاسـوار، دێـی ئـەلی، دێـی حەمـەی بـارام، سـولەکان، کـانی هـەنجیر، دارەڕەش، گـەدان، کەمالأنـە سـەروو، کـەمالأنی خـواروو، باخـچە، گورگـە چـیا، شـەمە، وێلەکـەی خواروو، وێلەکەی سەروو، قسرتی سەروو، قسرتی خـواروو، نەمـەڵ ، قەرەگۆلی سەروو، قەرەگۆلی خواروو.

❊❊❊

سەرچاوەی زانیاری بۆ ئەم بابەتەم:

خـۆم خـەڵکی ناوچـەکەم سـەرجەم گونـد و شـاخ و چـەم و ئـاو ڕشێگاوبانەکانی ناوچەکەیە گەڕوم، پرسیارم زۆر کردوە لـە پیرەکـان ، بۆ گردی عەربەت سودم لـە کاك شێخ بورهـان قـەرەداغی وەرگـرت، بـۆ چەمی تانجرۆ و قلیاسان سودم لە کاك کەریم زەند وەرگرت.

کـه گەشـتێك بـەرەو رۆژئـاواو باشـووری رۆژئـاوای (باشـوری کوردســتان) دەکــەی توشــتدەبیٚ بەپێدەشــتێکی تونکــەتونکاوی و بـەرفراوانی و شێوە کەوانـەیی ووشـك و کـەم ئـاوو گەرمەسێرەوە، کـە بەهاوین ووشك و گەرم زەویەکی کەم سەوزایی و نەرمە شـەپۆلی تینـی گەرما لـەدوورەوە لـەپێش چاوت شنەدەکات، هەلبـەت ئەمـە لـە کەشـە گەرمەکەی کوردستاندایە هەرچی کەشە ساردەکەشە هـەمان دەشـتە و تونکــەکان زۆرفێنــك و هەنــدێجار مەوجەیــەکی ووشــکە ســەرمای هەیە،بەکـەمیش بـارانی لێـدەباریٚ، ئـەو دەشـتایە سـەراپا سـەوزە بـە کێلگـەی گـەنم و جـۆو کشتوکاڵی تـریش، کـە گـەنمی ئـەویٚ باشـترین گـەنمی جیهانـە کـە ناسـراوە بـە (گـەنمی قەنـدەهاری) مـەزرای جـۆ، ئەویش یەکێکە لە کشتوکاڵە بە ناوبانگە بە بەروبوم و بەرێژەنەکانی دونیـا و(ناسـراوە بـە جـۆڕەش) کـە قەڵـەو و بەناوبانگـە بـۆ دەرهێنانـی بیرە، هـەروەها جـۆی سـپی شەشـت پـەڕ کـە ئـەویش گوڵەکـەی شـەش ڕیزە و کەمێك لاوازە و بەرێژەنە و باشترین ئاڵفی ئاژەڵە.

هەڵبـەتـە گوندەکانی ئـەو پێدەشـتە خـاوەن ڕانەمـەڕێکی ئێجگـار زۆرن،مەڕی گەرمیان بەناوبانگە لە گۆشت و خوری و بەروبومی شیر و زاوزێیدا. خاکی ئەوپێدەشتە ناسـراوە بـە (گـەرمیان)و هۆزەکـانی ئـەم دەڤـەرە بـریتین لـە: (گـەلاڵی - ڕۆغزایـی - مکایـەڵی. ئـاڵی بـەگی. باجـەلان - دەلـۆ. زەنگەنـە - هەمەوەنـد - تـەرخانی و هەندێکیـشان رەوەنـدن). لەسـەر ڕوبـەری ئـەو زەویـە چـەند نیمـچە چـیایەك وەك (حەمرین، شاخەسپی لای دوزخورماتوو، گردۆلکەکانی بنـاری گـل ).

هـەروەها لەسـەر ئـەو زەویـە چـەند خروچـەم و چـەماو هەیـە لەگـەڵ چەندین کوێرە کانیاوی کەمئاو کە دەکەونـە دراوی ئاوایی یەکانـەوە، کـە خڕوچـەم و چەماوەکانیـشی ئەمانـەن: (خاسـە - ئاوەسـپی - ئاوەخوێڕی - چـەمی حەویجـە و چـەم و خـڕی قـادر کـەرەم - خـڕی پشتی کەلار و هی تر).

ئەو پێدەشتە گەرمە سێرە بە درێـژایی مێـژوو زۆر گیروگرفتـی گرانی و ووشکە ساڵی و شەڕوشۆڕ و داپڵۆسینی بەسـەردا هـاتووە و زۆر بزوتنەوە و ڕاپەڕینیشی بەخۆیەوە دیوە، وەك: (شۆڕشـی ابراهیم خـانی دەلـۆ سـاڵی (١٩٢٠)، بزوتنـەوەی باجەلانـەکان، هـی تـرو شۆڕشـەکانی ئـەم دواییـەش)، پایتـەخت و ناوەنـدی ئـەم دەشـتی گەرمیانـە شـاری مێژووی کەرکوکـە و گـەلێ شارۆچکەشـی هەیـە وەك: (خانـەقین، جەلـەولا، بـەدرە، کفـری، کـەلار، دوزخورمـاتوو، تـازە خورمـاتوو، حەویجـە، داقـوق، چەمـچەماڵ، سـەنگاو، قـادر کـەرەم و لـەیلان هـی تـر) ئـەو دەشـتە بەدرێـژایی مێـژوو ئـاوەدان و دەڤـەرێکـی دیـارو ناسـراوی کوردسـتان بـووە، گـەر بگەڕێینـەوە بـۆ هـەزاران سـاڵ پێش مێـژوو کـە ئێـرە ناوچـەیەك بـووە لـە کوردسـتان و لێـرەدا تەنهـا لەدوو هـەزارەی پێش زاینـەوە کورتەیـەك دەدوێین لەسـەر ئـەم دەڤـەرە کە لە پێشتردا لەسـەردەمی دەوڵـەتی سۆبارتۆ دا پایتـەختی بەشـێکی ئـەو دەوڵەتـە بـووە و کـە بـە (ئاراپخـا) ناسـراوە دواتـریش پایتەختـی گۆتـی و(لۆلۆییـەکان) بـووە کـە بـە بـاپیرانی کـورد ناسـراون، کـە ئـەو سەردەمە دەوڵەتی شارەزوور، بەناوی (زاموا، ساموا) ناسراوە.

(ئاراپخا) کە ناوەند و پایتەختی دەشتی گەرمیان بووە، بەڵام شارەکە ناسراوە بە شاری (ئارپا یان ئەرەپا) کە مانای گۆڕەپان، یان پێدەشت دێت، ئەو شارە واتە (ئەرەپا) کە شوێنی یەکێك لە گەڕەکەکانی ئێستای کەرکوکە و کە عەرەب دەستی گەیشتە کوردستان و بەناوی ئیسلامەوە داگیریان کرد ناویاننا (عەرەفە) کە هەتا ئێستا ئەو گەڕەکە هەر بە (عەرەفە) ناسراوە کە ئەویش هەر مانای گۆڕەپان یان پانتایی دەگرێتەوە، جا ئەو شارە بووە بە گۆڕەپان یان لەشکرگای کیاکسار (کەی خوسرەو) کە (٦١٢پ.ز) کاتێك کە نەینەوای گرت و ناوچەکەی لەدەست چەوسانەوەی ئاشوریەکان ڕزگار کرد.

گەر بگەڕێینەوە بۆ ئاراپخا ئەوا دەبێت باس لە شاری قەڵای (کاکوك) بکەین کە ئەمە بنیاتنراوێکی مێژووی باپیرانی گەلی کورد بووە، (ئانۆبانینی) پاشای گۆتی و لۆلۆییەکان کاتێك کە لوتی ئەکەدیەکانی شکاند (نارامسین) و (شارکاڵ) ی کوڕی کە پاشای ئەکەدیەکان بوون و زاموایان داگیر کردبوو، دەریان پەڕاند لێرەوە دەسەڵاتی ئەکەدیەکان پاککرایەوە لە ناوچەی میزۆپۆتامیا، پاشای گۆتی (ئانۆبانینی) قەڵای (کاکوك) ی کردە پایتەخت بۆ دەوڵەتی (زاموا)، کاکوك بەمانای تۆکمە دامەزراو دێت لە ووشەی کوردیدا یاخود (کاکە)ی کوردی.، (زاموا)ش بە مانای (زیم) کە لە زمانی کۆنی کوردیدا بە وولاتی (ساردەسێر) ناوبراوە، ئاشوریەکانیش دەوڵەتی (زاموا) یان بە (علیاتم) ناوبردووە کە بە واتای وولاتی بەرزایی دێت، ئەم واتانەی سەرەوە بە هەموو ئەو وولاتە ووتراوە کە ئێستا

کوردستانه. دامەزرێنەری (ئارابخا) ئەلۆلۆمیش پاشای (ئەلۆلۆ میش) (زاموا) بووه، ڕوبەری کوردستانی گەورە لەشێوەی دەمانچەدایە و کەهەر چوارلای بەنجیرە شاخێك دەورە دراوە، ئەمە جگەلەوەی کە لە ناویشەوە زنجیرە چیای تێدەکەوێ کەهەمووشی کوێستان و نیمچە کوێستانە جگەلە ناوچەی (ئارابخا) گەرمەسێرە، کە تەوەری باسەکەمانە، هەڵبەتە لەلای خواروو خوارووی ڕۆژئاواوە نیمچە چیایەك کەوتۆتە کۆتایی سنوری کوردستان بە (حەزبین) دواتربە (هەرمین) و کە ئیسلام هاتە ناوچەکە ناویان نا حەمرین هەڵبەتە حەزبین و هەرمین یەك مانایان هەیە کە ئەویش ووشەی (جوان)ە چونکە ئەگەر یەکێك چووە سەر چیاکە ڕووکاری کوردستانی لەڕووی جوانی و سروشت و ئابووری یەوە جیاوازی زۆرە لە ڕووکاری ئەو دیو، لە مێژودا بە ناوچەی ( ئارابخا) ووتراوە (باگرمێ) کە بە واتای (ئاران) یان (گەرمەسێردێت)، ئابووری وجوانی کوردستان وایانکردووە کە هەردەم دوژمنان چاویان تێ بڕیوە، باری تۆبۆغرافی و ستراتیجیش کاریگەر بووە بۆ چاوچنۆکی دوژمنان، ئەگەرچی زیانیان گەیاندبێت هەردەم زۆرجار لوتیشیان شکاوە، هەرچی خڕی خاسەشە لەڕوی مێژووییەوە، ئەو چەمە لەدێر زەمانەوە یەکێك لە چەمە بەناوبانگەکانی کوردستان و سەردەمەکانی دەولەتی شارەزوور (زاموا)ی گۆتی و لۆلۆییەکان بووە و بەناوشاری (ئەرەپا) لە ناوچەی ئاراپخادا لە شوێنی ئێستای کەرکوکدا تێپەڕیوە، ئەو چەمە بەپێچەوانەی هەموو چەمەکانی کوردستان بەپێچەوانەوە بەرەوژوور دەڕوات، بۆیە بە (خێس) یان خڕی خێسە (واتە پێچەوانە) نابراوە و

ئەو ناوەی دواتر بۆتە خڕی خاسە، کەئەو ناوەش لە (خڕو بەردەڵان و چەوی خڕ و زیخ)پێکهاتووە [42]، هە ندێ بۆچونیش ڕایان وایە کە گوایە پاشایەکی فارس هاتۆتە ئە و ناوە داوای ئاوی کردووە هەرئاوێکیشیان بۆ هێناوە وتویەتی خاس نیە، بەڵام ئاوی خاسە یان بۆ هێناوە وتویەتی خاسە بۆیە ناوی ئەو چەمە بۆتە خاسە، ئەم بۆچوونە لە وەناچێ دروست بێت چونکە یەکەم: پاشایانی سەفەوی و عوسمانی بەو لەهجە قسەیان نەکردووە، دووەم: ناوی خاسە زۆر لەسەردەمی عوسمانی و سەفەوی یەکان کۆنترە.. . بۆیە هەر (خیس) ە کە ڕاستە کە لەچەوت یا پێچەوانەوە هاتووە لە زۆر کۆنەوە بەوناوە ناوبراوە، هەم چەوو بەردەڵانەکەشی کەهەمووی بەردی هیلکەییە لەقەوارەی هێلکە چۆلەکەوە هەتا هێلکە قەل گەورەترە، ئەو بەردەڵانە ژیربۆش و خڕەکە ئەو واتایەش (خز) یان (خسە). ئەو چەم و بەردەڵانە زۆر بەپیتە بۆ سەوزە و شوتی و پشت بە ئاودان نابەستێ چونکە بەتەری ژ ێر بەردەڵانی و خڕەکە نەش و نمادەکات..

بابگەڕێینەوە سەرکۆنیی (ئاراپا) با و کوردستانیەتی و کوردبونی (شاری ئەراپا) و (دەڤەری ئارابخا)، لەودیوی (حەزین) واتە (هەرمین) یان حەمرینی ئیستاوە هۆزێك لە ناوچەی تکریت و ڕومادی ئێستادا هەبووە بەناوی (تاکری تابین) کەپێدەچێ خەڵکەکەی (ئارامی) بووبن لە ژێر چاودێری و فەرمانڕەوایی ئارابخا دا شێوە دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی یان هەبووە، هەروەها لەنێوان نەینەوا و ئەربائیلۆ و ئارابخاشدا هۆزێك ژیاون لەسەردەمی (هیلینی) دا ئەمانە بە جولەکەی ئەساتیس ناسراو بوون، بەناوی

سەرۆکەکەیانەوە کەناوی ئەساتیس بووە، ئەمانیش شێوە ئۆتۆنۆمیەکیان لە ژێر دەسەلاتی ئاراپخا هەبووە، کەکچی سەرکردەکەیان ناوی هیلینا بووە لەدوای باوکی سەرکردایەتی هۆزەکەی گرتووەتە دەست و بەتەبایی لەگەڵ کورددا ژیاون، ئەو چەند دێڕەی سەرەوە لەقولایی مێژوودایە و بەڵگەنامەی کوردستانی بوونی کەرکوك و کورد بونی خەڵکەکەی بووە، ئەو دەڤەرە کەبۆتە (کەرکوك) بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ (گەڕگەڕ) گەڕگەڕ بووبە گوڕگوڕ و دوایش بوبە کەرکوك و وەك شار ناسراو و ناوچەیەکی هەر بەوناوەوە مایەوە کە بابەگوڕگوڕی ئیستایە یان لەقەلای (کاکۆك) یشەوە هاتووە.

بالاپەڕەیەکی نوێش لەسەر شاری کەرکوك و کوردستانی بوونی و کورد بوونی بخوێنیەوە، لەسەردەمی عوسمانیەکاندا کە بونە ئیمراتۆری ناوچەکە جەندرمەکانیان شۆڕکردەوە بەرەو کوردستان و پشتوێنەیەکی جەندرمەیان لەموسڵەوە بۆ خانەقین دامەزران کە لەسەدا ٧٥٪ تورکومان بوو زیاتر هۆکارێکی سیاسی بوو کەتورکمانەکانیان لەکۆڵ خۆیان دەکردەوە ڕەوانەی دەوروبەریان دەکردن بۆ ناوچە داگیرکراوەکانی قەڵەمڕەوەکەیان.

ئیتر ئەو تورکەمەنانە نیشتەجێ بوون لەناوچەکەدا و تێکەڵ بوون وژن و ژنخوازی لەگەڵ کوردەکان پەیدابوو، بەو پێیە بوون بەدانیشتوانی ناوچەکە لەوهێڵەدا کە لەسەرەوە باسمان کردووە، ئەگەچی هەر لەکۆنەوە تورکومان لەناوچەکەدا هەبووە جگە لەو هاوردانە بەلام ئەو هاوردانە بونە برابەش و ئەکەرچی ناوچەکە هەر

کوردستانیی خۆی پاراستووە، تەنانەت کوردستان بوونی کەرکوك و ناوچەکە لە بەڵگەنامەکانی خودی عوسمانی یەکان خۆیشیاندا هاتووە، ئەوە مێژووی تورکمانە لەناوچەی کوردستان بەگشتی و بەتایبەت کەرکوك، کەجەنگی جیهانیش کۆتایی هات و ئینگلیزەکان هاتنە ناوچەکە زیاتر متمانەیان بەمەسیحی یەکان هەبوو کە کورد پێی دەوتن (فەلە) بۆ کاربەدەست بونیان لەشەریکەی نەوتدا بەکاریان دەهێنان، کە ئەمە لەدوای ساڵی (١٩١٩)ەوە دەست پێدەکات بۆ بوونی مەسیحی یەکان لەوشارەدا.

کە بابە گوڕگوڕ لەلای خۆمان وەك پیر و مشایخ سەیر دەکرا کە گڕی لێ بەرز دەبۆوە دەووترا نورە و دەچونە زیارەتی و دەووترا (بابەگوڕگوڕ لە پڕهاتین بۆکوڕ هاتین) هەرچی لای ئینگلیزەکانیش بوو بووبەئالتونی ڕەش و شەریکەی نەوتیان تیا دامەزراند، چونکە بابەگوڕگوڕ لەپڕتەقی و (٢٣م) نەوت چوو بە ئاسماندا وەك فوارە، ئیتر ئەو جێگەیە نەوتی لێ بەرهەم هێنرا کەساڵی (١٩٢٧) بوو وەك شەریکەی نەوتی کەرکوك لەوکاتەدا.

کاتێك ڕاپەڕینی کرێکارەکانی نەوت بەناوی ڕاپەڕینی (گاورباغی) ڕویدا بۆ زیاد کردنی موچە و خزمەتگوزاری باشتر و دەرنەکردنی کوردەکان لەشەریکەکە چونکە دەوڵەتی عیراق دەیویست وورده وورده سیمای کوردەکان بسڕیتەوە لە کارگەکەدا بەڵام ڕاپەرینەکە ڕۆڵی خۆی هەبوو، چونکە ساڵی(١٩٣٦) ووشکە ساڵی یەك لە خێڵە عەرەبەکانی دەوروبەری ناوچەکە داڕویداو سەرۆك هۆزە عەرەبەکان پەنایان هێنا بۆ سەرۆك هۆزە کوردەکان کە لە دەوروبەری

چۆمی حەویجە ئاژەلەکانیان بلەوەڕێنن و دەوارنشینبن تا کۆتایی بە ووشکە ساڵ دێت، سەرۆك هۆزە کوردەکانیش هەم بە ساویلکەیی و هەم بە دڵسافی ڕێگەیان پێدان ئەوانیش وورده وورده کۆچڕەویان کرد بۆ ناوچەکە و بەتەواوەتی نیشتەجێ بوون تەنانەت شارەدێیەکیش کە ئیستا پێی دەڵێن (ناحیەی ریان) بنیادنرا ئیتر بوون بە خاوەن ماڵ ڕۆژدوای ڕۆژ زیاد دەبوون تا وورده وورده گەیشتە کەرکوك و ناوچەکەش.

حەویجەش لەوەوە هاتووە کە خەڵکەکەی بوو بە حەوت لەهجە، وەك (کورد، تورکمەن، عەرەب، مەسیحیو هەڵبەت چەند لە هجەیەکی شێوازی عەرەب).

تاوایان لێهات خەڵکی بە عەرەبە ڕەسەنەکان ناوی دەبردن، کە ئەوە ڕەسەنایەتیەکەیانە کە لەسەرەوە باسمان کردووە، ئیتر ئەمانە کەوتنە تەعریب کردنی ناوچەکە و زۆرجار لەگەڵ تورکمانەکاندا یەکیان دەگرت بۆ فشار خستنە سەر خەڵکی کورد، هەڵبەت دەوڵەت لە پشتیان بوون، بائەوەمان لە یاد نەچێت رۆژێك لە ڕۆژان بوونی تورکمان و عەرەب ئەوەندە کەم بوون لە کەرکوك هەموو ئیش و کاریان بە کرێکاری بو ماڵە کوردەکان بوو.هەندێ کاری پیشەیی لاوازو بچوکیان هەبوو، تەنانەت منالان لەیاری یەکانیاندا دەیان ووت (ئاخ چی بوخچی دایە و بابە سنجوق چی) کەواتە ئەوە بەڵگەی ئەو ئیشە لاوازانەیە، کە کریکارە عەرەبەکانیش بۆ خانوو دەگەڕان بۆ کرێ کوردەکانیش پێیاندەوتن شوێنی ئێوە ژێر پردەکانە کە ئەمە مانای زۆرە. کە هێدی هێدی عەرەبەکان زۆر بوون بە پشتیوانی

دەوڵـەت و پـشتگیری تورکمانـەکان دەیـانخوڕی بەسـەر کوردەکانـداو دەیانووت: (احنا البدو وین العدو) ئیتر لەو ڕۆژەوە کنە لە سڕینەوەی دیموگرافی کەرکوك دەکەن.

ئـەوەبوو لەسـەر ژمێـری یەکـەی (١٩٥٧) ژمـارەی کـورد ( ٥١٪. ٥٩٪) دەرچوو ئەگەرچی ڕێژەکەی لە ڕابردوو (٢٥٪) هاتۆتـە خـوارەوە بەڵام هێشتاش زیاد لەبەهاو بەرابەری تیرەکانی تر بوو.

بۆیە تورکمان و عەرەبەکان یەکیان گرت لـە دژی کـورد شـەڕێکی لێکەوتـەوە سـاڵی (١٩٥٩) کـە لـە ئەنجامـدا شـێخ معـروف بەرزنجـی تیایدا لە سێدارە دراو شەهید کەوت.

لەو سەرژمێرەدا کە زیاد لە ٥١٪ کوردبوون ٣٦٪ تورکمەن بـوون و ئـــەوە ودواشـــی عـــەرەب و مەســـیحی تێکـــەڵاو بـــوو، ئائەمەیـــە ڕەسەنایەتی تیرەکانی غەیرە کورد لە کەرکوك.

ئیـتر لـە شەسـتەکانی سـەدەی پێشوشـەوە سیاسـەتی پاکتـاوی ڕەگەزیی دەستی پێکرا بەتایبەت سەردەمی بەعسی یـەکان کەعەرەبی هـاوردە خزێنرایـە کـەرکوك و ناوچـەکەو خـەڵکی کـورد دەربـەدەرکرا کەسـایەتیەکی ڕۆژنامەنوسـی عـەرەب دەچێتەسـەر چـیای حـەمرین و سەیری ئەم دیو و ئەودیوی دەکا، پشتگیری لـەوەدەکات کەئـەم دیـوی کوردستانە بەدیاردە سروشتیەکەیدا. شاعیرێکی گـەورەی عەرەبیـش کەپێدەچـێ (جـەواهیری) بـێ لەشـیعرێکدا دەڵـێ (کـەرکوك بووکـی کوردستانە) ئەم دوو کەسایەتی یە بەویژدانەوە ڕاستی یان ووتوە.

لـــە ســـاڵی (١٩٧٤) داشۆڕشـــی ئـــەیلول لەســـەر ســـڕینەوەی کوردســتانیەتی کـەرکوك دەسـتی پـێ کـردەوە، ئیـتر لـەوە بـەدواوە

گەورەترین تاوان لەجیهاندا کرابێت تاوانی ئەنفال و کیمایاران بوو کە بەشی شێری بەم ناوچەیە بڕا، تا ئیستاش کێشەکانی ناوچەکە هەر بەردەوامە، هەڵبەت تا کوردیك بمینێ، دەست لە کوردستان بوونی کەرکوك هەڵناگرێت [٤٣].

ئەم زانیاری و میژووانەم لە گەشتێکمدا بۆ رون بوەوە.

***

## پەراوێز

١. (سەعید کاباری) هەنەرمەند و فۆلکلۆرناس دەڵێ وشەی (وەروەر) لای یەزیدییەکان بە واتای (بەهێز و ورە و توانا) دێت کە ئەمە لە کوردەواریدا بڵاوبۆتەوە، دەشێ وشەیەکی زەردەشتی بێت. بە رەچەشکێنی بەفریش دەوترێت وەروەر.

٢. ژن و ژنخوازی بەهۆی کچی حەمە ئەمینی قادرەوە هەبووە.

٣. ناحیەی عەربەت

٤. چەق: مرکز

٥. جادە: رێگا

٦. دەشتەکانی سنووری عەربەت

٧. ملك خاص

٨. عقد

٩. ناوی ئەو کوڕانەی (قەرەوەیس) لەسەر گردی گۆمەڕەش بوون (کریم، محمد، مامك، ستار)

١٠. بێستان سووری بچوك

١١. (بێستان سوور) لەسەر بنەمای (هور) نور و ڕوناکی و جوانی ئاوەدانی و باخ و بۆڵاخ.

١٢. بەرەبەند: سەد

١٣. سوراکۆ: بێستان سوور ، لەسەرەوە باسکراوە .

١٤. واتە سەرەتای بەربەندەکە.

١٥. تەنورەیی: هەڵوەشێنەر

١٦. واتە گۆری کەدوەکان، یان گۆڕی گاورەکان.

١٧. وەروەر: واتە ئازایی و خاوەنی دەست و تفەنگ .

١٨. مەلا قادرێکی سۆفی تری زاهد و عالم لەم دواییانەدا لە ناوچەی وارماوادا هەبووە و ئەم دوو مەلا قادرە لە یەك جیان گەرچی لە پلەو پایەدا وەك یەك ناویان بەرز بووە.

١٩. دەفرێکی یەك مەنییە.

٢٠. بەیار ئەو شوێنەیە کە نەکێڵراوە .

٢١. ئەگەر لە باشورەوە بای وا بە تەوژم هەڵبکات لە کوردەواریدا پێی دەڵێن (با فیتنە) ، خۆ ئەگەر لە شەماڵەوە بایەکی وا بە تەوژم هەڵبکات بە تایبەت لەسەر ئاگر کەوتنەوە ئەوە پێی دەڵێن (بای قورەت و ئاگری قورەت) .

٢٢. دۆڵی دوکانیان کەوتۆتە شتی شارۆچکەی عربت و گوندی چوارتاق .

٢٣. مەبەست لێرەدا لە جادەی چوارتاوە بۆ دوکانیانە.

٢٤. هەندێ واتا:

یاڵ: بەریزە گردێکی کەمێك نزم کە ڕێگەیەکی پێدا تێپەڕێت .

کلکە: بەڕیزەشاخێك دەوترێ کەلە کۆتایی شاخەکەدا هێلکەیی وردە وردە بەرەو زەمین دابەزێ .

قوتە: بە لوتکەیەکی بەرز و تیژ دەوترێ ، لوتکەشی پێدەوترێ .

٢٥. شاری سیلۆنا: لە ڕۆژنامەی ئازادی ژمارە (٩) و ڕۆژنامەی وولاَت ژمارە (٣١٦) وەرگیراوە .

٢٦. أ. ئەزیز: لە وتووێژێکی مێژوویی و نووسینێکی لاوی نووسەر (کاك حیدر بابان) خوالێخۆش بوو وەرگیراوە،لەسەر کتێبی فەروخ شا .

ب. بنەی ئەزمیرە: لە وتووێژێکی مێژوویی لەسەر دەست نوسەکانی کاك (ئەحمەد میرزا) ڕۆستەم لەسەر بنەی ئەزمیرە لەناوچەی بتوێن کە پایتەختی فەروخ شا بووە و بەناوی ئەزمیرەی خوشکی شاوە بووە ، وەرگیراوە.

٢٧. قڕگە: واتە شوێنی قڕبوون.

٢٨. گوندی وێڵەدەر : کەوتۆتە ناو دۆڵێك ،ناوی ئەم گوندەش لەوەوە هاتووە لە دێرزەمانە بۆ چەند جارێ لافاو بردویەتی زیانی لێداوە و پەرتەوازە و وێڵی دەر و دەشت بوون و بۆتە (وێڵەدەر) لەو سنورەشدا بە شاخەکەش دەڵێن شاخی وێڵەدەر .

٢٩. خراجیان : لە کاك (اکرم حیدر) خراجیانی کەلە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیرە،وەرگیراوە (هۆزێك لە دیوی ئێران هەبوون و سورکار و چاو شین و بزێو هەمیشە خەرجوباجیان وەرگرتووە و خەرجوباجیشیان لێ سەنراوە)،بۆیە هاتوون بەدیوی عیراقدا (کوردستانی باشوور) لەسەر کانی و ئاوی حاجی سەمین نیشتەجێ بوون،بەلاَم لەبەر ئەووەی ئەو شوێنە ڕەقەن و بێ لەوەڕ بووە گواستویانەتەوە ئەو شوێنەی ئێستای خراجیان،ئەو ناوچەیە لەو سۆرخەوە ناونراوە (خەرجیان) دواتر بۆتە (خراجیان) هەر لە شوێنی چاخانەی جارانی حاجی سەمیندا خاڵێکی باج وەرگرتن هەبووە کە خەرج و باجیان لە کاروان چیان وەرگرتووە وەك گومرکی ئێستا ،بەو سۆرخەشەوە ئەو ناوچەیە بەناوی (خراجیان) ناونراوە .

٣٠. کۆزەرەقە: لە کۆزەڕەقە یان کۆز : هەواری ڕەقەنەوە هاتووە .

٣١. سوتانەکانی گۆیژە و بوونی دارستان لە کۆندا لە گەلێك زانا و ڕیش سپی وەرگیراوە وەك (حمە ئەمین قالە عاسێ بێستان سوری،خاڵە حەمەی چاومار/سلێمانی،م.کەریم زەند،محمد صالح سەعید/سلێمانی،کاك عزیز محمد/سلێمانی تەمەن ٦٨ساڵ و هی تر) .

٣٢. ئەستێڵ: بەربەند

٣٣. دووبراله جۆرێکه له داڵ کەروێشك ئەخۆن .

٣٤. سەرچاوەکان :

١. تێبینی و گەڕانی خۆم بە دوو قۆناغ:

أ. له پەنجاکاندا که تەمەنم مێردمنداڵ بوو بۆ ماوەیەك له باخچه ژیاوم.

ب. له شەستەکانیشدا به کارێك ڕێمکەوته (داره ڕەش) که گوندێکی نزیکی باخچەیه لەسەرئاو و حەوزەکه توشم بوو به توشی (خاڵه شێخ عارف) ەوه بە ڕەحمەت بێ که زۆر پیر بوو بوو لەتەکیا سەردانی باخچەم کرد له پرسیار و وەڵام کەڵکم وەرگرت.

٢. کەڵکم له مامۆستا (شێخ بورهان قەرەداغی) وەرگرت که وەك له سەرەوە ڕوونم کردۆتەوە.

٣. له هەموو گەشتەکەی ئەم کتێبەدا پشتم بەهەمان بیرۆکه بەستووه .

٣٥. قاشتی ئەو گوندەیه که زەعیم صدیق خەڵکەکەی قەتلٚ و عام کرد.

٣٦. بینینی سەرجۆگەکەی کەلەو چاڵیەوه بەو بەرزیەدا هەڵگیرابوو کەجێی سەرسوڕمان بوو دوایی بۆم دەرکەوت له ڕێگای بۆریەکانی هاوکێش به شێوەیەکی فیزیاوی لەبەرزییەوه هەڵگیراوه بۆیه دەتوانێت ئەو ئاوه بەو گردەدا هەڵزنێ و بەرەو کێڵگەکان بڕوات .

٣٧. ئەردەڵان و بابان .

٣٨. دەماودەم هاتووه

٣٩. به گوێرەی شێوه زمانەکه بۆچونەکه ڕەنگه هەڵه بێت ، نوسەر.

٤٠. ئەم ڕوداوەش پێدەچێ تازەتربێ، چونکه دەگونجێ ناوی تانجرۆ له پێش بابانییەکانیشدا هەبووبێ جا ئیتر یەکەمیان بێ یان دووەمیان یان ڕوداوێکی تربێ گرنگ ئەوەیه ئەم ناوه له ئاوبردنی تاجی پاشایەکەوه هاتووه، نووسەر (دەماودەم).

٤١. قلیاسان: له قەڵی ئایشانیشەوه هاتوه که ئایشێ ناوێك قەڵی باشی هەبوه و لەوێ بەخێوی کردوه

٤٢. بەردەڵان، خێس = چەوت یان پێچەوانه

٤٣. بۆ ئەم چەند دێره کەڵکم لەمانەی خوارەوه وەرگرتووه :

١. بینین و بیستن و دەماودەم و پرسیار

٢. ئەم کتێبانه:

أ. دەوڵەتی سوبارتۆ

ب. میدیا

**سەرچاوە و سوپاسگوزارییەکان:**

ئەو بابەتانەی کە کەڵکم لیٚ وەرگرتون بۆ ئەم کتێبە لەگەڵ هەر بابەتێکدا ئاماژەم پێکردوە.

**سوپاسگوزاری:**

سوپاس گوزاری سەرجەم تاکەکانی خێزانەکەمم (منداڵەکانم و زاواو بوکەکانم) بۆ هاریکاریان لەروی پاك نوس کردن و هەر کارێکی تر کە پێویستم پێیان هەبوبێت، هەروەها سوپاسی (ئارام) ی برازام دەکەم کە پاکنوسی نزیکەی ٤٠ لاپەرەی بابەتەکەی بێستانسوری بۆ کردم، هەروەها سوپاسی بنەماڵەی حاجی ئەمین دەکەم (کوڕانی ئەبوبەکری کویخا عومەر) بۆ هەندیٚ زانیاری لەسەر بنەماڵەکەیان وە بۆ ئەرکی تایپ کردنی ئەم کتێبە لە دەست نوسەوە.

**ئاماژەیەك بۆ چالاکییە ئەدەبیەکانم، لە سەرەتاوە هەتا**

**کۆتایی ساڵی ٢٠١١**

ئەو کتێبانەی کە بە چاپم گەیاندوون:

نشرة زراعیة، لەسەر روەکی سیر، دوو ژمارە ڕۆژژمێری جوتیار بەراورد کاری لە نیوان ڕۆژژمێری کوردی و زایینیدا بەنامیلکە ،دیوانە شیعری کلپەی هەناسە ،ئەم کتێبەی بەردەست و چەند کتێبێکی ئامادەکراو ئامادەنەکراو بۆ چاپی تر هەروەها لە ١٢ کاسێتی تەسجیلدا رومانی(شیرین یان دورسی) و چیرۆکی (بیرەوەریەکانی خەبات و بازوبەند) و چیرۆکی (مارە رەش) م تۆمارکردوە.

**ئەو بلاٚوکراوە جۆراوجۆرانەی کە لەم گۆڤارە جوراوجۆرانەی خوارەوەدا بلاوم کردونەتەوە:**

سنبلە ٢ ژمارە ، شۆرشی کشت وکاڵی ١ ژمارە،شنروەیٚ ١ ژمارە، ڕەوشەن ژمارە٢،ڕوناهی ١ ژمارە،هەلوێستی نیشتمانی ٣ ژمارە، خوێن ڤانان ١ژمارە، پەیام ژمارە٢، گوڤاری کەلەپور ١٥ ژمارە ، پەپولە ٢ ژمارە، سوسیالیست ١ ژمارە،گۆڤاری سلێمانی ٤ ژمارە، بژۆین ١ ژمارە .لەکتیبێکی تایبەت بەشاعیراندا دوو شیعرم بلاٚوکراوەتەوە ، کۆی گشتی ٣٨

**ئەو ڕۆژنامە جۆراوجۆرانەی کە بابەتی جۆراوجۆرم تیابلاوکردۆتەوە.**

**کە ٨٥ بلاوکراوەن :**

**ولات، ژیانی ئازاد، ژنانی ئازادی، گڕی نەورۆز، ڕۆژی گەل، ئالاّی ئازادی، سلێمانی نویٚ، کوردستانی نویٚ، ڕێبازی ئازادی.**

**ئەو کۆڕو بۆنانەی کە بابەتم تێدا پێشکەش کردون:**

**کۆڕێک بۆ یادی ٩ی ئەیلولی ڕەش لە حەفتاکان لە زەرایەن ، دوهەم یادی ڕاپەڕین ،دووهەم یادی هەلەبجەی شەهید، کۆڕێك لە ڕۆشینبرانی نەتەوەیی بۆ یادی پێنجەم سالّی هەلەبجەی شەهید ،کۆڕیکی کۆمەڵەی کەلەپور فەرهەنکی ئاژەڵداریم پێشکەش کرد، یادی چوارسەد سالّەی شەرەف خانی بەدلیسی لە کۆری رۆشنبیرانی نەتەوەییدا ، کۆڕێك بۆ یادی حەفتا سالّەی مەلیك مەحمود ، کۆرێك بۆ یادی ئەفسەری مەهاباد حمەسالّح ژاژڵەیی ، کۆریك بۆ کۆچی دوایی جەلال کۆچەر، کۆریك بۆ چلەی ماتەمینی شاعیرەی کۆچ کردو خورشیدە بابان ، کۆریك بۆ چلەی ماتەمینی جەلال تەقی ، کۆریك بۆ چلەی ماتەمینی عبدوالمجید ماواتی، کۆرێکی شیعری لە نووسینگەی پەیام، لە یادی چلەی ماتەمینی مامۆستا حەسیب قەرەداغی لە سەر قەبران.**

**یادی نەورۆزێکی کۆمەڵی کەلەپور لە گۆرەپانی وەیس شیعرم خویندەوە. بۆ چلەی ماتەمینی علی شارەزوری و مامۆستا عمر عبدولرحیم بابەتم پیشکەش کرد بەلاّم لەبەر بارودوخی نەخۆشی تەنها ئاماژە بە بابەتەکانم کرا ،بۆ یادی سالْ رۆژی ئەلف با هەوری بابەتم پیشکەش کرد لەبەر درەنگی کات تەنها ئاماژە بە بابەتەکەم کرا. سالێکیش بەرنامەی فۆلکلۆرم لەڕادیویی سوسیالیست پێشکەش کردوە. وە ئەندام بووم لە کۆمەڵەی کەلەپور ،یەکێتی نووسەران ، کۆمەڵەی هونەرو ویژەی نەتەوەیی ، یەکێتی ڕۆشنبیرانی نەتەوەیی لەمەی دواییدا ئەندامی دەستەی کارگیرو دەستەی گوڤار بووم. ، لە چەند تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەدا چاو پێکەوتنم ئەنجام داوە ، لە کۆمەڵەی کەلەپوریش خەلاّت کراوم.**

**بۆ ئەم چالاکیانەی سەرەوە یشم ئەرشیفەکەم باشترین بەڵگەیە**

